سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار

ڕەووف بێگەرد

ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاجی کۆمپیوتەری

یادگار ئەوڕەحمان

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێک دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی- فولکەی یەکگرتن-

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار

Tel: 3129839

لە دەرەوەی کوردستان

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

E-mail

Info@www.sardam.net



چاپخانەی (شڤان)


## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامد، سوارەی ئێلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، محەرەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، ئیسماعیل بێشکچی، عەبدول خالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریان، ئەمین فەیزی بەگ، کامەران موکری، جەلال تەقی، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، شاکر فەتاح.

## ڕۆستەم عەزیز

*ساڵی 1976 لە سلێمانی لەدایکبووە.

*ساڵی 1997-1998 پەیمانگای هونەرەجوانەکانی تەواوکردووە

*ساڵی 2001-2002 کۆلیجی هونەری زانکۆی سلێمانی بەشی وێنەکێشانی تەواو کردووە.

*بەشداری سەرجەم فێستڤاڵەکانی پەیمانگاو کۆلیجی هونەری کردووە.

*بەشداری پێشانگەی سروشتی کردووە (2000).

*بەشداری پێشانگەی خاچی سووری نێودەوڵەتی ساڵی 2000 ی کردووە.

*بەشداری پێشانگەی تایبەت بە پۆرترێتی ساڵی 2001 ی کردووە.

*بەشداری پێشانگای هەمیشەیی گەلەری زاموای کردووە. خولی ساڵی 2003 و چەندین پێشانگەی تر.

# کورتەیەکی مێژووی ژیانم

حسەین عارف




ناوی تەواوم حسەینی کوڕی وەستا عارفی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی ئیسماعیل ئاغایە. باپیرەگەورەم دوای دامەزراندنی سلێمانی، لە (قەڵاچوالان)ەوە هاتۆتە ناو شارەوە. دایکم حەبیبەی کچی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەدی ناسراو بە(مەلا چایی)ی کوڕی مەلا غەفووری کوڕی مەلا مستەفایە، کە باپیرە گەورەی ئەملاشم دوای دامەزراندنی سلێمانی، لە (قەڵاچوالان)ەوە هاتۆتە ناو شارەوە. ناوبانگی مەلاچاییەکە لەوەوە هاتوە، کە یەکەم کەس بووە لە ڕێگەی ئێرانەوە کە بۆ بازرگانی هاتوچۆی کردوە، چای هێناوەتە سلێمانییەوەو، خەڵکەکەی بەخواردنەوەی ئاشنا کردوە.

من بەقسەی دایکم کە جارێکیان دواندم، لەحەوتەمین ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (1936)دا هاتوومەتە دنیاوە، کە دەکاتە(21)ی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵە. ئەو خانووەی تیایدا لەدایك بوومو ئەو وەختە موڵکی باوکم بووە، ئێستا بۆتە ئاشێکی هاڕینی دانەوێڵەو ریزە دووکانێك، کەدەکەونە سەر مەیدانی ماستفرۆشەکانی لای گەڕەکی چوارباخ.

باوکم ئەو وەختە یەکێك بووە لە وەستا ناسراوەکانی کارگەچێتی لەشاردا (بەمانای وەستاباشی)و، شوێنی کارگەکەشی هەر ناو خانووەکەی بووە. ئەو لەچاو خەڵکەکەی ترداو بەتایبەتی هاوپیشەکانی، کەمدەرامەت نەبووە، کەچی لەناکاوێکدا بڕیارێکی سەختی، بەفرۆشتنی خانووەکەو وازهێنان لەپیشەکەی داوە!. بۆچیو لەبەرچی؟!. بەو نیازەی گوایە ڕەوتی ژیانی خۆیو خاوو خێزانی، بۆ بارێکی باشتر دەگۆڕێ. واتە لەپیشەگەرییەکی بەرتەسکەوە، بۆ بازرگانییەکی بەرفراوان. ئەوەتا بەسێسەد دینارەکەی نرخی خانووەکە، کە بۆ ئەو ڕۆژگارە (ساڵی 1938) پارەیەکی زۆربووە، بە خاووخێزانەوە چووە لەشاری کەرکووک عەلافخانەیەکی داناوەو، دەستی کردۆتە بازرگانیکردن بەدانەوێڵەوە. بەڵام ئەنجام بە نابووتبوون شکاوەتەوەو، دوای ساڵو نیوێك گەڕاوەتەوە سلێمانیو، بایداوەتەوە سەر کارگەچێتییەکە، ئەویش بەپچڕپچڕیو، بەبێشوێنی کارگەی تایبەتیی خۆی.

بەدوای فرۆشتنی خانووەکەدا، ئیتر بووینەتە کرێچیو بۆ ماوەی ساڵەها، کەوتووینەتە گەڕەکاوگەڕەكو بگرە شارەو شارکردن. زۆرن ئەو شارو گەڕەكو کووچەو کۆڵانانەو، لیستەیانم لەلاهەیە کە لەم کورتەیەدا بواری ناوبردنیان نییە، چ جابە باسکردنیان دەگا. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم کەمنی ئەم نووسەرەی ئێستایان لەکاتێکی زووەوە، بەجیهانێکی گەلێ بەرین ئاشناکرد.. گەلێ بەرینتر لەو جیهانەی کە دەشیا، بەنەفرۆشتنی خانووەکە تیایدا قەتیس بمامام.

ساڵانی هەرەتی تەمەنی منداڵیم، بەرگەرمەی جەنگی جیهانیی دووەم دەکەون (1939–1945). من ئەگەرچی وەك منداڵی یەکێك لەگەڵە بەجەنگهاتووەکان لەکارەساتەکانیدا ناژیم، بەڵام دووراودوور تاڵاوەکانی دەچێژمو، بەتایبەتی هەژاریو کەمدەرامەتی تارادەی برسێتی. تکایە سەرنج بدەنە ئەم قسەیەی دایکم، کە لەساڵانی دواتردا کاتێ فامم کردەوە لێمدەبیست دەیووت: "بڕواو نەیەتەوە.. خۆراکی سەرەکیمان خەپڵەی تێکەڵ لەئاردی جۆو گەنم بوو. هەراشەکان- منداڵە گەورەکانی- یەکژەمی بەشەڕۆژانەکەی خۆیانیان دەخوارد. لەکاتێکدا وردەکان- منداڵە بچووکەکانی-، بەشەکەیانم بۆ هەڵدەگرتن هەتا ژەمژەم بیاندەمێو، دەبوو لەدەستدرێژیی هەراشەکانیش بیپارێزم، کە هەندێ جار ناچار دەبووم بەڕەزامەندی، یەکی پارچەیەکیان لەبەشی وردەکان بدەمێ".

ئەمە لە کاتێکدایە کە برای گەورەمان کاکم (محەمەد)و، کە باوکم لە وەختێکی زووەوە خستوێتییە بەر خوێندن (دەبێ بکاتە دەوروبەری ساڵی 1930)، لە خانەی مامۆستایانی گوندان- دار المعلمين الريفيه- لە بەغدا دەرچووە وبۆتە مامۆستا. یەکەمجار لە پێنجوێن (1941)و، ئینجا لە هەڵەبجەی لەمەڕ خەپڵەکانی دایکم (1942)، کە ئێمەش بەخاووخێزانەوە بەفەرمانی باوکم دوای کەوتووین. واتە باوك ئەگەرچی لەولا، لە گۆڕینی پیشەکەیەوە بۆ بازرگانی شکستی خواردوە، بەڵام لەم لا لە پێگەیاندنی کوڕە گەورەیداو، بوونی بەمووچەخۆرێکی میری، سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو، دەبێ بەری ئەو ڕەنجەی بخوا.

*ساڵی یەکەمی هەڵەبجەمان (ساڵی خەپڵەکان)، بەکولەمەرگی بەسەربرد. ژمارەی خێزان دووازدەیەو، داهات تەنیا مووچە هەشت نۆ دینارییەکەی کاك و، بیتاقەی تەموینەکەیە. بەڵام لە ساڵی دووەمو سێیەمدا (943، 944)، بەهۆی هەم هەڵپەو هەم داهێنانێکەوە لەلایەن باوکەوە، خێزان ئاهێکی تێگەڕا.

لە بەهاردا خۆیو سێ کوڕە هەراشەکەی (عوسمانو عەلیو حەسەن)، بەپێ ڕێگەی گەرمیانیان دەگرتە بەرو، لەوێ کارگەچێتییەکەیان لە گوندەکانیدا دەکردو، داهاتێکی باشیان دەسگیر دەخست.

*مـن لـه سـاڵی (941)ەوە، بـەو هۆیـەوە کـە کـاکم مامۆسـتا بـوو لـە پێنجوێنا زۆر جار لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ قوتابخانە، بەژووری پۆل‌و خوێندن ئاشنا بووبووم. ئینجا لە ساڵی دووەمی هەڵەبجەماندا کە تەمەنم بوو بەحەوت ساڵ، بوومە قوتابیی پۆلی یەك‌و، دەریشچووم بۆ دوو. بـەڵام لـە سـاڵی دوایـدا، لەبـەر تێکچوونێکـی نێـوان کـاکم‌و بەڕێوەبـەری قوتابخانەکەو گواستنەوەی بۆ دەرەوەی شار، لە خوێندن دابڕام.

*لە ساڵی خوێندنی (945– 946)دا، کاك گواسترایەوە بۆ (عەربەت)و، خـاووخێزانیش گەڕایـەوە بـۆ شـارو، لـە خـانووی مـەلا عـەبدوڵای چروستانیدا لە گەڕەکی چوارباغە دێرینەکەی لەوەبەریاندا، هەروا تـەنیا دووسەد هەنگاوێك دوور لە خانووە فرۆشراوەکەیانەوە نیشتەجێ بوون. هەر ئێرەشە کە بۆ من دەبێتە مەڵبەندی بیرەوەرییە هەرە کاریگەرەکانی رۆژگاری هەرەتی منداڵیم، کە دەکاتە ساڵانی (945– 949)و، بۆ لەوەلا ئیتر لە پڕێکدا دەبمە پیاوو، تەنانەت پیاوی مەعمیلی گرتووخانەو هەڵاتن‌و بەندیخانەو خەباتی ژێـر زەمینـی، وەك دوایـی باسـی دەکـەم. ئێسـتا وا بەخێرایی چەند نموونەیەك لەو بیرەوەرییانە تۆمار دەکەم:

–خۆم ورك لە دایکم دەگرم، کە بمبا لە قوتابخانە ناونووسم بکا. جگە لە کاك کەسێکی تر لە ئەندامانی خێزانەکە، بواری چوونە قوتابخانەی بۆ نەڕەخساوەو، من دەبمە دووەم. هۆیە سەرەکییەکەی دەبێ، شـڵەژاویی بـارودۆخی ژیـانی خێزانەکـە، بەتایبـەتی لـەڕووی داراییـەوە بووبـێ. بەهەرحاڵ دایکم دەمبا لە قوتابخانەی ئەیوبییەی نزیك ماڵمان ناونووسم دەکـا. بـەڵام سـەیر لەوەدایـە کـە دەخرێمـەوە پـۆلی یەکـەم!. بۆچـی‌و لەبـەرچی؟!. وەڵامێکـی روونم لـە زەینـدا نییـە. رەنگـە کەمتەرخـەمی بەسـەرێك‌و، بـەردەوامیی تێکچوونەکـەی نێـوان کـاکم‌و بەڕێوەبەرەکـەی هەڵەبجە هۆکار بووبێ.

–بەتەمەن هەراشم. کەوتوومەتە ڕاکەڕاکەی ناو کۆڵانەکانی گـەڕەك. هاوەڵ‌و هـاوڕێ دەگرم. لەگـەڵیاندا یارییەکانی ئـەو رۆژگـارە (مووشـێن، هەلووکێن، سافسافێن، مزراحێن، بازد بـازدێن، ئاگرە سـوورە.. هتـدو، تەنانـــەت شـــەڕەگەڕەکیش دەکـــەم). ئەمانـــەن بیرەوەرییـــە هـــەرە بەتامولەزەتـەکانی هـەرەتی تەمـەنی منداڵیـم‌و، شانبەشـانیان ئـەوەکانی قوتابخانەم.

–بـاوك‌و براکـان لـە خانووەکـەدا (ئەگـەر چـی بەکرێیـە)، کارگـەیان دامەزراندۆتەوەو، کارگەچێتییەکەیان بەگەرموگوڕی دەست پێکردۆتەوە. هەرچەندە لەبەر زۆریی ژمارەی خێزانەکە، داهات بەفریا ناکەوێ‌و هەر لە خانەی هەژاریدا قەتیسمان دەدا، بەڵام دەکرێ بووترێ کە بێدەرامەت نین.

–لەعلی (لعلیە)ی خوشکم کەلە ڕیزبەندیی لە دایکبووندا سەروو منە، لـە تەمـەنی سـیازدە سـاڵیدا بەنەخۆشـیی گرانـەتا دەمـرێ. کارەسـاتی مردنەکەی لە دەفتەری بیروەرییەکانی منداڵیی مندا، لاپەڕەیەکی تایبەتی داگیر دەکا.

–جادەی تازە (کە دوایی ناوی مەولەویی لێدەنرێ) لێمانەوە نزیکەو، هـاتو هـاواری (بابژی بابڕوخێ)م دێتە بـەرگوێ. دەچم لـە قـەراغ جادەوە لەگـەڵیاندا دەڕۆم. تێدەگـەم کـە داوای لێبـوردن بـۆ چـوار ئەفسـەرەکەو، ئازادکردنیان دەکەن.

–ڕێم کەوتۆتە بەر سینەماکەی تەنیشت چاخانەکەی حەمە رەق بەلای باخی میردا (لەم ساتەدا ناوەکەیم نایەتەوە یاد). لە ناکـاوێکدا دەبێتـە تەقـەو، عەشـاماتێك دادەبـارن‌و، لـە ترسـاندا خۆیـان بـۆ نـاو سـینەماکە دەکوتـن‌و، منیـش لەگـەڵ خۆیـاندا رادەمـاڵن. دوایـی تێدەگـەم کـە چەکدارەکانی شێخ لەتیفی حەفید بوون‌و، تەقەیان بەهەوادا بۆ ترساندنی ئەو عەشاماتە کردبوو، کە خۆنیشاندانیان لەدژی شێخ سازدابوو. (ئەگەر بەهەڵە نەچووبم شیوعییەکان بوون).

*لە ساڵی خوێندنی (49– 50)دا، کاك بەفەرمانی ئیداری گواسترایەوە بـۆ خانـەقین. ئـەمجاریش بەخاووخێزانـەوە کۆچمـان کـرد بـۆ ئـەوێ. لەبەرئەوەی کاك بوو بەمامۆستای گوندی (کانی بز)و، خێزانیش لەوێ نیشـتەجێ بـوون‌و، لەبەرئـەوەی قوتابخانـەی گوندەکـە تـەنیا تـا پـۆلی چوارەمی تێدا بوو، من کە قوتابیی پۆلی پێنجەم بووم، بۆ بەردەوامبوون لەسەر خوێندنەکەم، لە ماڵی مامۆسـتایان (کـەمال‌و جـەمال مـەحموود) داڵـدەدرام، کـە ئـەوانیش بـەئیداری گواسـترابوونەوەو بـەر نـاو شـار کەوتبوون. ماڵی ئەو مامۆستا سەروەرانەم جگە لـە داڵدەدانەکـە، بـووە مەڵبـەندی چاو پشکوتنیشم لـەو تەمەنـە زووەدا، لـەڕووی ئـایدۆلۆجی‌و سیاسـییەوەو، گرتنـە بـەری ڕێگـای تێکۆشـان لـە ڕیـزی بزووتنـەوەی کۆمۆنیزمی‌و نیشتمانیدا.

*لە هـاوینی ساڵی (950)دا بەهۆی ناپاکیی کەسێکەوە، کە دەزگـای ئاسایشـی ئـەو سـەردەمە (تـەحقیقاتی جینـائی) خزاندبوویـە ریـزی حیزبەوە، بۆ یەکەمجار لەو تەمەنە زووەدا، تووشی گرتن‌و ئەشکەنجەدان بووم. لە ئەنجامیدا لەبەرئەوەی لەخوار تەمەنی هـەژدە سـاڵییەوە بـووم (936– 950)، بەیازدە مانگ بەندی لەگەڵ راگرتنی جێبەجێکردندا (وقف التنفیذ) حوکم درام.

*لە سـاڵی خوێندنـی (950– 951)دا شەشی سـەرەتاییم تـەواوکردو، لەبەرئـەوەی جـەنابی بەڕێوەبـەری قوتابخانـەی نـاوەندی بـەهۆی گرتنەکەمەوە لێم تۆقی بوو، رازی نەبوو لە پۆلی یـەکی قوتابخانەکـەیدا وەرمبگرێ. بۆیە ناچار رووم کردەوە شار (سلێمانی)و، لـە مـاڵی خـاڵم (عـەبدولڕەحمان) گیرسـامەوەو، لـە سـاڵی خوێندنـی (51– 52)دا بوومـە قوتابیی پۆلی یەکی (سانەویی سلێمانی).

*لە هـاوینی ساڵی (952)دا، خێزان دیسـان هاتـەوە سـەر شـارو، لـە خانوویەکی نزیك گوومرگە سووتاو یا بەرخانـەقای ناسـراو بـەخانووی (سـەعەزۆکە) نیشتەجێ بوو. منیش بەئامێزی شادبوومەوەو، ئیـتر ئـەم خـانووە بـۆ مـاوەی سـێ چـوار سـاڵی داهـاتوو، دەبێتـە بنکەیـەکی خۆبەخشانە بۆ چالاکیی حیزبایەتی، بەو مانایەی کە سەرجەم ئەندامانی خێزانەکە لە ڕیزەکانیدان.

*هەر لەم ساڵەدا کە ساڵی ڕاپەڕینی تشرینی پێدەووترێ، بۆ جاری دووەم لە ئـەنجامی مـانگرتنێکی قوتابییانـەدا، لەگـەڵ چـەند قوتابییـەکی تردا گیرام‌و، دوای چەند شەوێك بەکۆمەڵ ئازاد کراین.

*خوێندنـەوەی زۆرم بـەهۆی چالاکییـە ئـایدۆلۆجی‌و سیاسـییەکەوە، خستمییە سـەر کەڵکەڵەی نووسین. هێشتا لـە پـۆلی دووەمـدا بـووم، کـە بەنیازی ئەدەبنووسین قەڵەمم خستە سەر کاغەز. ئەگـەرچی خوێندنـەوەم لـەبواری ئەدەبدا زیاتر چیرۆك‌و رۆمـان بـوو، کـەچی هـەردەبوو بەشـیعر دەست پێبکەم. تەنانەت یەکەم بەرهەمیشم کە (گۆران)ی نەمر بۆ هاندانم،

سالّی (954)لە (ژین)دابلاوی کردەوە، پەخشانێکی شیعر ئامێز بوو بەناونیشانی (بۆیە ئەمەوێ بژیم)ەوە. بەلاّم دیارە موعادەلە نابەجێکە: (خوێندنەوەی چیرۆک/ نووسینی شیعر)، بەزوویی لەلام چۆتەوە سەر باری ئاسایی خۆی کە: (خوێندنەوەی چیرۆک/ نووسینی چیرۆک)ەو، یەکەم چیرۆکیشم بەناونیشانی (گۆڕستان)ەوە نووسیوە، کەلە گرتنی جاری چوارەممدا گۆڕدرا بە (کوردستان)و، لەسەرم کرا بەبەلّگەیەکی تاوانبارکردن.

*لە سەرەتای مانگی ئازاری (955)دا، کەلە پۆلی چوارەمی سانەوی (ئامادەیی) سلێمانیدا بووم، بەڕێوەبەری قوتابخانە ئاگاداری کردم، کە بۆ کارێکی پێویست لە دایەرەی مەعاریف (پەروەردە) داواکراوم. چووم‌و وتیان: لە (تەجنید) داوات دەکەن. چووم‌و وتیان: لەبەرئەوەی تۆ لە قوتابخانە دەرکراویت‌و، لەبەرئەوەی لە تەمەنی سەربازیدایت، بڕیارە بکرێیت بەسەرباز. ئینجا لەو سەردەمەدا، یەکێک لە شێوازەکانی سەرکوتکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی ئەوەبوو، کە قوتابییە دەرکراوەکان لەسەر چالاکیی نیشتمانی، دەکران بەسەربازو دەنێردران بۆ لەشکرگای (شوعەیبە)ی نزیک بەسرە، کەلە ڕاستیدا بۆیان کرابووە گرتووخانە (معتقل)ێک. بەم شێوەیە بۆ جاری سێیەم گیرام، بەنیازی کردنم بەسەربازو، ڕەوانەکردنم بۆ ئەو گرتووخانەیە.

هەوالّ گەیشتە یەکێتی قوتابییان‌و حیزب‌و، لە کاتێکدا کەلە گرتووخانەی حامییەی سلێمانی لە چاوەڕوانی ناردنمدا بووم بۆ شوعەیبە، هاوڕێی کۆچکردووم (جەلالی میرزا کەریم) خۆی گەیاندە لام‌و ئاگاداری کردم، کە بڕیاردراوە نەچم‌و هەلّبێم. منیش بێچەندو چۆن جێبەجێم کردو، لەکاتی بەڕێکردنمدا بۆ کەرکووک هەلاّتم‌و، بەوە شێوەی ژیانم گۆڕدرا بۆ خەباتی ژێر زەمینی.

*لە سەرەتای پایزی هەر ئەو سالّەدا، بۆ جاری چوارەم تووشی گرتن‌و بەندکردن بوومەوە. ئەمیش هەقایەتێکی خۆی هەیەو، سەرنجڕاکێش تیایدا ئەوەیە ئامۆزازایەکی خۆم، کە شوێنی خۆحەشاردانمی پێدەزانی، مەفرەزەیەکی پۆلیسی هێنایە سەرم‌و بەگرتی دام‌و، لە دادگاشدا هات شایەتیی لەسەردام، ئەمە بێئەوەی کە هیچ ناکۆکی‌و دوژمنایەتییەک لە نێوانماندا هەبووبێ، بەلاّم دوایی بۆم دەرکەوت کەئەو پێشتر بووبووە پۆلیسی ئاسایش (جاسووس)و، بەتەماعی خەلاّتکردن ئەوەی کردبوو. ئینجا وەک لەوەبەر ئیشارەتم پێدا، ناونیشانی چیرۆکەکەم گۆڕدرا بە (کوردستان)و، لەگەلّ هەندێ بەلّگەنامەی تردا کە پێم گیران، لە دادگادا بۆ تاوانبارکردنم بەکارهێنرا.

*ئەمجارە دوای دەپازدە ڕۆژێک مانەوەم لە گرتووخانەی سەرای سلێمانی‌و تەواوکردنی لێکۆلّینەوە لەگەلّمدا، بەکەلەبچەکراوی‌و بەپاسەوانی چەکدارەوە ڕەوانەی شوعەیبە کرام. ئینجا دوای ئەوەی لەلایەن دادگای جەزای سلێمانییەوە بەماوەی سالّێک حەپسکردن حوکم درام، ماوەکەم لە شوعەیبە تەواوکردو، بەدوایدا دوو سالّیش سەربازیم تێدا بەسەربردن.

*لەم سێ سالّەی شوعەیبەمدا، خوێندنەوەو نووسینم لەبواری ئەدەبدا، شانبەشانی یەکتر برەویان دەسەند. هەردوو گۆڤاری (الآداب) و (الأدیب)ی بێروتی، ڕۆلێکی بالاّیان لە هاندانمدا دەگێڕا. خوێندنەوەی ئەوان بوو لە بواری لێکۆلّینەوەدا هانیدام، نامێلکەی (کامەران‌و هۆنراوەی نوێ) بنووسم. لە بواری چیرۆکنووسینیشدا (چای شیرین)، دەستەگولّی ئەو ماوەیەم بوو، کە ناردم بۆ پێشبڕکێکەی گۆڤاری (شەفەق)و، بەیەکەمی پێشبڕکێکە هەلّبژێردراو، بووە خاوەنی ئەو ناوبانگەی کە هەیەتی.


سلێمانی 1951

*لە پایزی (958)دا دوای شۆڕشی (14)ی تەمووز، ماوەی سەربازییەکەم تەواوکردو، گەڕامەوە سلێمانییەکەم‌و لە پۆلی چوارەمییەکەی جارانم، دەستم کردەوە بەدەوامکردن. هەر لەو ماوەیەدا کە خانەی مامۆستایان بۆ یەکەمجار لە شاردا کرایەوە، وازم لەولا هێناو بوومە قوتابیی پۆلی یەکەمی ئەمیان. دوای ماوەیەکی کورت وازم لەمیشیان هێناو، بۆ خۆژیاندن لە سانەویی سلێمانی بەفەرمانبەر دامەزرام. بەدەمییەوە لە سالّی خوێندنی (59– 60)دا، بە (خارجی) بەشداریی تاقیکردنەوەی پۆلی پێنجەمم کرد (کە ئەو سەردەمە دوا پۆلی ئامادەیی بوو)و، لە خولی یەکەمدا دەرچووم‌و نمرەیەکی باشم هێناو، لە کۆلێجی ماف (حقوق)ی زانکۆی بەغدا وەرگیرام. فەرمانبەرییەکەشم بۆ گوێزرایەوە بۆ بەغداو، بەوە گرفتی ژیان‌و گوزەرانم چارەسەر کرا. واتە بەیانیان فەرمانبەری‌و، ئێواران قوتابێتی کۆلیج.

*لەو سالّەدا (961)، بۆ یەکەمجار وەک شاگردە ئەندامێکی ستافی ڕۆژنامەی (ئازادی)، پێم نایە ناو جیهانی ڕۆژنامەگەرییەوە. لە نزیکترەوە (گۆران)ی نەمرو، لە نزیکەوە (نافع یونس)ی شەهیدو، هاوڕێیان محەمەدی مەلا کەریم‌و عەبدولڕەزاق بیمارم ناسی. واتە دەتوانم بلّێم لەو ماوەیەدا، چوار ئەرکم لەیەک کاتدا بەجێ دەگەیاندن: قوتابێتی، فەمارنبەری، ڕۆژنامەنووسی، لێپرسراوێتیی ڕێکخستنی حیز ب لە کۆلیجدا.

*لە ڕۆژی یازدەی شوباتی (963)دا، سالّی کودەتا خوێناوییەکەی یەکەمی بەعسی فاشی، بۆ جاری پێنجەم تووشی گرتن بووم، دوو مانگێکی پڕ لە ستەمم لە گرتووخانەی (هندسە)ی سەربازگەی (الرشید)و، قەلاّی چوارەمی بەندیخانەی ناوەندی (مرکزی)ی بەغدا بەسەربرد. دەربازبوونیشم لە ئەنجامی نواندنی کەمێ زیرەکیمدا بوو، بەوەی کەلە کاتی گرتنەکەمدا وەک فەرمانبەر خۆم ناساند نەک قوتابی‌و لە لێکۆلّینەوەدا، لە لیستی فەرمانگەی پەروەردەدا بۆ ناوەکەم گەڕان‌و، لەبەرئەوەی ناومی تێدا نەبوو ئازادیان کردم. هەر کە بەردرام خۆم گەیاندەوە سلێمانی‌و، لەدوای شالاّوەکەی نۆی حوزەیران، بۆ یەکەمجار ڕووم کردە شاخ‌و بوومە (پ. م)ی قەلّەمبەدەست، لە بنکەکانی حیزب لە کلکەسماق‌و ئاوەگرد. لە ئەنجامدا سالّی خوێندنی (62/ 63)م لە دەست چوو. بەلاّم بۆ سالّی (63/ 64)، دوای ڕووخانی حوکمی بەعسییە کودەتاچییەکانی (63)، گەڕامەوە بەغداو دەستم بە دەوامی کۆلیج

کردەوە. لە کاتێکدا بۆ فەرمانبەرییەکەم چەندە هەوڵم دا، دادی نەداو نەیانگەڕاندمەوە، کە ئەوە گرفتێکی گەورەی لەڕووی ژیان و گوزەرانەوە بۆ دروست کردم.

*ساڵی خوێندنی (65/64)م بەکولەمەرگی کۆتایی پێهێنا، کە دوا ساڵ بوو. وەکی تریش داخوازیی (خانم)ی هاوسەرمم کرد بوو، کە بەڕەسمی بووبووە دەسگیرانم و لە چاوەڕوانیدا بوو.

*لە (965/8/3)دا بوومە ئەندامی سەندیکای پارێزەران و، لە سلێمانی دەستم کرد بەپارێزەری. زۆری نەبرد دەرچووانی خولەکەمان داواکراین بۆ سەربازی و، لە (966/2/5)دا، بوومە قوتابیی کۆلیجی ئەفسەرانی یەدەك لە سەربازگەی (الرشید) لە بەغدا. لە (966/7/1)دا بوومە ئەفسەری یەدەکی یەك ئەستێرە، لە سەربازگەی (الوشاش) لە بەغدا.

*لە (966/10/28)دا هاوسەریم لەگەڵ (خانم)دا لە بەغدا دەستی پێکرد. لە (967/2/20)دا لە ئەفسەرییەکە مەرەخەس کرایەن و، گەڕاینەوە سلێمانی و، دەستم دایەوە پارێزەریکردن. هەر لەم ماوەیەدا بوو، کە دووبەرەکییە گەورەکە کەوتە نێوان ریزەکانی حیزبەوەو، دوو حیزبی بەناوی (ل. م)و (ق.م)ەوە لێکەوتەوە، کەمن کەوتمە بەرەی لای (ق.م)و، بوومە یەکێك لە کادیرە چالاکەکانی لە سلێمانی و کوردستاندا.

وەکی تر لەڕووی ژیان و گوزەرانەوە، ئەگەرچی بەسەرێك وەك پیشەی ئاشکرام پارێزەرم و، بەودیوییشدا کادرێکی ریزی یەکەمی حیزبم لە سنوورەکەماندا، بەڵام لەگەڵ (خانمدا) ژیانێکی هەژارانەی تارادەی کولەمەرگی دەژین. چونکە نەپارێزەرییەکەم بەهۆی حیزبایەتییەکەوە چالاکانە بۆ دەکرێ، نەحیزبایەتییەکەش لە توانایدایە پارووییەك بکا بەدەممانەوە. ئا لەم بارودۆخە ناهەموارەدایە، کە یەکەم منداڵمان (گۆران– 968/2/21) لە دایك دەبێ و، کەچی لە ئاهەنگێکی خۆمانەی بەئامادەبوونی نەمر (حەمە ساڵح دیلان)، لەو لەتە خانووە دوو هۆدەو هەیوانە کرێگرتەیەدا لە نزیك گردی سەیوان بۆ دەگێڕین، کە تیایدا لە دایك بوو.

*لە ناوەڕاستی ساڵی (968)ەوە، چەند هۆیەك بوونە مایەی بێزاربوونم لەو کاری حیزبایەتییەی، کە هەژدە ساڵ بوو دەروێشانە لەسەری بەردەوام بووم. بڕیاری وازهێنانم داو، لە (68/10/1)ەوە کە رۆژی چوونەوە بەغدامە بەماڵو منداڵەوە، بەبۆنەی گەڕانەوەمەوە بۆ سەر فەرمانبەرییەکەم لێی دابڕام. لەو کاتەشەوە ئیتر، خۆم بۆ ئەدەب و نووسین و کاری رۆژنامەنووسی تەرخان کرد.

*لە کۆتایی (969)دا لەگەڵ هاوڕێم کاکە مەم بۆتانی، کەوتینە کۆششکردن بۆ دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد و، بەپێی پرۆسەیەکی تایبەتی کە بریتی بوو لە هەڵبژاردنێکی نهێنی، دەستەی دامەزرێنەرمان پێك هێناو، لە (970/2/10)دا مۆڵەتی رەسمیمان لە وەرازەتی ناوخۆ وەرگرت.

*لە (970/4/25)دا لەگەڵ هاوڕێیانم (شێرکۆ بێکەس و کاکە مەم بۆتانی و جمال شارباژێڕی و کۆچکردوو جلال میرزا کریمدا، بانگەوازی (روانگە)مان بڵاوکردەوە.

*لە ئەیلوولی (973)دا وەك نوێنەرێکی یەکێتیی نووسەرانی کورد، لەگەڵ وەفدی عێراقدا بەشداریی کۆنگرەی پێنجەمی نووسەرانی ئاسیا و ئەفەریقام، لە ئەڵماتای پایتەختی کازاخستانی سۆڤێتیدا کرد.

*لە شەوی (974/6/8/7)دا، لەلاڕێوە بەشاخی گۆیژەدا هەڵزنام و، بۆ جاری دووەم رووم کردەوە شاخ. ماوەیەك لە بنکەی (ق.م)ی حیزبی شیوعی لە کاژاو مامەوەو، دوایی بەماڵومنداڵەوە لە گوندی (دەربەند)ی سەروو چۆمانی دۆڵی باڵەکایەتی گیرسامەوە. کرامە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەران و، لێپرسراوی بارەگای یەکێتیی کە هەم بارەگا بوو هەم ماڵم.

*لە (974/11/23)دا، بۆ جاری شەشەم تووشی گرتن بووم و، ئەمجارەیان لەلایەن دەزگای پاراستنی شۆڕشەوە، بەتۆمەتی ئەوەی گوایە رەخنە لە شۆڕش دەگرم و، قسەی نابەجێ دەکەم. شەهید سەیدا ساڵح یوسفی– سەرۆکی یەکێتیی، بەنوسراوێکی رەسمی بۆ (م.س)ی پارتی، بەتوندی ناڕەزایی سەبارەت بەگرتنەکەم دەربڕی.

*لە 975/3/28دا دوای هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول، گەیشتمەوە بەغداو، بەدوایدا ساڵانێکی تفتوتاڵ و پڕ لە پەژارەو خەمم بەسەربردن، کە بەگرتنم بۆ جاری حەوتەم لە هاوینی (978)دا بەبۆنەی کوشتنی (عوسمان فایەق)ەوە، گەیشتە لوتکە.

*لە (979/12/31)دا، دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بۆ رزگاربوون لەو تاڵینۆشینە، فەرمانبەرییەکەم گواسترایەوە بۆ فەرمانگەی کشتوکاڵ لە هەولێر. ماوەیەکم بەسەرسووکی تێدا بەسەربرد و تێوە گلامەوە. گواسترامەوە بۆ ئەمینداریێتی رۆشنبیری و، کرام بەجێگری سەرنووسەری گۆڤاری (کاروان). تالە ناوەڕاستی (988)دا لادرام و، گەڕێندرامەوە بۆ کشتوکاڵ. ئینجا لە هاوینی (989)دا خانەنشین کرام و، لە (10/1)دا بەخاوخێزانەوە گەڕامەوە سەر شار و، دیسان دەستم بەپارێزەری کردەوە. لەماوەی کارکردنم لە (کاروان)دا، سەرباری خەریکبوونم بەکاری رۆژنامەنووسییەکەوە، لە بواری نووسینیشدا چالاك بووم و، لەو ماوەیەدا رۆمانی (شار)و (ئەندێشەی مرۆڤێك)و (کۆمەڵە چیرۆکی گەلەگورگ)و (بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی)م بەچاپ گەیاندن.

*لە (992/6/4)دا، لەسەر لیستی سەوزی (ی.ن.ك) بوومە ئەندامی پەرلەمان و، چالاکیم زیاتر لە بواری قانووندا بوو، بەو سیفەتەی کرامە ئەندامێکی لیژنەی قانوونی، بۆ بەرگرتنیش لە شەڕی ناوخۆ، یەکێك بووم لەو (57) ئەندامەی، بۆ ماوەی (101) شەو لە تەلاری پەرلەماندا مانمان گرت.

*لە دوای (31/ئابی/996)دا، بۆ جاری سێیەم رێم کەوتەوە شاخ

*لە مانگی یازدەی (998)دا، بەشداریم لە دامەزراندنی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەممدا کردو، تا ئێستاش یەکێکم لە کارمەندانی.

2003/9/26

# بیبلۆگرافیای بەرهەمەکانی نووسەر

## یەکەم: لە کتێبدا:

### أ-بەکوردی

1کامەران و هۆنراوەی نوێ- لێکۆڵینەوە- بەناوی (محمد صدیق عارف)ەوە- س/1958- چ/مەعارف- ل/66- ق/ناوەنجی (لە بڵاوکراوەکانی نامەخانەی گەلاوێژ لە سلێمانی).

2-لە کۆڕی خەباتا- کۆمەڵە چیرۆك- س/1959- چاپخانە/ کامەران- ش/سلێمانی- ل/32- ق/ناوەنجی.

3-سەرنجێکی مارکسی لینینی دەربارەی چینەکان و تێکۆشانی چینایەتی- وەرگێڕان- س/1960- چ/ژین- ش/سلێمانی- ل/48- ق/ناوەنجی (لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی ئازادی‌یە).

4-لە بنچینەکانی لەنینیەت- وەرگێڕان- لەگەڵ جلال میرزا کریم دا- س/1960- چ/ژین- ش/سلێمانی- ل/32- ق/ناوەنجی

5-کلاڤەیەك ژانی تووڕە- کۆمەڵە چیرۆك- س/1971- چ/نعمان- ش/نەجەف- ل/115- ق/گەورە

6-چیرۆکی هونەریی کوردی/ 1925- 1960- لێکۆڵینەوە- س/1977- چ/ دار الحریة- ش/ بەغدا- ل/ 180- ق/ گەورە. (لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی).

7-تویشووی سەفەرێکی سەخت- کۆمەڵە چیرۆك- س/ 1979- چ/ دار السلام- ش/ بەغدا- ل/ 118- ق/ ناوەنجی

8-میر- وەرگێڕان- نووسینی مەکیاڤیللی- س/ 1982- چ/ سمیرامیس- ش/ بەغدا- ل/ 260- ق/ گەورە. (بەیاریدەی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە چاپ دراوە).

9-گەلەگورگ- کۆمەڵە چیرۆك- س/ 1983- چ/ الادیب البغدادیة- ش/ بەغدا- ل/ 176- ق/ گەورە. (لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان).

10-شار- ڕۆمان- س/ 1986- چ/ الادیب البغدادیة- ش/ بەغدا- ل/392- ق/ گەورە (لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان- گۆڤاری کاروان).

11-بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی 1925- 1983- س/ 1987- چ/ الادیب البغدادیة- ش/ بەغدا- ق/ گەورە (لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان- گۆڤاری کاروان).

12-هێلانە- ڕۆمان- س/ 1999- چ/ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم- ش/ سلێمانی- ل/ 298.

13-ساڵێك لە تەمەن- بیرەوەری- س/ 1999- بەیارمەتی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم- ل/ 252.

14-شار- ڕۆمان- س/ 2001- بەشی دووەم، لەسەر ئەرکی "عمر عبدالرحمن"ی خاوەنی کتێبخانەی سلێمانی چاپکراوە، ل/ 190.

15-گەلەگورگ و سی و پێنج چیرۆکی هەڵبژاردەی تر، س/ 2001- سلێمانی- چاپخانەی تیشك- ل/ 285.

6-نوسینەکانم- کۆمەڵە وتار- س/ 2003، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

ب-بەعەرەبی:

1-فتاة نغدة قصائد لکامران- ترجمة- 1959- مطبعة کامران- السلیمانیة- 28 صفحة.

2-دراسات معاصرة (منشورات مجلة المثقف الجدید) مشترك- 1975- بغداد- 120 صفحة.

3-ملتقى القصة الاول (موضوعات الملتقى الاول للقصة العراقي 20- 25/ اب/ 1987)- مشترك- 1979- مطبعة دار الحرية/ بغداد- 352 صفحة.

4-عشرون قصة كردية (منشورات مجلة كاروان)- اعداد- 1985- مطبعة افاق عربية- بغداد- 212 صفحة.

## دووەم- لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا:

أ-بەکوردی

1-ڕۆژنامەی (ژین):

-بۆیە ئەمەوێ بژیم- پەخشانە شیعرێکە- لە یەکێ لە ژمارەکانی ساڵی 1954دا بڵاوبۆتەوە. (ئەمە یەکەم بەرهەمی بڵاوکراوەی نووسەرە).

قوتابخانەی شیعری تازە- وتار- ژ/ 1277- 15/ 12/ 1955 (بەناوی- محمد صدیق عارف-ەوە).

-وەرامی رەخنەکەی کاك منگوڕی- وتار- ژ/ 1288- 8/ 3/ 1956. (بەناوی- محمد صدیق عارف-ەوە).

-رەخنەی ئەدەبی- وتار- ژ/ 1296- 10/ 5/ 1956. (بەناوی محمد صدیق عارف-ەوە).

-ئەدیب چۆن ئەنووسێت- وتار- ژ/ 1305- 19/ 7/ 1956. (بەناوی محمد صدیق عارف-ەوە).

-زوبانەکەمان و کەم و کووڕی‌یەکانی- وتار- ژ/ 1315- 4/ 10/ 1956. (بەناوی -محمد صدیق عارف-ەوە).

-هەڵبەست یا چیرۆك- وتار- ژ/ 1341- 18/ 4/ 1957. (بەناوی- محمد صدیق عارف-ەوە).

-هۆنراوەی کوردی و وشەی دوو روو لە سەنگا- وتار- ژ/ 1393- 1958 (بەناوی- محمد صدیق عارف-ەوە).

-وەرامی وتارەکەی ڕۆژنامەی خەبات (کورد و شیعری تازە)- وتار- ژ/ 1492- 3/ 12/ 1959.

2-ڕۆژنامەی (هاوکاری):

-(کامەران) و کاروان لە کورتە وت و وێژێکدا- وتار- ژ/ 8- س/ 1- 6/ 3/ 1970.- بەچرپە- گۆشەیەکی هەفتانەیە- ژ/ 15، 16، 17، 18، 19، 20، 21، 22- 4/25 بۆ 13/ 6/ 1970 (بەناوی -مەزدە- وە).

-ئەحمەد موختار جاف دەنگێکی زوڵاڵی شۆڕش و یاخی بوونە- وتار- ژ/ 21- 6/ 6/ 1970.

-پیرەمێردی چیرۆك نووس- وتار- ژ/ 24- 20/ 6/ 1970.

-ڕوانگە لە بانگەوازەکەوە تا ئێستا- ژ/ 48- 5/ 12/ 1970.

-وت و وێژێك- ژ/ 50- 19/ 12/ 1970

-وەختێك كۆمەڵ بەناو خۆیا ئەڕشێتەوە- ژ/ 52- 2/ 1/ 1971.

-"ئاسۆی ئەرخەوانی"و ترسێكی دووفاق- ژ/ 3- س/ 2- 23/ 1/ 1971.

-پانزە هەزار كیلۆمەترو:

1-چەند ڕاستی‌یەكی ساكار- ژ/ 190- 26/ 10/ 1973

2-چەند هەستێكی ناسك- ژ/ 191- 2/ 11/ 1973

3-گەشتێكی دوای نیوەشەو- ژ/ 192- 9/ 11/ 1973

4-داستانی سپیچكە- ژ/ 193- 16/ 11/ 1973

5-لاپەڕەیەك لە یاداشتە ڕۆژانەكەم- ژ/ 195- 30/ 11/ 1973

6-لەگەڵ ئەدیبە كوردەكانی سۆڤیەتدا- ژ/ 197- 14/ 12/ 1973

-لە ئەدەبی گەلانی ئاسیاو ئەفەریقاوە- وەرگێران لە ژمارەكانی گۆڤاری "لۆتس"ەوە:

1-ئەندونیسیا- ئاه.. ئاه.. ئاه..- چیرۆكی ئیدرۆس- ژ/ 191- 2/ 11/ 1973.

2-كازاخستانی سۆڤێت- شیعری: ئاپای كۆتانبابییف- ژ/ 192- 9/ 11/ 1973.

3-تانزانیا- هەڵبژاردن- چیرۆكی: ڕاڵف نیچ ئەریس- ژ/ 193- 16/ 11/ 1973.

4-سەنیگال- ژنە ڕەشەكە- شیعری: لیۆبۆلد سینگۆر- ژ/ 194- 23/ 11/ 1973.

5-گینیا- ڕەشەبا- چیرۆكی: جیمس نگووگی- ژ/ 196- 7/ 12/ 1973.

6-ژاپۆن- سەربازەكان- شیعری: ماسكۆ تاكی جۆش- ژ/ 198- 21/ 12/ 1973 (بەهەڵە ژمارە -190-ی لێدراوە)

7-هیندستان- میراتی كۆن و نوێكردنەوە لە ئەدەبدا- وتاری: براكاش شاندرا- ژ/ 200- 11/ 1/ 1974

8-دوورگەكانی "رأس الاخضر"- گۆرانی‌یەك بۆ دوورگەكەم- شیعری: گابرێل مارینۆ- ژ/ 202- 25/ 1/ 1974

9-گینیا- سێ جۆر تێگەیشتن سەبارەت بەشانۆ- وتاری: احمد سیكۆتۆری- ژ/ 203- 1/ 2/ 1974

10-سیرالیۆن/ شیعرێكی ئەلین كۆلكەر- كازاخستان/ شیعرێكی ئۆلجاس سلیمانۆف ژ/ 209- 15/ 3/ 1974

11-ئەندێراگاندی دەربارەی ئەدەب و ئەدیبان ئەدوێ- ژ/ 209- 15/ 3/ 1974

12-باغی پرتەقاڵ- چیرۆك نووسی قوبروسی فلیبۆ بیرینیس- ژ/ 217- 10/ 5/ 1974

13-ماڵاوایی لە ساڵی لێكدووركەوتنەوە- شیعری: ئۆگۆستینۆ نتۆ- ژ/ 218- 17/ 5/ 1974.

-چەوساندنەوەی دووسەرەی ئافرەت لە چیرۆكی كوردیدا- ژ/ 310- 25/ 3/ 1976

-ژمارەی پێشووی "ئەدەب و ژیان"م خوێندەوە- ژ/ 324- 1/ 7/ 1976

-ورشەیەكی ڕەخنەی ئەدەبی لە نێوان "ڕۆشنبیری"یەوە- زنجیرە وتارێكی ڕەخنەیی‌ی هەمەچەشنەی هەفتانەیە- ژ/ 325 تا ژ/ 348 ساڵی 1976. ژ/ 349 تا 369 ساڵی 1977.

-مۆنۆلۆژی ناوخۆ لە چیرۆكی نوێی كوردیدا- ژ/ 357، 358، 359،- 2 بۆ 16/ 3/ 1977

-نەورۆزو بەهارو بیرەوەری- ژ/ 360- 23/ 3/ 1977

-ئایا چاری ئەم دیاردەیە چی‌یە- ژ/ 448- 6/ 11/ 1978

-وەرام بۆ ڕەخنەكەی كاك عمر مارف بەرزنجی- ژ/ 458، 459، 460- 22/1 بۆ 5/ 2/ 1979

-لە نێوان بەهرەو تاقیكردنەوەدا- ژ/ 527- 26/ 5/ 1980

-ڕایەك بۆ لێدوان دەربارەی شێوە تەكنیكی ئەفسانەئامێز لە هونەری چیرۆك نووسیندا- ژ/ 528- 2/ 6/ 1980

-شاكارێكی ئەدەبی/ كاتێ نەهەنگەكان كۆچ دەكەن- ڕۆمانی یووری ڕایتخیو- ژ/ 534- 14/ 7/ 1980

-گابریل گارسیا ماركیزو گفت و گۆیەك دەربارەی ئەدەب و ژیان- ژ/ 591، 592- 11، 18/ 6/ 1981

3-ڕۆژنامەی "بیری نوێ"

-حسن قزلجی لە "پێكەنینی گەدا"دا- ژ/267، 268- 2،10/ 12/ 1977

4-ڕۆژنامەی "عیراق":

-بروسكەی ڕازێك- ژ/11- ك2/1978

5-گۆڤاری "هیوا":

-كارخواز- وەرگێران- چیرۆكی صنع الله ئەریسۆی- ژ/12- س/ 1- حوزەیران/ 1958. (بەناوی -محمد صدیق عارف- ەوە)

6-گۆڤاری "بلێسە":

-چەند سەرنجێكی سەرەتایی دەربارەی چیرۆك نووسین- ژ/6- س/1- ك2/1960

-چیرۆك و چیرۆكی شانۆیی كوردی بە نیو سەدەی ڕابوردوودا (بەشی یەكەم)- ژ/9- س/1- مایس/1960

-چیرۆك و چیرۆكی شانۆیی كوردی لە نیو سەدەی ڕابوردوودا (بەشی دووەم)- ژ/10- س/1- مایس/1960

7-گۆڤاری "بەیان":

-ناوی كەسانی چیرۆك چۆن هەڵببژێرین- ژ/3- 1970.

-كە چیرۆك ئەنووسم- ژ/14- 1974

-بەراوردێك لە نێوان چیرۆكەكانی ژمارە (36)ی بەیاندا- ژ/39- 1977

-چیرۆكەكانی ژمارەی پێشووم خوێندەوە- ژ/42- 1977

-نموونەیەك بۆ ڕەخنەی تەتبیقی- ژ/58- 1979

-یەشار كەمال لە نێوان چیای ئاگری و كوێرئۆغڵی‌دا- ژ/64- تەمووز/ 1980.

-جەنابی جانەوەر (شانۆگەری)- ژ/77- ئازار/ 1982

8-گۆڤاری "نووسەری كورد":

-گفت و گۆیەك لەگەڵ شاعیری كازاخستانی (ئۆلجاس سلیانۆف- ژ/11- ك1/ 1973

9-گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ":

-پەنجەرەیەك بەسەر دوارۆژدا- وەرگێڕان- شیعری شاعیری ئازربایجانی ڕەسووڵ ڕەزا- ژ/1- 21/ 11/ 1973

-شێوازە گشتییەکانی چیرۆکی کوردی لە قۆناغی سێهەمیدا- ژ/4- 21/ 12/ 1973.

-چوار ساڵ و چوار ڕووداو- ژ/6- 11/ 1/ 1974 (بەبێ ناو)

-وێنەو نەخشەی دوارۆژ- وەرگێڕان- انعام الجندی- ژ/52- ئاب/ 1976.

-شتێ دەربارەی چیرۆکی سیاسی کوردی- ژ/53- ئەیلوول/ 1976

-نووسینی وردبین و نووسینی سەردەم- وەرگێڕان- وتاری خضیر عبدالأمیر- ژ/57- ك2/ 1977

-باووڵ- وەرگێڕان- چیرۆکی: جاذبیة صدقی- ژ/57- ك2/ 1977

-زانکۆو گەشەسەندنی مرۆڤایەتی- وەرگێڕان- وتاری: د. احمد غنیش- ژ/60- نیسان و مایس/ 1977

-شێوەکانی تەکنیك لە چیرۆکی ساڵانی دوای 1970دا- ژ/62- ئەیلوول و ت1/ 1977.

-حیکایەتی دەرکردنی ژمارە (سفری) ڕۆشنبیری نوێ- ژ/78- ك1/ 1979

10-گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان":

-هەڵسەنگاندنی چیرۆکی (نێچیر)ی محمد موکری- ژ/49 شوبات/ 1978

11-گۆڤاری "کاروان":

-توونێلە ڕەشەکان نهێنییەکی تری گەردوون و بەلام سامناك- ژ/1- ت1/ 1982.

-هەڵسەنگاندنی چیرۆکی (بووك و بەفر)ی جلال محمود علی- ژ/2- ت2/ 1982.

-خەزێم/ ئۆپەرێت- ژ/9- حوزەیران/ 1983

-پێکەنین بەپێی یاسا/ شانۆگەری- ژ/12- ئەیلوول/ 1983.

-بیبلۆگرافیای دوو ساڵەی تەمەنی "کاروان" ژمارە "1" تشرینی یەکەم/ 1982 بۆ ژمارە "24" ئەیلوول 1984- پاشکۆی ژ/26 ت2/ 1984.

-ناوەڕۆکی ژمارەکانی سێ ساڵەی تەمەنی "کاروان" ژمارە "1" تشرینی یەکەم/ 1982 بۆ ژمارە "36" ئەیلوول/ 1985 ژ/37 ت1/ 1985.

-ناوەڕۆکی ژمارەکانی ساڵی چوارەمی "کاروان" ژمارە "37" تشرینی یەکەم/ 1985 بۆ ژمارە/ 48 ئەیلوول/ 1986- ژ/49- ت1/ 1986.

12-گۆڤاری "ئۆتۆنۆمی":

-کورد لە پێشەکییەکەی ئیبن خەلدووندا- ژ/3-س/ 1982.

13-بڵاوکراوەی "ڕوانگە":

-چەند سەرنجێکی سەرەتایی دەربارەی کات و شوێن لە هونەری چیرۆك نووسیندا- ژ/1- 1971.

-گیانی یاخیبوون و بەگژاچوون لە شیعری نەوەی نوێماندا- ژ/2- 1971.

**ب-بەعەرەبی:**

هدیة نوروز- ترجمة- شعر کامران موکری- مجلة الشفق- ع/7- تموز/ 1958.

-لهفة- ترجمة- شعر محمد علي مدهوش- مجلة الفنون- 1959

-رد علی رأي في الادانة الادبیة- مقال- جریدة التاخي- ع/ 1030، 1031- 12، 13/ 5/ 1972.

-بدایة حکایتي اللانهائیة- ترجمة- شعر سعد الله پەروش- مجلة المثقف الجدید- ع/ صفر- 11/ 11/ 1973.

-قصائد من الاعماق- ترجمة- شعر گوران- مجلة المثقف الجدید- ع/1- 21/ 11/ 1973.

-جراح فلسطین في کبد السماء- ترجمة- شعر فاضل شەورو- مجلة المثقف الجدید- ع/3- 11/ 12/ 1973.

-اللاتراث استحالة مطلقة- مقال- مجلة المثقف الجدید- ع/7- 21/ 1/ 1974.

-المرأة والجمال- ترجمة- شعر گوران- مجلة المثقف الجدید- ع/42- 21/ 7/ 1975.

-ملاحظات حول الایلام في القصة الکردیة- مقال- جریدة العراق- ع/17- 8/ 3/ 1976.

-الغفلة في القصة الکردیة- مقال- جریدة العراق

-نافذة علی الشعر الکردي المعاصر- تراجم لقصائد عدد من الشعراء الاکراد- جریدة الفکر الجدید- زاویة اسبوعیة- اعدادد سنة 1977.

-اضاءة نقدیة/ رحلة ابولو الثانیة- مقال- جریدة العراق- ع/597- 13/ 2/ 1978.

-الی وجیه محب للشعر- ترجمة- شعر گوران- مجلة کاروان- ع/2- ت2/ 1982.

-اشکال التکنیك الحدیث في القصة الکردیة/ 1970 وما بعدها- دراسة- مجلة الاقلام- ع/2،3- شباط/ 1984.

-الجسد الصغیر- ترجمة- قصة حسین عارف- مجلة کاروان- ع/28- ك2/ 1985.

-فهرست سنتي عمر "کاروان"- ملحق العدد/ 26-ت1/ 1984.

-فهرست "کاروان" للسنوات الثلاث من عمرها- ع/37- ت1/ 1985.

-فهرست السنة الرابعة ل "کاروان"- ع/49- ت1/ 1986.

# چای شیرین

سەرم لە خۆم سوڕماوە!. ئەمڕۆ بە پێچەوانەی هەموو ڕۆژانی ترەوە، سەماوەرە تێکقوپاوەکەی جارانم، لێبۆتە کەمانێکی نەشمیلەو خۆشترین ئاواز، دەڕژێنێتە دەروونمەوە. قوڕێ گەڕە لە تەلگیراوەکە، کە جاران قێزم لێدەکردەوە، ئێستا زۆر خنجیلو خاوێن دێتە پێش چاوم. بگرە پیاڵە پۆرخزەکان و جامە ژەنگاوییەکەو شەکردانە ڕەزاقورسەکەش، دەڵێیت ئەمڕۆ خۆیان لە ئاوی جوانی هەڵکێشاوەو بەدەم منەوە دەخنێنەوە. دامودەزگای چالێنانەکە هەموو، نازانم بڵێم من بۆ ئەوان یا ئەوان بۆ من، پێدەکەنن و گەشکە دەیان گرێ؟!. هەرچۆنێك بێ ئەمڕۆ وا هەست دەکەم، کە هێزێکی ئەفسووناوی لە ناخی دڵودەروونمدا، ڕەگی داکوتاوەو ئارامی لە بەربڕیوم. ئەی ئەگەر وانییە، بۆچی تا دوێنێش ئەم چوار قۆڵی چاخواردنەوەیە (من و وەستام و وەستاژنم و لەگەڵماندا ئافتاوی کچیان)، هێندە دڵتەنگ و پەستی دەکردم؟!. دەتووت بەکوتەکەوە بەسەرمەوە ڕاوەستاون و، ناچاری ئەم چا خواردنەوەیەم دەکەن. کەچی ئەوەتا ئەمڕۆ هەموو جووڵەو تەقەوڕەقەییەکی، ختووکەی هەستونەستم دەدەن!. هەتا دوێنێ لە شەرم و تەریقیدا، ئارامم لەبەردەبڕاو جێگەم بەخۆم نەدەگرت. کەچی بێئارامیی ئەمڕۆم، ئەنجامی ئەو هێزە ئەفسووناوییەیە، کە گیان و هۆشمی هێناوەتە جۆشوخرۆش.

ئا... لە کاتێکدا کە من هەر لە سووچەکەی جارانمدا، ماتومەلوول دانیشتبووم و بەمجۆرە لەگەڵ خۆمدا دەدوام، ئافتاوو دایکی وەك هەموو ڕۆژانی تر، تەدارەکی چالێنانەکەیان دامەزراندبوو. کلۆ خەڵووزەکانی ناو تەنووری سەماوەرەکە، کەوتبوونە نێڵەنێڵ و کڵپەیان لێهەڵدەستا. ئاوەکەی مێروولەی دەکرد و زیلەیەکی بەچەشنی ئاوازێکی ناسکی پێکدەهێنا. ئیتر لەوەدابوو ها ئێستا هاساتێکیتر، بکەوێتە کەفەکف و جۆشوخرۆش. بێئەوەی بەخۆم بزانم، تاسێکی قووڵ بردمییەوە. کارەساتەکەی دوێنێ، بۆ جاریجارەها سەرنجی ڕاکێشامەوە...

بەڵێ دوێنێ هەر ئەم کاتەبوو، کە هەمان چوارقۆڵی بەدەوری پیرەسەماوەردا کۆمەڵەمان بەستبۆوە. هێشتا فەرمانەکەی وەستاژنم لە گوێمدا دەزرنگێتەوە کە بە ئافتاوی وت:

—دەی چایەکەیان بۆتێکە.

ئافتاویش وەك هەموو ڕۆژانی تر، پیاڵەکانی ئامادەکرد. بەڵام بۆچی بەتایبەتی یەکێکیانی لەوانی تر باشتر دەشت؟!. بگرە شەکریشی دوو ئەوەندەی ئەوانی تر تێدەتەپاند؟!. ئای چەند حەپۆلکەبووم!!. هەموو ڕۆژێ ئەم کردەوەیەم لە ئافتاو دەدی، کەچی جارێك سەرنجم بۆ ئەوە نەچوو لە خۆم بپرسم: ئەری ئەمە بۆچی و یانی چی؟!.

چا دابەشکرا. پیاڵە تایبەتییەکە وەك هەموو ڕۆژان، بەر من کەوت. ئەو کردەوەکەی خۆی لێسەدبارە کردمەوە. منیش ئەوەکەی خۆمم لێسەدبارە کردەوە. چایەکەم دایەوە دواوەو وتم:

—چایکەم هەمدیسان زۆر شیرینە. کەمێکی تاڵم بۆ بەسەریدا بکە.

کەچی ئافتاوم ئافتاو، خێسەیەکی پڕ لە ڕقوکینەی لێکردم. لچێکی لێهەڵقورتاندم و بەنیمچە تووڕەییەکەوە لێی وەرگرتمەوە. دیاربوو تەقینەوەکەی، ئەنجامی پێشخواردنەوەیەکی دوورو درێژبووە. چاوم تێوەبوو، لەباتیی ئەوەی تەنیا پیاڵەکەم بۆ پڕبکاتەوە لە چای تاڵ هێندەی تێقڵپاند تا ژێر پیاڵەکەشی پڕکرد. بێگومان ئەمجارەیان لە تاڵیدا نەدەخورایەوە. بۆیە منیش شەپۆلێکی ڕقوکینە، زۆری بۆ هێنام و لە دڵی خۆمدا وتم: "توخوا دەوەرە چۆن تووشی ئەم چەتیوە دەعەجانییە بووم؟!". ئیتر وەها پیشم لێخواردەوە کە ئەگەر شوورەیی نەبوایە، چایەکەم دەکرد بە چڕوچاوی نەگریسیدا و کارێکم پێدەکرد، با بە دەواری شڕی نەکردبێ. بەڵام وەستاژنم وەك هەستی بەکەتنەکە کردبێ، بە دڵسۆزییەوە لێی پرسیم:

—دەترسم چایەکەت تاڵ بووبێ؟!.

لەگەڵیدا سەرنجمدا ئافتاو، چاوێکی لەدایکی مۆڕکردەوە. وەك ئەوەی بڵێ:

—چاکم کرد.. دەستم خۆش بێ.. خەتای ئەوە!.

منیش لە شەرمنیی خۆمەوە، ناچار لەوەرامدا وتم:

—نەء.. ئێستا زۆر باشە.

ئیتر بێئەوەی بتوانم نقەبکەم، دوو چای تری لەو بابەتەم کرد بە گەروومدا. لەگەڵ هەر یەکێکیشیاندا کە بۆی تێدەکردم، دەمبینی وەستاژن بەتیلەی چاو، خێسەیەکی لێدەکاو ئەویش بەلالووتێکەوە، ڕووی لێوەردەگێڕێ. ئەم کەینوبەینە هەموو ڕووی دەداو وەستام لەولاوە، وەك لە دەریای بیرکردنەوەی خۆیدا مەلەبکا، پەیتا پەیتا چای بەدوای چادا هەڵدەقوڕاند!.

بەدرێژایی ڕۆژی دوێنێ، ئەم کارەساتە لە دڵمدا پەنگی خواردەوە. ئارامی لەبەر دەبڕیم و لێم بوو بە مەراق. بەخۆمم دەووت:"باشە ئەم کچە بۆ وادەکا؟!. چ ڕقێکی لێهەڵگرتووتم؟!. ئایا هیچ خراپەیەکم بۆی هەبووە؟!. بەشیم خواردوە؟!. ئەی چی؟!" بەڵام ئەوەی دوێنێ ئێوارە لە دایکم بیست (خواسەرفرازی بکا)، ئەو مەراقەی لە دڵمدا ڕەواندەوەو، هەموو شتێکی بۆ یەکالاکردمەوە.

هەردووکمان و نەسرینی خوشکیشم لەگەڵماندا، دانیشتبووین و باس هاتە سەر باسی ژنهێنان و شووکردن. ئەمانیش بێقەزاو بەلابن، خۆ خوا نەکا لەگفتوگۆیاندا جگە لەم باسوخوازە، بزانن لە باسێکی تر بدوێن!. وا چوونە خوازبێنیی فلان و فیسار وا گوێزرایەوە!. ئیتر باس بەسەر باسدا هات و، منیش خۆم پێڕانەگیرا. ئەوکەی خۆمم درکاند و لە نووکەوە بۆم گێڕانەوە. کەچی هێندەم نەزانی، دایانە قاقای پێکەنین و، یەك بەسەر یەکتریدا دەکەوتن!. من لەلای خۆمەوە واقم وڕماو، لە تەریقیدا لەشم داگیرسا. بە حەپەساوییەوە لێم پرسین:

—ئەوە بۆچی پێدەکەنن؟!.

ئەوان لەتاو پێکەنین، وەرامیان بۆ نەدەدرایەوە. من وەختابوو لە داخاندا شەق بەرم و لە دڵدا وتم: "تۆ بڵێی شتێکی ناشیرینم لێوەشابێتەوە؟!". ئیتر لەبارمدا نەما. ڕووی دەمم لە نەسرین کردو ویستم، لێشاوی تووڕەییم بەسەر ئەودابڕێژم و وتم:

—ئەرێ تۆ شەرم ناکەیت؟!.. بۆچی وەها پێم پێدەکەنیت؟!.

کەچی ئەو بەدەم قاقای پێکەنینەکەیەوە، وەرامی دامەوە و وتی:

-بەچایە شیرینەکانی ئافتاوی براژنم پێدەکەنم.

من هەر بە تووڕەییەوە وتم:

-وڕێنە دەکەیت؟!.. ئافتاوی براژنتی چی؟!.

ئەوسا دایکم کە زانیی زۆر پەست و دڵگرانم، لە پێکەنین کەوت و وتی:

-بەخێر نۆزدە ساڵت تەمەنەو، هێشتا بەوەت نەزانیوە، کەچای شیرین مانای خۆشەویستییە؟!.

کە بەسەرسامییەوە لێم پرسی:

-خۆشەویستی؟!.. مەبەستت چییە؟!.

ئەمجارە بەبێزارییەوە وتی:

-ئۆی!.. بەڕاستتە یا خۆتم لێ گێل دەکەیت؟!. بە کورتییەکەی ئافتاو حەزی لێکردوویت.. ئێستا تێگەیشتیت؟!.

(قەت ناشێ؟!.. ئافتاو حەزی لێکردووم؟!. ئای لەو فێڵبازی و زۆرزانییە؟!. کەوابێ ئەو چایە شیرینانە، بێمەلامەت نەبوون!. ئا.. ئێستا تێگەیشتم. ئێستا زانیم لە کوێوە قسەی دەکرد. دەی قەیناکا ئافتاو.. خۆ من وامدەزانی هێندەت قین لێمە، کە چاوت پیامدا هەڵنایەت!. تومەز من لە گوێی گادا نوستبووم!. دەڕاوەستە بۆم.. من و تۆو سبەینێ...).

کاتێ دایکم ئەو مژدە خۆشەی دامێ، من لەگەڵ خۆمدا ئاوەها دەدوام. بەمجۆرەش دوێنێ شەو تا درەنگ، خەو نەچووە چاوم. چونکە زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی، ئەم سبەینێیەم دەکرد کە چی بکەم؟!. چۆن ئەو ئافتاوە جانانەیە تێبگەیەنم، کە من مەتەڵەکەیم هەڵهێناوەو ئەویش، دەبێ پاداشتەکەیم بداتێ...

-ڕۆڵە مەحموو.. ئەوە بۆ واکشوماتیت؟!.

وەستاژنم وەك لە دڵی گەڕابێ، کە بیر لە باسەکەی لەمەڕ خۆم و ئافتاو دەکەمەوە، لەگەرمەی ئەم بیرکردنەوەیەمداو، لە کاتێکدا کە دیمەنەکانی کارەساتەکەی دوێنێ بە بیروهۆشمدا ڕادەبووردن، ئەو پرسیارەی بە تەنگەمدادا. منیش زمانم بەیەکدا هات و نەمزانی چ وەرامێکی بدەمەوە. تەنیا لەبەر خۆمەوە بڵمەبڵمێکم کردو، خۆشم نەمزانی چیم وت. ئەویش ئیتر بە زەردەخەنەیەکی پڕ ماناو سەرلەقاندنێك، وازی لێهێنام.

کە چاوێکم بەملاوبەولادا گێڕان سەیرم کرد واچایەکە دەمی کێشاوە. ئافتاویش ئامادەی تێکردنێتی و زەردەخەنەیەکی تێکەڵ لە گلەیی، لەنێوان لێوەکانییەوە سەرەتاتکێم لێدەکا. من تا دوێنێ بە درێژایی ماوەی چاخواردنەوەکە، ڕووم نەدەهات تەنانەت کورتە سەرنجێکیشی بدەمێ. کەچی ئەمڕۆ ئارەزوویەکی بەجۆش، پاڵی پێوەدەنام تێی وردبیمەوە. هەر هەڵێکم بۆ هەڵبکەوتایە، تێر تێر سەرنجم دەدایە. بە دوایدا وام بەبیردا دەهات، کە ئیتر لەسەیرکردنی تێربووم. کەچی هەر هێندەی ڕووم لێوەردەگێڕا، ئەو ئارەزووەم زیاتر جۆشی دەسەند و بێئەوەی هەست بە خۆم بکەم، سەرنجم لێگیردەکردەوە. ئالەم کاتەدا لە دەرگا درا. وەستاژنم ڕاپەڕی و چوو بەپیر دەنگەکەوە. زۆری پێنەچوو بانگی کردە وەستام و وتی:

-باوکی ئافتاو.. وەرە داوات دەکەن.

هەر کە ئەوان ژوورەکەیان چۆڵکردو، من خۆم لەگەڵ ئافتاودا بەتەنیا بینی، لە هیچی نەبوو دڵم کەوتە کوتەکوت و، لەشم داگیرسا. ئارەقێکی گەرم دڵۆپدڵۆپ، نیشتە سەر ڕووخسارم. هەناسەم سواربوو. دەتووت بەشاخێکی سەختدا هەڵزناوم. لەدڵدا دەمووت: ئای کە هەلێکی لەبارە. دەبێ لەدەستی نەدەم و ئەوی لەدڵمدایە بیدرکێنم. هاکا هاتنەوە.. درەنگە.. درەنگە. لەلایەکەوە ترسی هاتنەوەی ئەوان و، لە دەستچوونی ئەم هەلە بەنرخە دڵمی دەکرماند، لەلایەکی تریشەوە شەرمنی دەمکوتی دەکردم و زمانمی دەبردە کلیل. خۆ دەروونیشم جۆشێکی وەهای سەندبوو، کە دەتووت ئاگری نەورۆزی تێداکراوەتەوە. لە ئەنجامدا بڕیارمدا پێ بنێم بە جەرگمدا. چونکە ئەو هەستەی زۆری بۆ هێنابووم، ترسوسام و شەرموشۆ، نەیاندەتوانی بەری لێبگرن و کۆڵی پێبدەن. دەمم هەڵهێنایەوە چیم لە دڵدایە دەری بڕم و وتم:

-ئافتاو!...

کەچی لەوە زیاترم بۆ نەووترا. تەنیا ئەو وشەیەو ئەوانی تر، لەگەرووما گیریان خوارد. لگەڵ ئەوەشدا ئەو تەنیا وشەیە، بەس بوو بۆ ئەوەی ئافتاو، لەوپەڕی مەبەستم تێبگا. لەگەڵ وتنیدا لێشاوی ئەو هەستە بە جۆشەم، لەناخی دەروونمەوە هوروژمی هێنایەدەرەوە. لە دوو توێیدا ئەو پەڕی سۆز و خۆشەویستیم ڕوون دەبۆوە. بۆ ئەویش هەر کە سەری هەڵبڕی و سەرنجی دامێ، ڕوومەتەکانی هێندەی تر سوور هەڵگەڕان. چاوەکانی کەوتنە بریسکەبریسك و، گەشکەیەکی بەختیاری پڕژایە سەر سیمای. ئیتر کە لەوەرامدا وتی:

-بەڵێ.

دەتووت ساڵەهایە چاوەڕوانە من بڵێم: ئافتاو و ئەو بڵێ: بەڵێ. دوایی بێدەنگییەکی دڵپروێن، باڵی بەسەرماندا کێشا. بێگومان ئەو چاوەڕوانی من بوو دەم هەڵبێنمەوەو، قسەکەم تەواو بکەم. منیش چاوەڕوانی وتەیەکی کاریگەری تەڕوبڕبووم، کە بۆم پێك بێت و ئەو لێشاوی هەستونەستەمی پێدەربڕم. کەچی دوای ئەو ماوەی بێدەنگییەی کە بە چەرخێك دەچوو، تەنیا هێندەم بەدەمدا هات کە پچڕپچڕ وتم:

-ئافتاو گیان.. من.. من تۆم خۆش دەوێ.

ئەوی ڕاستیبێ، دەتووت وتەکان بە نەشتەر لە قورگم هەڵدەپچڕن. چونکە یەکەمجارم بوو بە گوێی کچێکمدا هەڵدەدان. ئینجا ئەویش لەلای خۆیەوە، سەرنجێکی قوڵی دامێ و، چاوێکی نازوڕازی بۆ تروکاندم و، زەردەخەنەیەکی شادمانییش کەوتە سەرلێوانی. ئیتر من پێویستم بەوە نەبوو، ئەو بەدەم و زمان وەرامم بداتەوە، بەڵکو چاوە ڕەشە گەشەکانی، بە ئاشکرا پێییان دەووتم:

-منیش تۆم زیاتر خۆش دەوێ.

ئەوسا زمانم بەربوو.بەگاڵتەوگەپێکەوە وتم:

-ئاخۆ چایەکانی ئەمڕۆشم، وەك ڕۆژانی تر شیرین دەبن؟!.

ئەو بەدەم بزەونازێکی دڵڕفێنەوە وتی:

-ئا.. ئەگەر وەك جاران ڕەتیان نەکەیتەوە.

کە دەمم هەڵهێنایەوە وەرام بدەمەوە، تەپەتەپی پێی وەستاژنم دەمکوتی کردم. زۆری پێنەچوو خۆیان بە ژووردا کرد. ئیتر چوار قۆڵی وەك هەمموو ڕۆژانی تر، کەوتینە چاخواردنەوە. من زۆر بە تامۆکام و بێهیچ بێزاربوونێك، سێ پیاڵەم لە چایە شیرینەکانی جاران هەڵقوڕاند. بگرە ئاواتەخوازبووم کە ئەم کۆمەڵی چاخواردنەوەیەمان، هەرگیز دوایی نەیەت و، چایە شیرینە تامدارەکانی ئافتاویش، قەت لە بن نەیەن.

بەسرە- شوعەیبە-1957.

# جەستە چکۆلانەکە

عارەبانـــــەی تراکتۆرەکــــە بێوچــــان هەڵیدەتەکاندن. بێئامــان دەیکوتـان. بەسـات بواری نەدەدا هەست بە حەوانەوە بکەن. لەناو عارەبانەکەدا، سێ زەلامی تریـان لـە گـەڵدابوو. دووانی تریش و هەریەکەیان، هەڵنیشتبووە سەر چاملغی یـەکێ لـە دوو تایـە قەبـەکانی. سـێ زەلامەکە لە بەختی خۆیان بەگلەیی بوون. لەوە دەدوان کە ئەگەر دەدوازەیەك بوونایە، هێندەی تاسە نەدەکرد. یەکێکیان خۆشخۆش دەیووت:

—با داوا لـەو دووبـرادەرە بکـەین، بێنـە نـاو عارەبانەکەوە. هەر باشە!.

دووانەکەی تر دەیان ووت:

—نایکـەن.. دیـارە ئـەوێیان باشترە. قسـەی خۆمان بۆچی لەبەرد بدەین؟!.

ئـەم مـەیلی قسـەکردنی نـەبوو. ملیوانـی پاڵتۆکەی بەری جەستە چکۆلانەکەی باوەشـی، بەشـانوملیدا هەڵدایەوە. لێـواری لەچکەکـەی، بەسەرورووخسـاریدا زیـاتر داکشـاند. زیـاتر ئاخنییە باوەشییەوەو، توندتـر نووسـاندنی بـە سنگییەوە. خامۆشییەکە لوولی دایەوە..

"ئا.. نزیك بەرەبەیان بوو، کـە خـەو زەفـەری پێـبردم و چـاومی پێلێکنـام. دەبـێ یەکسـەر کەوتبمە بینینی خەوەکە.. چۆن بوو؟!. ئا.. من لـەناو دۆڵێکی قووڵـدا بـووم. بینیم چـاو بـەناو دۆڵەکەدا دەگێرێ. هەستم کرد دەمبینێ و پڕ بە دەم هاوارم لێدەکـا. ڕوانیـم دێ و بـە پەرۆشـەوە، بـەرەورووم خـۆی هەڵدەداتـە خـوارەوە. وام هاتـە بـــەرچاو، کـــە وەك پەپوولەیــــەك بەهێواشـــی بەردەبێتـەوە. گەشـکەیەکی تەلیسـماوی دای لـە هـەناوم. باوەشـم بـۆ گرتـەوە. بـەڵام ئـەوە تـەنیا ساتەوەختێکی خایاند. دیم پەپوولەکـە بـۆوە بـە جەســـتە چکۆلانەکــەو تیــژ، بەســـەر ســـەردا بەردەبێتەوە. کسپەیەکی جەرگبڕ، چووە جێگـەی گەشکەکە. هەستم کرد هەناوم تێدا نامێنێ. هێزی ئەژنۆم دەشکێ و بەلادا دێم. بەری بینابیم تاریك دەبـێ و، جەسـەتە چکۆلانەکـەم لێـوون دەبـێ. هەستم کرد دەمرێ و، منیش لەگەڵیدا دەمـرم!.. زارەترەك بووم. لەشی مـردووم ڕاچـەناند و خـۆم ڕاپسکاند. لەخەو بە ئاگاهاتمەوە. هــــەموو ئەندامانی لەشم، دەلەرزین و نوقمـی ئـارەقێکی گەرمی لینج بووبووم".

تراکتۆرەکـە ئەوســاتە، بـەناو وەردێکــدا تێدەپــەڕی. ڕێگاکــە بووبــووە قوڕولیتەیــەکی خەســت. تایــە کەتــەکانی دواوەی، قوڕیــارانی دەکــردن. زۆرتــر بــەپنتکی وردو بەیناوبــەین، تۆپـەڵی گـەورە گـەورە، سـەروگوێلاکی سـواغ دەدان. ئـەم جەسـتە چکۆلانـە لاوازەکـەی، هـەر ئـاخنییبووە باوەشـییەوە. خـۆی بـۆ کردبـووە چەپەرێك و هەوڵی دەدا، نەیەڵێ تۆزقاڵێك قوڕی بەربکـەوێ. سـەری بەســەردا شـۆڕکردەوەو سەرنجێکی دایە. چـاوە ڕەشـەکانی کـە لـە ژێـر لەچکەکــــەوە دەبریســــکانەوە، نیشــــانەی پرسیارێکی پڕ لە سەرسامییان دەنواند!. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد، وەرامی پرسیارەکەی بداتەوەو بۆی باس بکا. بەڵام چۆنی بۆ باس بکا؟!..

".. کە هـەنگاوت نـاو لـە ژوورەکـەی چوویتـە دەرەوە، لە هەیوانەکەدا کەمێ ڕامایت. چاوێکی خێرات بە پێشدەمی خۆتدا گێڕاو هـەڵتروانی.. خانووەکـانی‌لا ئـاوایی.. کەژەکـەی بەرامبــەر.. باخـە چڕەکـانی دامێـن.. پـیرە داربـەڕووەکانی گردەکەی تەنیشت.. هەموو بەڕوونی دەبینران. هـەنگاوت نـاو چوویتـە پێشـترەوە. گەیشـتیتە ئاسـتی لێــواری هەیوانەکــە. ڕاوەســتایت. قـەدەرێکی تـر هـەڵتروانی. ئنیجـا هـەروا بـە چیچکانەوە دانیشتیت. جگەرەیەکت ئاگردا. بە پەرۆشـەوە کەوتیتـە مژلێدانــی.. ئێسـتا دەبـێ کەوتبنـەڕێ و پێش ئـەوەی بگەنـە نـاو شـاخ، ڕۆژیان لێدەبێتەوە. ناو شـاخ و داخ بەشـەو بـۆ منداڵ سامناکە. چاك بوو حسابی ئەوەشم کرد. تا دنیایان تـەواو لێڕووناك دەبێتەوە، دەشتایی دەبـڕن و تروسـکەی گڵۆپـەکانی شـاریان، هـەر لێدیار دەبێ. دوای ئەوە ئیتر ئاسانە".

لــە خــۆت ڕازی بوویــت. ئــەو جگەرەیــەت تــەواوکردو، یــەکێکی تــرت داگیرســاند. بــە پەرۆشترەوە کەوتیتە مژلێدانی.. ئەگـەر هـەموو شت کۆك هاتبێتە پێشەوە، لە دووسەعات و نیو زیاتریان پێناچێ. ئا.. دوو سەعات و نیوی تر و دەگەنجێ. کەرێك و هێسترێك و منداڵێك، بەسـەر پشتی یەکێکیانەوە. زەلامێکیش بەدوایانەوە..

جگەرەیـەك و دووان و سیانی تـرت ئاگردان. کـات زۆر بەسسـتی تێدەپـەڕی. تاقـەتت چـوو. کەوتیتــە ســەرپێ. هــەنگاوت هەڵــهێنا. بــە پلیکانەکاندا چوویتە خوارەوە. گەیشتیتە کۆڵان و گـەماڵێك سووکە حەپەیەکی لێبـەرزبۆوە. وەك بتناسـێتەوە، زوو خـامۆش بـۆوە. ڕۆشـتیت. ڕێگـای نـاو ئـاواییت نەگرتەبـەر. ڕاسـتەوخۆ بەلاڕێدا، بەدەم پیاسەکردنەوە، بەرەو گـەرووی دەربەندەکە ملت نا...".

تراکتۆرەکە هێشتان بێووچان دەیشڵەقاندن. دوو تایـە کەتەکـەش هـەر قوڕبـارانی دەکـردن و سەروگوێلاکی سواغ دەدان. جارێکی تر دەستی ڕاستـی درێژکـردو بەپشـتی ملـی خۆیـدا هێنـا. مشـتێ پنتکــە قــوڕی بەدەســتەوە هــات. بەکەمتەرخەمییــەوە بــەلێواری عارەبانەکــەیدا سوو. ئینجـا لـەپی دەسـتی بـەلاڕانی‌دا هێنـاون بەشرواڵەکەی پاکی کردەوە.

سێ زەلامەکە خامۆش بووبوون. دووانەکـەی سەرچاملغەکان و شوفێرەکەش. کەس نەدەدوا. کـەس تاقـەتی قسـەکردنی نـەما بـوو. تەنانـەت مەکینـەی تراکتۆرەکـەش، کـە ئەوسـاتە لـەناو قوڕێکی خەستی سرێشیدا پەر تەناشی دەکرد، کوژایـەوەو لـە گرمـەو نـەڕە کـەوت. تـا کاتـێ شـوفێرەکە خستییەوە گـەڕو پێـی لێتوندکـرد، ئەگزۆزەکـەی دووسـێ گوللـە تۆپـی تـەقاند. جەستە چکۆلانکـە لـە باوەشیدا ڕاچەنی. ملی قوت کردەوە هەڵڕوانێ و، لێزمەیەکی پنتکەقوڕ شالاوی بەڕوویدا برد. خێرا خـۆی ئاخنییـەوە باوەشی و، بێپرسیارکردن مت بوو. ئەم سەری بەسەردا دانەواند. بەدەم بزەیەکی خاوەوە لێی پرسی:

—ترسایت؟!.

جەستە چکۆلانەکە نەبزاو. تەنیا وتی:

—نەء.

ئەم هەستێکی پڕ لە شانازی، هورژمی بۆ هێناو گەشکە گرتی. هـەردوو مشتی لەسـەری توندکـردن و، نووسـاندی بـە سـنگییەوە. ئـەو هاواری لێهەڵسا:

—ئاخ!..

خێرا مشتی لێشل کردنەوەو بیری‌کەوتەوە:

".. ڕۆژ لـەدەمی کەلەوە سەری دەرهێنـابوو. ڕێگا پێچاوپێچەکەی ناو دەربەندەکە، بەڕوونی



دەبینرا. لە دەمێکەوە چووبوومە سەر تاشەبەردێك و، چوار مەشقی دانیشتبووم. جگەرە لە دوای جگەرەم ئاگردەدا. چاوم لە ڕێگا غافڵ نەدەکرد.

دەرکەوتن.. کەرێك و هێسترێك و زەلامێك بەدوایانەوە. ورد هەڵمڕوانی. هێسترەکە جەستەیەکی چکۆلانەی بەسەر پشتەوەبوو. بروسکەی دڵنیایی و شادمانی، بەهەناومدا تێسکەی کرد.دەروونی ئارام لەبەربڕاوم، حەوایەوە و گەشامەوە. لە دڵدا وتم: خۆزگە دەمتوانی هەر ئێستا مژدەم بدایەتە دایکت.

هاتنە بەرەوە. لە تاشەبەردەکە دابەزیم و چوومە سەر ڕێگاکە. کە گەیشتنە ئاستم، هێسترەکەم ڕاگرت. باوەشم بۆ جەستە چکۆلانەکە گرتەوە. کەنەفتی ڕێگابوو. لەیەکەم ساتدا نەیناسیمەوە. هەروا بە حەپەساوییەوە، تێمی ڕوانی و نەبزاو، بەڵام دوای ساتەوەختەکە، چاوە ڕەشەکانی بروسکەیان داو، خۆی بۆ سەرسنگم شۆڕکردەوە. دەستە باریکەکانی لە ملم توندکردن و هیچی نەووت.

کەوتینەوەڕێ. گەیشتینە هەورازێك. لەنیوەیدا هەستم بە ماندووبوون کرد. خستمەوە سەر پشتی هێسترەکە. هەورازەکەمان بڕی. گەیشتینە بەردەلانێك. ئەوساتە من شانبەشانی هێسترەکە دەڕۆیشتم. لەدڵدا دەمووت: لەسەری ناوەستم. دەمەدەمی نیوەڕۆ، تراکتۆرەکە دەکەوێتەڕێ. چاوەڕێی جێیەکە ناکەم. دەڵێن عەسرەکەی دەگاتە ئاوایی و شەو دەگەڕێتەوە. ئەی ئەگەر نەهات؟!. نا نەء ..چاکتر وایە لەگەڵ تراکتۆرەکەدا بڕۆین. نزیکی عەسر دەگەینەجێ. ئیتر لەوێوە ئۆتومبێل زۆرن. دەتوانین سبەینێ ئێوارە...

—ئاخ!..

کە لە ئاخەکەی بە ئاگاهاتم، هێسترەکە بەسەر هەردوو دەستیدا نووچی دابوو. جەستە چکۆلانەکەمی بەسەر سەردا، خستبووە سەر زەوی. بە پەشۆکاوییەوە پەلامارم داو، لە باوەشم گرت. نەدەگریا. تەنیا دەستی چەپی نابووە سەر ناوچەوانی. کە دەستیم لاداو سەیرم کرد، بینیم هێندەی هەڵماتێك هەڵتۆقیوە!".

کاتێ نزیك بوونەوەو لەوەدابوو بگەنەجێ، عارەبانەی تراکتۆرەکە هێشتا بێووچان، هەڵیدەتەکاندن و دەیکوتان. بەڵام تایە کەتەکان ئەو وەختە، لەبریی قوڕولیتە، زیخبارانی دەکردن.

1977

# چاڵی جەرگی پیرێژن

—(25)ی نیسانی 1963؟.

—بەڵێ.

—لەو ڕۆژەدا ژنتان بۆ نیشانەکرد؟.

—بەڵێ.. بەڵێ..

—نەیانپەرژاوە ئەڵقەکەی لە دەست دابماڵن. تەرمی شەهیدی ئێوە ئەمەیە.

ئەڵقەیەکی زێڕی خۆڵاوی، توورەکەیەک ئێسکوپرووسک، درانە دەست پیرەمێردێک. بەسەرێک چۆڕاوگەی فرمێسکی دەڕژاندە سەر توورەکەکەی دەستی و، بەسەرێکیش دەتووت، مژدەی ژیانێکی نوێی شەهیدەکەی پێراگەیەنراوە.

—لەعنەتتان لێبێ.. نۆ مانگە دەسخەڕۆم دەکەن.. نۆ مانگە ئازاری گومانم پێدەنۆشن.

بەڵام هێشتا هەر بەختەوەربوو. لە ئەنجامدا بەڵگەی شەهیدی، نایە تەنکەی باخەڵی و، توورەکەی ئێسکوپرووسکی خۆی چنگ کەوت.

—ئەی کوڕەکەی من؟!.. بە قوربانتان بم کوڕەکەی من؟!.

پیرێژنێک لە دەمێکەوە وەها دەکرووزایەوە.. لە دەمێکەوە بەهەر چوارلادا هەڵپەی دەکرد.

—هەرچی هات و جەرگی خۆی لە ژێر خاکدا دۆزییەوە. تەنیا جەرگی من ونە!. لە دڵدا بەخیلیی بەوەکانی تر دەبرد.

—داپیرە گیان دڵ لە دڵ مەدە. جەرگی تۆش دەدۆزینەوە.

مامۆستا ئەو ڕۆژە، ئەرکی دۆزینەوەی جەرگی خەڵکی شاری، لە ئەستۆ خرابوو.

—ئەی ئەم شەهیدە خاوەنی نەبوو؟!.

پێشمەرگەیەک بەلوولەی کلاشینکۆفەکەی، ئیشارەتی بۆ کەللەسەرێک و کۆمەڵێک ئێسقانی ناو چاڵێک کرد. پاتاڵی چۆغەیەکی خورمایی و، شەرواڵێکی ڕەشی تێئاڵابوو. کەسێک لە عەشاماتەکە نەهاتە وەرام.

—وادیارە بێکەسە.

—دەبێ خەڵکی شار نەبێ.

—بە جاشکەوشەکانیدا لەلادێی دەچێ.

مامۆستاو پێشمەرگەکان، لەناو خۆیاندا دەدوان.

—توخوا حەمە گیان.. ئێسقانەکانیشتم دەست ناکەوێتەوە؟!.

پیرێژن بەکوڵ دەیلاواندەوە.

—مامۆستا.. پێشمەرگەکان.. خەڵکینە بۆخوا.. حەمەکەی منیش بدۆزنەوە. تەنیا ئەوم هەبوو.

پیرێژن بەردی بەبادەکرد. چنگی لە ئاسمان گیردەکرد و بەسەر زەمینیدا دادەڕماند.

—لەعنەتتان لێبێ.. هەموو جۆرە مردنێکم بۆ دەهێنایە بەرچاوم، ئەمەیان نەبێ.

پیرەمێردەکە، توورەکە ئێسقانی خۆی، لە دۆڵەکەی ئەودیوتردا دەنایە گۆڕەوە.

—جانەوەربوون.

—بوختان بۆ جانەوەر مەکە.

—نەبووە.. کارەساتی وەها قەت نەبووە.

—مێشکی خۆتان خەریک مەکەن. لەوان گەڕێن. ئەوان ئەوان بوون. ئێمە خۆمان چی بووین؟!.

—گێل..گەلحۆ.. گەمژە!.

خاوەن توورەکە ئێسقانەکان، لە گوێی چاڵەکانی جەرگیان، لە سیاسەت دەدوان.

—شەهیدێکی تر دۆزرایەوە.

پێشمەرگەیەک ئەم هاوارەی کرد.

—ئۆخەیش.. ئەوە حەمەیە.

پیرێژن هەڵمەتی برد.

—ڕانکوچۆغەی لەبەردابوو؟!

—نەء.

—پێویست بە بینینی ناکا.

—باش سەیری بکەن.

—جووتێ کلاشی دۆمیی.

— نەء.

—داپیرە گیان.. سەیری نەکەیت باشترە.

داپیرە ئاواتی بەمەرگ دەخواست. بەرەو تەلبەندەکەی خوار دۆڵەکە هەڵهات. بەرووی لەشکرگاکەدا قیژاندی:

—ئێسقانەکانی.. ئێسقانەکانیم بدەنەوە دەست.

لوولەی شەستتیرێکی دکتاریۆف، لە دوور لەرزی و بەخێرایی، شریتێک گوللەی تێچەسپێنرا. شەش حەوت سەرباز ڕاچەنین و بەیەکدا هاتن. ئەفسەرێک بەپەلە، گلێنەی هەردوو چاوی لە دووربینێک گیرکرد:

—ئامادەبن.. ئەمانە کەللەڕەقن.. دەترسم سەرکێشی بکەن.

مامۆستا کەللەی سەری خۆی، نابووە ناو چاڵە بەفرێکەوە:

—داپیرە خۆت لەو تەلبەندە بەدووربگرە.. وەها لەگەڵیاندا ڕێکەوتووین!.

—کوا چاڵی جەرگی من؟!.

—هەر دەیدۆزنەوە.

—..

—ئەم شەهیدە خاوەنی نەبوو؟!.

پێشمەرگەکە هێشتا هەر سەرنجی عەشاماتەکەی، بۆ ڕانکچۆغەو جووتە کلاشە دۆمییەکە ڕادەکێشا. ئەوانیش بەرودواو، چاوی زامی بەسوێی خۆیان بەسەر دەتروکاندو، بەرەو چاڵێکی تر خۆیان بەکێش دەکرد.

دەمی خاکەناز جەرگی پیرێژنی دەجنی. هەر دەمی خاکەنازیش، جەرگی پیرێژنی دەدۆزییەوە.

—خۆم زوو زانیم، ئەمەش چاڵی جەرگێکی ترە.

پیرێژن بەدەم ئەم دەنگەوە، تەکانی بۆ سەر کەناری چاڵی جەرگی خۆیدا.

—داپیرە گیان.. تەگەرە مەخەرە ئیشمانەوە.

پێشمەرگەیەک بەنەشارەزایی، دڵی جەرگی پیرێژنی شکاند!.

—ئەوە چاڵی جەرگی منە.. دڵم وام پێدەڵێ.

ئاواتی پیرێژن، لە دەمی خاکەنازدا دەژیاو دەمرد.

—ئەو شەهیدانە بۆچی نەبرێنە مەڵبەندی باووباپیران؟!. بۆچی لە بیابانی تەنیاییدا تووڕیان دەدەن؟!.

—ئێرە دۆڵی شەهیدانە. لێرەدا لاپەڕەی مێژووی خۆیانیان لە خوێن هەڵکێشا.

—ئەوێ گردی شەهیدانە. لەوێدا باووباپیران، لاپەڕەی مێژووی خۆیانیان نەخشەکێشا.

—دڵم خەبەری داومەتێ کە ئەم چاڵە، چاڵی جەرگی منە. بەو خاکەنازە بڵێن نەحەوێتەوەو، چاڵی جەرگی من بدۆزێتەوە.



پیرێژن ئەو گردە و ئەم دۆڵەی مەبەست نەبوو.. چاڵی جەرگی خۆی دەویست.

–پشتێنێکی چیتکوودەریی ڕەشباو..

–بە قوربانی دەمتان بم.

–شڕواڵ و ستارخانییەکی..

– نەء.. توخوا نەء..

–جوتێك پێڵاوی...

–ئەی هاوار.. کوا جەرگی من؟!.. کوا شەهیدی من؟!.

پیرێژن لە پەوڕوو کەوت. ناخی زەویی بە برژانگی هەڵدەکۆڵی.

–بێنن بەقوربانتان بم.. ئەوە هی منە.

ئەمیان پیرێژن نەبوو. ئەمیان تەمەنی لەسی و پێنج تێپەڕی نەدەکرد. زوو شووی کردبوو. مێردەکەی قوڵپی گریانی لە قوڕگدا دەتاساند.

–قەڵەمپاندانیچکیش لەسەری نووسراوە: کوردستان یان نەمان.

–ئازاد گیان..

دایکی ئازاد تا هێز لە گەرویدا بوو، قریشکاندی و ئیتر لە جێی خۆی گرمۆڵە بوو.

–سەربەرزی بۆ خۆتان و شەهیدانتان.

باوکی ئازادیش بەختەوەربوو. توورەکەی ئێسقانی جەرگی خۆی، نایە بندەستی و ڕووەو دۆڵەکەی ئەودیو هەنگاوی نا.

–مامۆستا..ئەم شەهیدە بێکەسە چی لێبکەین؟.

پێشمەرگەی لای چاڵی جەرگە بێخاوەنەکە، ئەم پرسیارەی کرد.

–مامۆستا وا ڕۆژ دەکوژێتەوە.. کوا چاڵی جەرگی من؟!.

–داپیرە گیان.. هەر دەیدۆزینەوە.

–من دەڵێم کوا چاڵی جەرگی من؟!.

–...

داپیرە بەرەو لەشکرگا هەڵمەتی بردەوە..

–کوا چاڵی جەرگی من؟!.

دوو پێشمەرگە گرتیانە باوەش و، کەوتنە ماچکردنی دەستی ڕەگاوی و ڕوومەتی چرچی.

–کوا چاڵی جەرگی من؟!.

خۆی ڕاپسکاندو ڕووەو ناوشار هەڵهات. ناو کۆڵان و سەرشەقامەکانی شار، تا نیوەشەو ئەو هاوارەیان تێدا دەتەقییەوە. تا هاوارەکە لەناکاوێکدا کپ بوو. ئەوسا مەردمەکەش سرەوتیان داو نوستن.

**مایس 1970**

# کانییه ڕەحمان

دوو تاشەبەردو سەریان بە یەکەوەناوە. یەك یەکتری ڕاگیردەکەن. بنچیان داکوتاوەتە بێخی، دوو دامێنەگردی شانبەشانەوە. لەنێوانیاندا دەلاقەیەك لە زەوییەکەدایە.لەناو دەلاقەکەدا، ئەڵقەیەك دەرووە قوڵپ، لە یەکبینا هەڵدەقوڵێنەوە. وەك ڕستێك گۆی مەمك، بێووچان دەفری کانییەکە شیر دەدەن. دەفرەکە لێوداره. لێوەکە چۆڕاوگە بە دەرووەقوڵپەکان دەبەستێ. بەرەو خوار بە ژێر تریفەی مانگەشەوەکەدا، دەیخاتە نەرمە قەڵبەزە. دەیگەیەنێتە ژێر پیرەداربەڕوویەك و، دەیرژێنێتە دەفرێکی فراوانترەوە. لەوێدا سێبەری پیرەدار بەڕووەکە، تریفەی مانگی لێقەدەغە دەکا. ڕووناکییەکی کز لە دوو تەلەبەردی سپییەوە وەردەگرێ، کە لەمبەرەوە ڕاخراون. لەوێش تێدەپەڕێ. سەرلەنوێ بەژێر تریفەی مانگەشەوەکەدا، دەکەوێتەوە نەرمە قەڵبەزە. دەکشێ و دەگاتە ئاستی کوختە کەڵەکێك. شۆڕەبییەك پڕ بە پڕ، بەسەریدا چاماوەتەوە. خۆی پێدادەکاو لە چاو ون دەبێ. بەڵام هەرزوو لەودیوییەوە، سەر دەردێنێتەوە. لەوێوە ئیتر هەروا بۆ ماوەی سی چل هەنگاوێك، بەرەو خوارتر دەڕواو خۆی بەمزگەوتدا دەکا. لەنێوان گونجێکەوە، دەقڵپێتە حەوزێکی کۆنکرێتیی سێبەچوار مەترییەوە. حەوزەکە لە پێشدەمی هەیوانی مزگەوتەکەدایە. تریفەی مانگەشەوەکە دەیگرێتەوەو، بریسکەبریسکی پێدەخا. تریفە خۆی بۆ ناگەیەنرێتە، بنەوەی هەیوانەکە. بەوە نوقمی تاریکییە. لە قووڵایی تاریکییەکەدا، تروسکەیەك بەیناوبەین، خۆش دەبێ و کزدەبێتەوە. تروسکەی ئاگری جگەرەی، نێوان دوو پەنجەیەکە. خاوەنی دوو پەنجەکە، پاڵی داوەتەوەو قاچی لێڕاکێشاوەو. دەڕوانێتە حەوزەکەو چاوی بەسەریدا ڕواوە.. بەسەر سکی ماسییەگەورەدا ڕواوە!. ماسییەگەورە دیاریی دەستی خۆی بوو. خۆی هێنای و خستییە ناو حەوزەکەوە...

—باپیرە ئەها.. باپیرە تۆ سەیرکە.. ئەها!..

حەمەد بەگیری هێنابوو. هێندەی پەنجە تووتەیەك بوو. لەناو جامەکەدا هەڵدەبڵووقایەوە. تۆ بۆی پێکەنیت. پێتووت:

—بابە گیان گوناحە.. بیخەرەوە ئاوەکەوە.

ئەو وتی:

—نا باپیرە.. بەخێوی دەکەم.

تۆ بە ناچاری هەڵسایت، جامەکەت پڕکردەوە لە ئاو. ماسییە پەنجەتووتە، لەناویدا کەوتەوە پێچوخول. کاتێ گەڕانەوە ماڵەوە، بۆت خستە مەنجەڵێك ئاوەوە. خۆشی چوو تۆزێ نانەوردەی تێفرێدا. شەو کە نوستیت، خەونێکی سەیرت بینی. بەیانییەکەی بە حەمەدت وت:

—تۆ حەزدەکەیت ماسییەکەت بمرێ؟!.

حەمەد وتی:

—نەء.

ئنجا پێتووت:

—دەکەوابێ با پێکەوە بیبەین، بیخەینە حەوزەکەی مزگەوتەکەوە. چونکە لەوێدا ئیتر بۆ خۆی، گەورە دەبێ و هەموو ڕۆژێکیش، دەچین سەیری دەکەین.

حەمەد قایل بوو. چوون خستتانە حەوزەکەوە.بەدوایدا حەمەد لەسەر قەولەکەی خۆت، هەموو ڕۆژێك یەخەتی دەگرت وەدەیبردیت بۆ سەیرکردنی. سەرنجت دەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بە خۆدادێ و گەورە دەبێ و تۆش تابێت زیاتر هۆگری دەبیت و بە تەنگییەوە دێیت. تاوای لێهات ئینجا تۆ، یەخەی حەمەدت دەگرت کە بچن بۆ سەیرکردنی. ئەوسا بڕیاریشت دا هاوەڵی بۆ پەیدا بکەیت. هەر لەگەڵ حەمەددا پێکەوە چوون، سێ ماسییە پەنجە تووتەی ترتان گرت و، هێناتانن کردتانن بە هاوەڵی.

ڕۆژ هات و ڕۆژ تێپەڕی. ماسی گەورەبوون. کەوتنە زاووزێ و زۆر بوون. لێیان تەلەف و لێیان پەڕەوازە بوون. بەدزییەوە لێشیان ڕاوکراو خورا. بەڵام ماسییە گەورە هەرمایەوە. خۆی مەیلی لەوە نەبوو، حەوزەکە جێبێڵێ و ڕوو لە چەم بکا. تۆ لەوە دڵنیا بوویت و لەم ڕووەوە ترست نەبوو. لەوەش نەدەترسایت لە خۆیەوە تەلەف ببێ دەتبینی بۆتە چ کەڵانتەرێکی ناو حەوزەکەو بەوەدا، لە تەمەنی درێژی بێباك بوویت تەنیا لە ترسی غەدری ئادەمیزاد، دڵت بۆی دەکەوتە غایلەوە. تەنانەت لەمەشدا تەواو دڵنیابوویت، کەشتی وەها قەت لە خەڵکی ئاوایی خۆیان ناوەشێتەوە. دەتزانی هەموو بەگەورەو بچووکەوە، وەك تۆ خۆشیان دەوێ و وەك تۆ، هۆگرین و هێندنی تۆش بە تەنگەوەن بمێنێ. ئا.. تاقە ترست لەوەبوو ك غەریبەیەك، لەوانەی ڕێیان دەکەوێتە ئاوایی و شەو لە مزگەوت بەسەر دەبەن، تەماع بیگرێ و دەستی تێی بچێ لەبەر ئەوە هەموو جار بە سۆفی ڕەحمانت دەووت:

—سۆفی دەستم دامێنت.. ئاگاداری بە.. لێی غافڵ مەبە.

بگرە جارەها ڕوویدەدا کە هەر لە خۆتەوە، بەرامبەر بە یەکێك لەوانە، دڵت ختوورەی دەکرد. خۆت پێڕانەدەگیرا. دەچوویت ئەو شەوەت لە مزگەوت بەسەر دەبرد.

ئای ماسییە گەورە!.. چارەنووست بەچی شکایەوە!. وای لێهات؟!.. ها؟!.. وای لێهات کە ئاوەها زایەببیت؟!. کە بەم دەردە لەناوبچیت؟!. حەمەد.. وەرە بڕوانە.. وەرە سەیرکە.. حەمەد.. حەمەدەکە وەرە!..).

لە دەنگی خۆی ڕاچەنی و بەئاگاهاتەوە. هەڵسایەسەرپێ و چۆوە بەلای ماسییە گەورەوە. جەستەی ماسییە گەورە، بەگازی پشتدا سەر ئاو کەوتبوو. بە دیارییەوە هەڵتروشکایەوە. هەردوو دەستی بۆ درێژکردن. وەك جەستەی مەلۆتکەیەکی پشتی خۆی بێ، لە ئاوەکەی دەرهێنا. بۆ جاری دووەم هەڵیسەنگاندەوە. بۆ جاری دووەمیش وتی:

—هێندەی پەنجەتووتەیەك بوویت.. پەنجە تووتەیەك!.

شەپۆلی خەمێکی قووڵ، لە ناخییەوە قوڵپیدا هەستیکرد هەناسەی سواردەبێ و دڵی دەگوشرێ.. پەنجەو دەستومەچەکی شل دەبن و، جەستەی ماسییە گەورە بەردەدەن. بینی بەردەبێتەوە ناو حەوزەکە. سەرنجیدا بە قووڵایی ئاوەکەدا ڕۆدەچێتە خوارەوەو، ئینجا وردەوردە هەڵدەکشێتەوە. سکە سپییەکەی دەکەوێتەوە، بەرتریفەی مانگەشەوەکە. پوولەکەکانی وەك وردەشووشە دەبریسکێنەوە.

—حەمەد.. بەرخەکەم..وەرە ببینە.. وەرە بڕوانە!.

دوو دڵۆپ فرمێسکی قەتیس، بەری بیناییان لە چاوانی تەنی. دیمەنی جەستەی ماسییەگەورەیان، لێڵێڵ کرد. خۆی خستەوە

سەرپێ. ڕووی وەرگێڕاو پشتی لە حەوزەکەکرد.چووە پێش هەیوانەکە. سەری هەڵبڕی و ڕوانییە خڕۆڵکەی مانگ. دوو دڵۆپ فرمێسکەکە، بەری بیناییان هێشتا هەر لێدەتەنی. دەستی ڕاستی بەرزکردەوە. پشتی پەنجەی شایەتمانی، بە هەردوو چاویدا هێنا. ئەوسا بەری بینایی لێڕوون بۆوە. مانگ بەدەوری خۆیدا خەرمانەی دابوو. دیمەنێکی دڵگیری دەخستە پێش چاوی. ئەوە سووکە هەستێکی خەوانەوەی پێبەخشی. بەڵام زۆری نەخایاندو خێرا، چاوی لێداگرتەوە. هەنگاوی ناو لە هەیوان بەدەرکەوت. بەلای دەستەچەپدا سووڕا و، بەرەو ژوور هەنگاوی سەرخست. گەیشتە ئاستی کوختەکەڵکەکەو ڕاوەستا. سەرێکی کێشایە ناوەوە. شۆڕەبییەکە بەسەریدا، بووبووە چەترێك و ڕووناکیی مانگەکەی، لێقەدەغە دەکرد. ویستی وەرچەرخێ و بکەوێتەوە هەنگاونان و، غەڵبەغەڵبێکی ناسکی کپ گیریدا. وای هاتە بەرگوێ، کە لە گونجەکەوە دێ. حەزی کرد حاڵی ببێ و بە پەرۆشەوە، گوێی ڕادێرا. وردەوردە لەلای ڕوون دەبۆوە. دەنگەکانی لێئاشکرا دەبوون..

(.. ئەوە مەنیج نییە؟!.. ها؟!.. بەرێ وەڵلا خۆیەتی.. —مەنیج— بەڵێ مامە.. فەرموو— کوا؟!.. ها؟!.. وا لە ژوورەوە— خەرامان.. هۆ خەرامان..

—بەڵێ باپیرە..

—بەرخەکانت..

—باشە باپیرە.. هەر ئێستا.

—مەنیج.. کچەکەم..

—...

—مەنیج.. هۆ مەنیجە..).

ئەمجاریش لە دەنگی خۆی بە ئاگاهاتەوە. سەرێکی پڕ لە داخوخەفەتی بادا. جەستەی بەرەوژوور بەکێش کردەوە. جەستەی هێشتا بەخۆوەبوو. شەست و شەش ساڵ و، ماسولکەکانی هێشتا توندو تۆڵییان تێدا ماوە. بەم بارەدا هەستی بەلاوازی و شەکەتبوون نەدەکرد. بەڵکو بە دڵودەروون، لەژێر باری گرانیاندا دەیناڵاند.

گەیشتە ژێر داربەڕووەکە. لەئاستی یەکێ لە تەلەبەردەکاندان ڕاوەستاو سەرنجێکی دایە. تا ئەوساتە، نیازی لادانی لەدڵدا نەبوو. ئانوسات سەری لێهەڵدا. کلاشەکانی داکەندن و دانیشت. هەردوو قاچی درێژکردن و، ڕایهێشتنە ئاوەکەوە. کتوپڕ وای هەستکرد، کە تەزووی حەوانەوەیەکی تەلیسماوی، لە کەڵەموستی پێیەوە بە قاچ و پووزیدا، بەرەوژوور هەڵدەکشێ و بەدەمارەکانی سەراپای لەشیدان تەشەنە دەسێنێ، تا دەگاتە وردە دەمارەکانی هەردوو پێڵووی. ئینجا پێڵوو شل دەبن و بەسەر یەکدیدا دادەکشێن و، چاو لە بینین دەخەن و.. بە هۆش پێدا دەچێتەوە..

(ئارام و ئۆقرەم لە بەربڕابوو. تەواو تەنگەتاو بووبووم. جێم بە خۆم نەدەگرت. ڕۆژانی لەوەبەر هێجگار وانەبووم. ئەمڕۆ زەینی لێسەندم. کە لە خەو هەڵسام، وام هەست کرد کە سەری دنیام لێهاتۆتەوەیەك. نەمدەزانی چی بڵێم.. چی بکەم.. کوێ بچم؟!. بێپەروا بەناو ماڵدا، دەهاتم و دەچووم. لە ژوورەوە بۆ هەیوان. لە هەیوانەوە بۆ حەوشە. لە حەوشەوە بۆ ژوورەوە. جگەرەم بە جگەرە دادەگیرساند. نانی بەیانیم بۆ نەخورا. تەنیا یەك پیاڵە چام هەڵقوڕاند. ڕەشۆ پێمی زانی. ویستم خۆم هێمن بکەمەوەو نەمتوانی. ئاگام لێبوو چوو مەنیجی ئاگادارکرد. مەنیج حەمەد و خەرامانی نارده گیانم. پێم خۆش نەبوو. وەڕس بووم و لەماڵ بەدەرکەوتم. ڕەشۆ گەیشتە سەرم. لەبەردەرگاکەدا گرتمی و وتی:

—بابە چ خێرتە؟!.

لەرەی دەنگی نا ئاسایی بوو. سەرنجم دایە. سەرباری دەردی گرانی دڵی خۆم، بۆ حاڵی ئەویش کسپە لە هەناوم هەڵسا. هەر ئەوە بوو نەدەگریا. وەڵامیم بۆ نەدرایەوە. لەسەری نەوەستام و بەخێرایی، هەنگاوم ناو دوورکەوتمەوە. ماوەیەکی زۆر سووڕامەوە. زۆر دۆست و ناسیاوم بەسەرکردنەوە. بۆ نیوەڕۆ گەڕامەوە ماڵەوە. ڕەشۆ و مەنیج، بە چەشنی حەمەد و خەرامان مامەڵەیان لەگەڵمدا دەکرد. تەقەلایان دەدا سەبووری بە دڵم بدەن. نانی نیوەڕۆشم بۆ نەخورا. بەدوامدا ڕەشۆو مەنیجیش، دەستیان کێشایەوە. حەمەد لێمان بە ئاگاهات. چاوێکی بە پرسیاری، بەڕووخساری هەرسێکماندا گێڕاو ئەویش، دەستی هەڵگرت. هات خۆی کوتایە باوەشمەوەو، دەستی کردە ملم. دەمی نا بەڕوومەتمەوەو ماچی کردم. وتی:

—باپیرە بۆچی نانت نەخوارد؟!.

پرسیارەکەی پەشۆکاندمی. بەڵام دانم بەخۆمدا گرت و وتم:

—بابە گیان برسیم نەبوو.

ئاگام لێبوو ڕەشۆ بەچاو هێمایەکی بۆ مەنیج کرد. مەنیج هات حەمەدی لەکۆڵ کردمەوە. خەرامانیشی بردو دەوریان چۆڵ کردم. ئەوسا ڕەشۆ دیسان لێمی پرسی:

—بابەگیان.. چ.. خێرتە؟!.

پڕبەدڵ حەزم دەکرد وەڵامی بدەمەوەو نەمبوو. تەنیا سەرنجێکی قووڵم دایەو ئیتر ئەویش هیچی تری نەووت. هەڵساو جێی هێشتم. مامەوە خۆم و خۆم.. خۆم و ئاگردانی جگەرە بەدوای بەدوای جگەرەداو پێشخواردنەوەی دڵئاوسێن و مێشکتەقێن!.

لە دەمەدەمی عەسردا، توانای خۆڕاگرتنم لە بەربڕا. ئەوکاتە ڕەشۆ لە ماڵ چووبووەدەر. مەنیج بە جلشتنەوە خەریك بوو. خەرامان بەدەوریدا دەخولایەوە. حەمەد لە کۆڵان یاریی دەکرد و فرسەتم هێنا. ڕاپەڕیمە سەرپێ و پشتێنم بەست. کلاشەکانم لە پێم هەڵکێشان. بە هێواشی لە ژوور بەدەرکەوتم. پێم نایە حەوشەو بەرەو دەرەوە هەنگاوم نا. حەوشە کەوتە پشتمەوەو دەنگی مەنیج بەگوێمدا چزا:

—مامە ئۆغر بێ؟!.

لەرەی دەنگی، وەك ئەوەکەی بەیانیی ڕەشۆ بوو. هەر بەدەم ڕۆشتنەوە، نیمچە ئاوڕێکم لێدایەوە و وتم:

—دەچم سەرێك لە سمایل دەدەم.

ئیتر هەر هێندەی کەمێك دوورکەوتمەوە، ملم پێوەنا. هەتا لە ئاوایی بە دەرهاتم، هیچ ئاوڕێکم نەدایەوە. هەنگاو لە دوای هەنگاو، بە ئاشکرا هەستم بە خۆم دەکرد، کە بارە گرانەکە لەسەر شانم سووك دەبێ.. کە ڕوو لەوە دەکەم بتوانم ئاسایی هەناسە بدەم. ئەوسا وچانێکم گرت. وەرچەرخام و هەڵمڕوانی. بەچاوی دڵ، حەمەد و خەرامان و ڕەشۆو مەنیجم دەبینی. دڵم گوشراو ترسی ئەوەم لێنیشت مۆتەکەکە چۆك دابداتەوە سەرسنگم. ڕاچەنیم و تینم دایەوە بەرخۆم. وەرگەڕام و ملم پێوەنایەوە. گڕوتینی لاوێتیم بەبەردا هاتبۆوە. وەك سوێسکە هەنگاوم دەنا. هاتم.. بە بێهیچ پشوودانێك هاتم. ڕۆژم لێئاوابوو. دنیا تاریك داهات.مانگ هەڵهات و دنیای ڕووناك کردەوە. وەختێ ئەو گەیشتبووە سەرسنگی ئاسمان، منیش خۆم گەیاندبووە مەڵبەند. ئەملاو ئەولام نەدەکرد و یەکسەر بۆ مزگەوت.. بۆسەر حەوزەکەو دیدەنیی ماسییە گەورە. بەڵام ماسییە گەورە.. داخ.. ماسییەگەورە کسپەی لە جەرگم هەڵساند. بریسکەی سنگ و سکە سپییەکەی، ڕاستەوخۆ تێسکەی کردە ناو چاومەوە. ئەوەی لێی دەترسام دیم. ئەوەی جارەها لە خەودا دەمدی، بەڕاستی دیم. لێی نزیك بوومەوە. بۆی نیشتمە سەرچیچکان. هەردوو دەستم بۆ درێژکردن. وەك جەستەی جگەر گۆشەیەکەم، لە

ئاوەکەم دەرهێنا. گرتم بەسەر دەستمەوەو بە سۆزی باوکێکەوە، ئەمدیوو ئەودیوم پێکرد. ماوەیەك پیایدا هەڵمڕوانی. ئەوسا بە ئەسپایی خستمەوە ئاوەکەوە. کەوتەوە سەر گازی پشت و، سنگ و سکە سپییەکەی لەژێر تریفەی مانگەشەوەکەدا، دایەوە بریسکە بریسك. دەمویست چاوی لێلانەدەم و نەمتوانی. چاوم ماندووبوو. بینایم لێکەلا خست و...".

کاتێ خۆی خستەوە سەرپێ، لە مانگ بە ئاگاهات، کە بەدامێنی ئاسماندا داگەڕابۆوە خوارەوە، ڕووناکییەکی ڕاستەوخۆی، دەگەیاندە سەر کانیاوەکە. وەك ڕووی ئاوێنەیەك، ورشەی لێهەڵدەستاندو دەیدا لەناو چاوی ئەو و وریای دەکردەوە. کلاشەکانی لە پێکردنەوە. کەمێك ڕاماو بەدەوری خۆیدا ورد بۆوە. ئەوسا هەنگاوی ناو ژێر داربەڕووەکەی جێهێشت. بەرەو ژوور کەوتەڕێ. بەپاڵ جۆگەلەکەدا ڕۆیشت. بریسکوهووڕی دەیدا لە چاوی و، بە شەوارەی دەخست. حەزی دەکرد ئەو چاوەی تێی دەبڕێ، بەسات لێی لانەداو نەیدەتوانی.

گەیشتە شوێنمەقسەد. جووتە تاشەبەردی لێدەرکەوتن. ڕاوەستاو وردبۆوە. سەرنجی دانێ. دەتووت تەمەنێکە لێیان دوورکەوتۆتەوەو لەوپەڕی دنیاوەن بۆ بینینەوەیان هاتۆتەوە. گەشکەیەك دای لە هەناوی. زەردەخەنەیەك بەسەر لێوییەوە بروسکەیدا. چووە پێشترەوە. تەواوی دیمەنی کانییەکەی کەوتەوە بەرچاو.. دیمەنی کانییە ڕەحمانەکەی. بەدیارییەوە ڕاوەستا. هەردوو دەستی خستنە بەرپشتێنەکەی. سەری بەسەر سنگیدا شۆڕکردەوە. چاوی بڕییە دەرووەقوڵپەکان، کە لەیەکبینا لەژێر تریفەی مانگەشەوەکەدا هەڵدەبلۆوقانەوە. بەبینینیشیا لە ئاگا کەوت. بە بیروهۆش پێدا چۆوە...

(.. لەپێش تۆدا زۆر کەسی تر بەلایدا ڕابوردبوون، بێئەوەی سرەنج و بیریانی بۆ بچێ. تەنانەت تۆ خۆشت، بەدرێژایی نۆزدە ساڵەکەی تەمەنت، سەدان جار بەلایدا تێپەڕی بوویت و خەیاڵت بۆی نەچووبوو. بەڵام چ ئەوان و چ تۆ، تا ئەو کاتە ناهەقتان نەبوو. تەنیا دوو گابەردبوون بە تەنیشت یەکەوەو، یەکێ هەروا سێ چوار بستێکیان لێبەدەرەوەبوو. تەڕاییەك گڵەکەی دەوروپشتی، لێکردبوونە قوڕولیتەیەکی ڕەشداگەڕاو. قوڕولیتەکە بە قامیشەڵانێکی چڕ داپۆشرابوو. قامیشەڵانەکە ئەوسێ چوار بستەشیانی، لە چاوی ڕێبواری ئاسایی ون دەکرن. تۆ ئەو ئێوارەیە، وەك ڕێبوارێکی ئاسایی ڕانەبووردیت. دووسێ دەزوولەی ئاودز، کە لە خواررووی قامیشەڵانەکەوە بریسکەبریسکیان بوو، سەرنجتیان ڕاکێشا. هێزێکی نهێنییان لە ناختدا بزواندو، هانی دایت بچیت بەلایانەوە. پێت پەتیکردن و چوویت. چنگوپەنجەت تێنان. هەستت کرد لەوەدەچێ، کە بەری ئاوێکی پەنگخواردوو بەربدەیت. وازت لەوان هێناو سەرکەوتیتە سەرەوە. هەڵتڕوانی و وردبوویتەوە. هاتیتەوە خوارەوە و هەنگاوت نایە قامیشەڵانەکەوە. تاقولاپێت دەچەقییە قوڕولیتەکە. چوویت بەلای دوو گابەردەکەوە و دەستت لێکوتان. بە قوڕولیتەکەدا قاچت بەپاڵیاندا ڕۆبردە خوارەوە. هێزە نهێنییەکە، گەرای نیازێکی لە دڵتدا دادەنا. هاتیتەوە دەرەوە. چوویت لەسەر بەرزاییەك دانیشتیت و، کەوتیتە سەرنجدان و وردبوونەوە. نەگەیشتیتە ئەنجام. بەجێت هێشت و ڕۆیشتیتە ماڵەوە. شەو خەو نەدەچووە چاوت. هەر دەتهێناو دەتبرد و بیرت لێدەکردەوە. تا لە درەنگوەختێکدا بڕیارت داو دڵنیانووستیت. بۆ بەیانی لەگەڵ تاریك و ڕووندان لە خەو ڕاپەڕیت و ملت پێوەنا. بەربوویتە گیانی قامیشەڵان و پاکۆت دا. ئینجا پاچ و خاکەنازت، لە قوڕولیتەو گڵوخوڵ خستەکار. خەڵکی ئاوایی لەم کارەت سەرسام بوون و بەر لە هەموویان باوکت. کە خەبەری بیست هات بۆلات. وتی:

—کوڕەکەم بەتەمای چیت؟!.

تۆ وتت:

—بابە.. شتێکەو لە دڵم گەڕاوە. تەقەلایەکەو دەیدەم.

ماوەیەك بە دیارتەوە دانیشت. بێئەوەی هیچ قسەیەکی تری تێدا بکا، جێی هێشتیت و تۆش بەردەوام بوویت. لە ڕۆژی یەکەمدا، جێقامیشەڵانت بە بنگاشە بەردەکەدا کردە چاڵە لیتەڵانێکی خەست. لە ڕۆژی دووەمدا، لیتەڵانێکی شل و خاو. لە ڕۆژی سێیەمدا، چۆڕاوگەی لێڵاوێکت بەرەوخوار لێخستەڕێ. چۆڕاوگەی لێڵاو ئاوایی خرۆشاند. کوڕگەل هاتن و لە دەورت خڕبوونەوە. باوکیشت هات و بەشانازییەوە، دەستی بە پشتتدادا.

ئەو شەوە لە ئاواییدا، باس هەر باسی تۆو کانییەکەی تۆ بوو. بۆ بەیانی کوڕگەلی ئاوایی، بڕیاری هەرەوەزیان بۆ دابوویت. هاتن پێبەپێی تۆ، شانیان دایە بەری. لە دەمەدەمی عەسردا، قامیشەڵان بوو بەکانی.. بوو بەکانییە ڕەحمان. کوڕگەل خۆیان وەهایان ناو لێنا. بەدەم پاچ و بێڵ وەشاندنەوە، ناویان بەکانییە ڕەحمان دەبرد. تۆش گەزگەز بالات پێدەکرد. لە خۆشییاندا هەر ئەوەبوو خۆت نەدەپڕووکاند. دەتویست ساتێ زووتر کانییە ڕەحمانەکەت، بکەوێتە سەر هەوای خۆیو، ئەم ئاوە ڕوونە بێگەردەی، بەرەوئاوایی جۆگەلە ببەستێ.

ئای کانییە ڕەحمان ئای!.. مەگەر تەنیا خۆم و خۆت، بە نهێنییەکانی ئەو عەشقە بزانین کە کەوتە نێوانمانەوە، مەگەر هەر خۆم و خۆتن لە هەموو کەینوبەینێکی ئاگادارین. خەڵکەکە تەنیا هێندەیان پێدەزانی و دەووت، کە ڕەحمان عاشقی کانییە ڕەحمان بووە. دەیانبینیم هەموو ڕۆژێك، وەك عاشقێکی دێوانە دێمە دیدەنیت. بەدەورتدا دێم و دەستت پێدا دێنم و بەدیارتەوە، بە چەشنی عاشقێك دادەنیشم. ئا.. خەڵکەکە تەنیا هێندەیان پێدەزانی و بەوەدا، ناومیان بە ڕەحمانی عاشقی کانییە ڕەحمان برد. بەڵام خۆم و خۆت زۆر شتیتر پێدەزانین. زۆر شتیتر کانییە ڕەحمانەکەم.. کانییە ڕەحمانەکەی خۆم).

مام ڕەحمانی پیری تەمەن شەست و شەش ساڵە، ئەمجاریش لە دەنگی خۆی وریابۆوە. ڕووەو ئەڵقەی دەرووەقوڵپەکان، بەچۆکدا هاتبوو. بۆ کانییە ڕەحمانەکەی، چوبووە سوژدەیەکی عابیدانە. لەسەرخۆ بینایی لەوان لاداو، سەرنجی بەرەوژووریان سەرخست. بەسۆزەوە بەبالای هەردوو تاشەبەردیدا هەڵڕوانی. تەزووی حەوانەوەیەکی تەلیسماوی، لە قووڵایی ناخییەوە سەری لێهەڵداو، بەسەرانسەری دڵودەروونیدا تەشەنەی سەند. هەستی کرد لەشی، خاوبوونەوەیەکی خۆش خاودەبێتەوەو، حەزی ڕاکشان لەسەر گازی پشت، تەووژمی بۆ دێنێ.

هەڵسا بچووە سەر کەناری کانییەکەو، بەشێنەیی دانیشت. کلاشەکانی داکەندن و قاچی درێژکردن. بە ئەسپایی خستنییە ئاوەکەوە و زۆریش لەسەرخۆ، پشتی نیشاندە سەر زەوییەکەو لێی ڕاکشا. پێڵووەکانی وردەوردە نیشتنە سەریەك. بەدوایدا وردەوردەش، داخزایە باوەشی شیرینخەوی، دوای ماندووبوونی سەفەرێکی سەختەوە.

1978/12/13

# گەلەگورگ



زریان

زۆپاکە جارێکیتریش سووربووبۆوەو، نێڵەنێڵی گەیشتەوە لوتکە. لەوەدانەما خۆیانی لەبەردا رابگرن. بەرودوا لێیکشانەوەو، خۆیانیان لێدوورخستەوە. ئایش چۆوە وێزەی دروومانەکەی. منداڵەکان کەوتنەوە یاریکردن. بارامیش چوو پاڵیدایەوەو قاچی لێراکێشا.

زریان زریان نەبوو بەڵای خوابوو. بەقسەی بارام نا، ئەوەیان هەر هیچ کە بارام بەدرێژایی تەمەنی بیست و شەش ساڵەی، بەبیری نەدەهات لەهیچ زستانێکیتردا زریانێکی وەهای دیبێ، بەڵکوو بەقسەی پیرانی ئاوایی گوایە سیو پێنج ساڵ لەوەبەر، زریانێکیتری لەم بابەتە رووی‌داوەو بۆ ماوەی پازدە رۆژی رەبەق، نەیهێشتوە کەس سەر لەکون بباتەدەر.

ـ هەر چاکە!..ئەمیان لەرۆژی هەشتەمیدا هێندەی بواردا، کە بتوانم بۆ ماوەی سەعاتەوەختێك، سەر لەکون دەربێنم.

بارام لەو سەعاتەوەختەدا، فرسەتی‌هێناو خۆی گەیاندە ئاوایی. پێش لەماڵ بەدەرکەوتن بەئایشی وت:

ـ ئاگاداری منداڵەکانبە..مەیەڵە پێ ببەنە هەیوانەکەوە. هەروەها خۆشت پێ لە هەیوان مەبەرە دەرەوە.

کە کەوتەرێ، زۆر بەزەحمەت هەنگاوی بۆ دەنرا. ئەو توولەرێیەی لەئەنجامی هاتوچۆی خۆیاندا، بۆ ئاوایی دروست بووبوو، بەباڵاپیاوێك بەفر داپۆشرابوو. بەڵام ئەو کە ئەمە رێگای هاتوچۆی هەشت مانگی لەوەبەری‌بوو، لەوە بەدووربوو لەهەنگاونان‌و قاچدانان بەبستبەبستیدا ، هەڵەی تێدابکا. بۆیە زەحمەتیی هەنگاونانەکەی لێنەدەبووە کۆسپێکی ئەوتۆ، کە گەیشتنەئاوایی لەلا بکاتە کارێکی زۆر ستەم.

ئاوایی تەنیا بەدووکەڵی لوولەی زۆپاکانیدا دەزانرا کە ئاواییە،دەنا بەورتەو جووڵەو بەدیمەن، هیچ نیشانەیەکی‌تری پێوە دیارنەبوو.

کە خۆی بەماڵی مامیداکرد، ئامۆژنی سەری لەژوور بۆ دەرهێناو بەپیرییەوە هات. بەڵام کە سەیری‌کرد بەتەنیا خۆیەتی، بەسەرسوڕمانەوە لێی‌پرسی:

ـ ئەی ئایش‌و منداڵەکان؟!.

ئەم خۆی لەسەرسوڕمان‌و تەنگەتاوییەکەی گێل کردو وتی:

ـ لەماڵەوەن.

ـ ئەی بۆ نەتهێنانەوە؟!.

ـ ئامۆژن تۆ قسەی سەیر دەکەیت!..ئەمە رۆژی ئەوەیە؟!.

ـ ئەی ئەمە رۆژی ئەوەیە ئێوە لەو چۆڵەوانییە بمێننەوە؟!.

لەم ساتەدا مامیشی، کە دەنگەدەنگیانی کەوتبوە بەرگوێ، هاتەدەرەوە. ئەویش بەسەرسامییەوە پرسی:

ـ ئەوە چییە؟..چی قەوماوە؟!.

ئەم خێرا لەوەرامیدا وتی:

ـ هیچ نییە مامە..هیچ نەقەوماوە. تەنیا هێندەیە کە نەوتمان نەماوە. منیش فرسەتم هێناوەو هاتووم، کەمێ نەوت ببەم‌و بەپەلە بگەرێمەوە.

مامیشی وەك ئامۆژنی، بەڵام بێتووڕەبوون‌و لەسەرخۆ وتی:

ـ ئێ ئاخر کوڕم..وەك خۆت فرسەتت هێناو هاتیت، دەبوو بەهەر کلۆجێك بوایە، منداڵەکانیشت بهێنایەو لێرە بوونایە، تا ئەم غەزەبە کۆتایی دەهات.

ئەم هیچ وەرامێکی‌تری نەدایەوە. تەنیا هەندێ خۆی تەکاندو لەچاوەڕوانیدا راوەستا. ئەوسا مامی سەیرێکی‌کرد. ویستی قسەیەکی‌تر بکا، کە روانی ئەو رووی وەرگێڕاوەو گوێی بۆ بیستنی قسەی‌تر هەڵنەخستوە، وەرچەرخاو چووەوە ژوورەوە. بەدەمییەوە وتی:

ـ ماتەڵ مەکە..نەوتەکەی بدەرێ با بروا.

بەدوایدا ئامۆژنی بەبێدەنگ، چوو گالۆنێکی پڕ لەنەوتی بۆ هێناو دایە دەستی. ئەم کە لەوساتەدا سەرنجێکی خێرای ئاراستەکرد، گلەیی‌و ناڕەزاییەکی تێکەڵ لە خەفەتباریی لەرووخساریدا خوێندەوە. بەڵام لەسەر پیشەی لەوەبەری، خۆی لێگێل کرد. گالۆنە نەوتەکەی لێوەرگرت. بەپەلە کشایەوەو بەرەوماڵەوە، هەیپێی لێکرد.

گەڕانەوەکەی ئاسانتربوو لەچوونەکەی. راست بەشوێنی دڕپێدانەکەی ئەوسەری بەبەفرەکەداو، بەلۆقە رێگاکەی بڕی. کە گەیشتەوە ماڵەوە، بوارەکە هێشتا بەردەوام بوو. ئایش وتی:

ـ فرسەتە..بۆ ناچیت سەربانەکەش بماڵیتەوە؟.

قسەکەی بەلاوە بەجێبوو. هەشت ڕۆژی ڕەبەق بوو، ڕۆژی سێ جار دەچوو بۆ سەربانماڵین و دەکەوتە زۆرانبازییەکی سەختوستەمەوە. بەڵام ئەمجارەیان فرسەتە. دوای کەمێ خۆگەرمکردنەوە، دەچێ بەڕەحەتوسەحەتی و بێئەو زۆرانبازییە، بەفرەکە دەماڵێ. وەهاشی دەماڵێ کە تۆزقاڵی پێوە نەهێڵێ و تەقەلابدا، لەگوێسوانەکانیشی دوور بخاتەوە.

سەعاتەوەختەکە بۆی بەنرخ بوو. چوو گالۆنێ نەوتی هێناو، چوو سەربانیشی پاکپاك وەك سەری بەگوێزانتاشراو ماڵی. ئەوسا ئیتر هەرهێندەی ئەم پێی نایەوە ژوورەوەو، لەبەرزۆپاکە دانیشت خۆی گەرم بکاتەوەو بحەوێتەوە، زۆری نەبرد زریان وەك بیەوێ تۆڵەی سەعاتەوەختەکە سەدقات بکاتەوە، بەگەردەلوولێکی ئەوتۆ دەستی پێکردەوە، کە دەتووت بەنیازە بەفروبەستەڵەکی هەموو دنیا، دابڕژێنێتە ئەو ناوچەیەوە!. ئایش کە ئەوەی دی، هاواری لێهەڵساو وتی:

ـ بارام..کار وا بڕوا، دارەکەشمان بەزەحمەت بۆ دێتە ژوورەوە. چاکتر وایە چەندمان پێدەکرێ، لەئێستەوە بیهێنینە ژوورەوە.

بارام بەتەواوی نا، نیوەونیوەچڵ ئەم قسەیەشی پەسندکرد. بێئەوەی هیچ بڵێ، چوو سێ باوەشی چاك داری لەهەیوانەوە هێنایە ژوورەوە. ئینجا لەبەرخۆوە وتی:

ـ تۆ بڵێیت وەها قوڕی پێدابدا، کە نەتوانم بچم دارەکەش بهێنمە ژوورەوە؟!..جارێ ئەوەندەمان بەسە.

ئایش زۆر قسەی لەقسەیدا نەدەکرد. دەستی برد چوار پێنج بڕی لێخستنە زۆپاکەوەو، کەوتە خۆشکردنی ئاگرەکەی. زۆپا زۆری پێنەچوو، سەرلەنوێ سووربۆوەو نێڵەنێڵی پێکەوتەوە. لەوەدا نەما خۆیانی لەبەردا ڕابگرن. بەرودوا لێیکشانەوەو خۆیان دوورخستەوە. بارام چوو پاڵیدایەوەو قاچی لێڕاکێشا. جگەرەیەکی ئاگرداو بەپەرۆشەوە کەوتە مژلێدانی.

بارام

(..من پەشیمان نیم..قەت پەشیمان نیم. زریانە زریان نییە چش!. سەختە سەخت نییە چش!. چیمە بەسەریەوە. بۆ من نەزریانەو نەسەخت. من بەلامەوە زۆر ئاساییە. گوایە لەزریانەکەی‌تر سەختترە؟!. هەرگیز نا..قەت نا!. ئەمیان ئەوپەڕەکەی، ئەگەر هەر بەگیری‌هێنایت و کەنەفتی‌کردیت، بەبێمنەت دەتکوژی‌و کۆتاییت پێدێنێ. لەکاتێکدا ئەویان، دەتداتە دەم گەردەلوولێکی ئازارو هەر دەتبات و دەتبات، هەتا پڕ بەدەریایەك ئەشکەنجەت پێدەنۆشێت و ناشتکوژێ!. من پەشیمان نیم. نەك سەختەزریان، بەڵکوو سەختەمردنی دەم کەڵبەی زریانیش پەشیمانم ناکاتەوە. جا بۆچی بیرم بۆ مردن بچێ؟!. گوایە نیازی وایە چەند ڕۆژی‌تر دەوام بکا؟.سێ..پێنج..دەی‌تر؟!. خۆ لەوەزیاتر نابێ؟!. مەگەر بیەوێ تەواو قوڕی پێدابداو بۆی بڕوا بۆ بیست ڕۆژو سی‌و چل ڕۆژی‌تر!. دەنا ئاردە هەمانە. برنج و ساوەرو نیسك و نۆك و ڕۆنە هەمانە. شەکرو چایە هەمانەو نەك بەشی دە ڕۆژ، بەڵکوو کامیان زۆر کەممان ماوە کەشەکرو چایەکەیە، بەشی زیاتر لەسێ دە ڕۆژی دەکا. تەنیا نەوتەکەیە کە زۆرکەمەو ئەویش ئەگەر ئەوەی هەیە تەواوبوو، ئیتر چرا ناسووتێنین و بڕایەوە. خۆ دەتوانم فرسەت بێنم و بچم هەندێکی‌تر بێنم. بەڵام ناچم.. ئیتر ناچم. ئەگەرچی مامم و ئامۆژنم لەگورگە دووپێیەکان نین و، لەدەستەی تاك و تەراکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ڕوویان لێنانێمەوە. یەك جار بەسە. دەترسم ئەگەر کردم بەدووجار، گەرای گورگایەتییەکەیان تێدا بزوێ و بچنەوە ڕیزیان. منیش بکەومەوە تفولەعنەتکردنی خۆم. تفولەعنەتێك کە هەشت مانگە خۆم لێبەدوور گرتوە. من بۆ ئەو یەك جارەش نەدەچووم. ئایش زۆری بۆهێنام. ئەوەی ڕاستی‌بێ زۆرنا.خواهەڵناگرێ ئەو قەت تەقەلا نادا زۆرم بۆبێنێ‌و، ئەم شتم پێ‌بکا یا ئەوم پێ‌نەکا، بەڵکوو دەمهێنێتە ژێربار. قسەکەی بەجێ بوو. هەم فرسەتەکە هەڵکەوتبوو، هەم منداڵەکانیش بەتاریکییەکەی دوێنێ شەو، تەواو تەنگەتاو بووبوون. بگرە تاخەوبردنییەوە بۆمان بوونە دەردیسەری. لەگەڵ ئەوەشدا ئیتر ناچم. خەتا خەتای خۆمەو دەبێ شانی بدەمەبەر. نازانم چۆنم لەبیرچووبوو. خەتای ئایشیشی تێدا بوو. دەبوو ئاگادارم بکا. ئەمە ڕاستە. بەڵام خۆ منیش دەبوایە پرسیارم بکردایە. وایە..من ئەم تەرزە ژیانەم بۆ ئەو هەڵبژاردوە. هەر منیش بەدرێژایی هەشت مانگەکە، ئەوم وەها ڕاهێناوە کە هیچ شتێك لەبیر نەکەم. لەهیچ شتێك غافڵ نەبم، هەموو پێویستییەك لەکاتوساتی خۆیدا جێبەجێی بکەم.ئێ بەڵام تۆ ڕاوەستە..خۆ ئەمە یەکەمجار نییە گرفتی وەهات دێتە پێشدەم؟! هەمووجار چارەسەرێکت هەر دۆزیوەتەوە. ئەمیش هەر وەها دەبێ. وازی لێبێنە بۆ وەختی خۆی. گرنگ ئەوەیە تۆ هەشت مانگی ڕەبەقی پڕاوپڕ لەئاسوودەگیت، بردۆتە سەر. هەشت مانگی دوور لەگورگ و گورگایەتی!.ئا بەڵێ.. لەسەرەتادا کە بەدەم دەمەتەقێوە، لەکۆڕوکۆمەڵدا وەك بیروڕایەك باست لێدەکرد، دەیانووت: بەخەیاڵ شتێکی خۆشە. بەڵام بەکردار قەت ناهێنرێتەدی. وەختێکیش هاتیتە سەر بەکرداربەدیهێنانی ، هەموو وتیان: کابرا تۆ شێت بوویت!. تەنانەت کەسوکاریش و لەپێشیانەوە مامو ئامۆژن، ڕاستوڕاست وتیان: کوڕە تۆ ئەقڵت لەگرێژەنە چووە. ئا وایە!..کەموزیادی نییە..ئەقڵم لەگرێژەنە چووە!. لەبێخەبەران کەشکەك سەڵەوات. من تەنیا هێندە وەرامم بوو، ئەویش لەدڵی خۆمدا. دەنا بەقسە هیچ وەرامێکم نەدایەوە. من لەوسەری هاتبوومەوە. دەمزانی بەبێگرفت و دەردیسەری نابم. بەڵام دەمزانی کە لەجۆرو بابەتێکی‌تر دەبن و، جیاوازییان لەگەڵ ئەوەکانی ناو ئەواندا، ئاسمان و ڕێسمان دەبێ. هەشت مانگی ڕەبەق و ئەمە گرفتی هەرە گەورەو سەختە کە تووشی دەبم. لەوێ بوومایە بەتەنیشتی ماڵی مامەوە دەبووم. هەر پێویستییەکمان ببوایە، بەسەر چەپەرەکەی نێوانماندا دەستم درێژدەکردو وەرم دەگرت. ئەگەرچی دەشیا لەگەڵیدا، سێ گرفتی سەختتر لەجێی بەدەستمەوە بهاتایەو، بئاڵانایەتە مێشکم. ماڵی‌مامم نا..با ئەوانی لێدەرچن. ماڵەکەی تەنیشتی ئەولام..ئەوەکەی ئەولاتر..ئەوەکەی سەرپەڕی ئاوایی!..ئا..دەشیا لەملامەوە دەردێکم چارەسەر بکرێ‌و لەولاوە، سێ دەردم تێبئاڵێنرێ. نا..هەرگیز نا..من..).

گفتوگۆ

ئایش وتی:

ـ چییە ئەوە؟.. خەوت دێ؟!.

بارام ڕاچەنی. سەری بۆ هەڵبڕی‌و سەیرێکی‌کرد. تەنیا لەدەنگەکەی بەئاگاهاتەوە. دەنا نەیدەزانی چیی وتوە. بەدەمییەوە خۆی خستە سەرباری دانیشتن‌و، بێهیچ وەرامدانەوەیەك، سەرنجی لێلاداو خۆی بەتەزبیحەکەیەوە خەریك کرد. ئایش سەرلەنوێ وتی:



ـ ئەگەر خەوت دێ، با جێگات بۆ رابخەم.

ئەوسا تێگەیشت کە قسەکەی پێشوو چی بووە. بۆ ماوەی ساتەوەختێك، لەخۆی کەوتە گومانەوە. وای بۆچوو کە دەبێ خەو بردبێتییەوە. بەڵام کە خێرا سەیرێکی سەعاتەکەی دەستیکردو،چاوێکی بەژوورەکەدا گێڕاو، منداڵکانی بینی وا لەولاوە خەریکی یاریکردنن، بەسەرسوڕمانەوە وتی:

ـ خەو؟..خەوی چی؟!.

ئایش بۆی پێکەنی. باسەکەی گۆڕیو وتی:

ـ هیچ..هیچ!..دەهەڵسە ها..هەڵسە لەپێی بکە بزانم چۆنە؟.

دروومانەکەی دەستی، دەرپێیەك بوو بۆ ئەو. هەر بەدانیشتنەوە لێیوەرگرت. تۆزێك ئەمدیوو ئەودیوی پێکرد. ئینجا بۆی هەڵسایە سەرپێ. بەسەر شەڕواڵەکەیدا، لەکەمەرو ئاستی پشتێنەوە بەقەد خۆیگرت. ئایش وتی:

ـ وانابێ..لەپێی نەکەیت دڵم ئاو ناخواتەوە.

دانیشتەوەو دەرپێکەی خستە لاوە. بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وتی:

ـ جارێ داینێ تادەچم سەربانەکە دەماڵمەوەو، دووسێ باوەشیتریش دار دێنمەژوورەوە، ئینجا ئەوسا..

ـ ئینجا ئەوسا چی؟.

ـ منداڵەکان نوستوونو ئێمەش زۆپاکە ئاگردەدەینەوەو..

ـ ئێ ژوورەکە دەکەینەوە بەحەمامو..

ـ ئێ منیش کورتەكو شەڕواڵو دەرپێی کۆن دادەکەنمو..

ـدەرپێ تازەکەش لەپێ ناکەیتو..وانا؟.

ـ نا..نا.. بۆ تاقیکردنەوە لەپێی دەکەم.

ـ تەنیا بۆتاقیکردنەوە؟... ها؟..

بەدوایدا هەردووکیان باوەشیان بەیەکتردا‌کردو، دایانە قاقای پێکەنینێکی بەکوڵ. منداڵەکان لێیان بەئاگا هاتن. وازیان لەیاریو گەمەی خۆیان هێناو، هاتن خۆیان ئاخنییە باوەشیانەوە. چوار قۆڵی بۆماوەیەکی زۆر یەکتریان بەخۆوە هەڵوشیو، سەرورووخساری یەکتریان ماچ کرد. تا وەختێ لەخۆیان بەئاگا هاتنەوە، هەردوو منداڵ وەك دوو فریشتە خەو بردبوونییەوە. یەکەمجار بارام وریابۆوە. وتی:

ـ نوستوون..هەڵسە جێگەیان بۆ دابخەو بیان گوێزەرەوە.

ئایش راپەڕییە سەرپێ. جێگای ئەوانی راخستو گواستنییەوە شوێنی خۆیان. بەدوایدا جێگای خۆیانیشی راخستو چوو لەسەری پاڵ کەوت. لەگەڵ پاڵکەوتنیدا باوەشی بۆ بارام گرتەوە. ئەویش چوو بەپیرییەوەو باوەشی پێداکرد. دەمی خستە ناو دەمییەوە. ماچێکی مزریکردو هەرزوو هەڵسایەوەو کەوتەوە سەرپێ. خۆی گورج کردەوەو قاپووتە عەسکەریەکەی لەبەرکردەوە. سەرکڵاوەکەی

چەسپاندەوە سەری و، ڕووەو دەرگاکە هەنگاوی نا. بەڵام ئایش ڕاچەنییە سەرپێ و وتی:

— چی دەکەیت؟!.

بارام بەدەم زەردەخەنەیەکی پڕ لەخۆشنوودییەوە وتی:

— سەربان..دەبێ بچم سەربانەکە بماڵمەوەو کە هاتیشمەوە، دووسێ باوەشی‌تر دار بێنمە ژوورەوە.

ئایش دەیزانی سەربانماڵینەکە لەبۆتەی ئەو زریانەدا، چەندە بەئەرك و ئازارە. تەمێکی خەفەتباری نیشتە سەر ڕووخساری. وتی:

— ناکرێ وازی لێبێنیت؟. بیخەرە سبەینێ بەیانی زوو.

— دەکرێ..بەڵام دەترسم خانووەکەمان بەسەردا بتەپێنێ.

— هێجگار وا ؟.

— نازانم.. من بەچاوی خۆم نەمدیوە. بەڵام ئامۆژگاریی باووباپیرانەو ڕێی تێدەچێ.

— بۆ خانووی پەڕپووت و کۆن، نەك ئەمەی ئێمە.

— بەهەرحاڵ..چیم لەکیس دەچێ ؟..

— چۆن چیت لەکیس دەچێ؟!..بۆ من نازانم کە نیوەمردنێکە؟!.

— هێجگار وا ؟.

— نا..یەعنی..

- خەمت نەبێ..نامناسیت؟.

ئەوسا بارام ئیتر بەدەم بزەیەکی گەشەوە، بەرەو دەرگاکە هەنگاوی‌ناو، بەپرتاو دەرپەڕییە دەرەوە.

<u>بۆتەی زریان</u>

هەرهێندەی پێی‌نایە دەرەوە، ڕیزەگوێزانی دەم زریان، بەلێشاو دایان بەتەختی ڕوومەت و ناوچەوان و سەری لووتییداو، کسپەیان لێهەڵساندن. کسپەکە هێندەکتوپڕبوو، کە بۆماوەی ساتەوەختێك لەبەردەرگاکەدا گیریدا. لەو ساتەوەختەدا، قسەکەی ئایش وەك بروسکەیەك بەمێشکیدا ڕابووورد. بەڵام خێرا خۆی وریاکردەوەو کەوتەوە هەنگاونان. هەستی‌کرد توێژاڵێکی تەنکی سەهۆڵ، لەژێر پێیدا خرمەی دێ. لەمە سەرسام بوو. ئەم لەو ڕۆژەوەی زریانەکە دەستی پێکردبوو، هەموو شەو درەنگ یا زوو سەربانی دەماڵی. بەڵام ئەمە یەکەمجاربوو، هەست بەتوێژاڵە سەهۆڵەکە بکا. چونکە هەر لەزووەوە..لەسەرەتای زستانەوە، بەتەختەو دارو نایلۆنێکی ئەستووری قایم، نایلۆنبەندی کردبووکە لەتەنیشتی لای چەپییەوە، دەرگایەکی بچووکی تێخستبوو. سەرەتا وای بۆچوو کە دەبێ بایەکە، پەتی قایمکردنی دەرگاکەی پچڕاندبێ. یا لەشوێنێکەوە نایلۆنەکەی دڕاندبێ‌و، بەفر بەدەم باوە هوروژمی هێنابێتە ناو هەیوان. بەڵام کە چووە پێشترەوە، سەیری‌کرد نەئەویانەو نەئەمیان، بەڵکوو سەختیی زریان گەیشتۆتە ڕادەی گەیاندنی شاڵاوی سەهۆڵبەندانی خۆی، بۆ ناو هەیوانەکەش. ئەوسا لەناکاو بیری بۆ سێ سەر بزن و گوێدرێژەکەیان چوو، کە ئەوانیشی لەسەرەتای زریانەکەوە، لەتەویلە پەڕپووتەکەیانەوە گواستبۆوە بۆ ژوورەکەی بەرامبەریان.

گەڕایەوەدواوەو چوو لەبەردەرگاکەیدا، هەڵوێستێکی بۆکرد. ویستی بیکاتەوەو سەرێك بکێشێتە ژوورەوەو لێیان دڵنیابێ. بەپێویستی نەزانی. وەرچەرخایەوەو لە هەیوان بەدەرکەوت. لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا، تەووژمی گەردەلوولێك شاڵاوی بردە هەیوانەکەوە. بەپەلە دەرگای قایم کردەوە. دەستی‌دایە بەفرماڵەکەو ویستی بەرەوسەربان هەنگاو بنێ و، سووکە حەپەنازێکی بازە گلی‌دایەوە کە لە گچکەکوختەکەیەوە سەری هێنابووە دەرەوەو، دەتووت لەنێوان بەجێهێنانی ئەرکی بەوەفایی و، شاڵاوی بێئامانی زریاندا گیری‌خواردوە. بارام لەویش غافڵ نەبووبوو. لە ڕۆژی دووەمی زریانەکەوە، ئەو کوختە گچکەیەی ڕاست لەودیو نایلۆنبەندەکەوە بۆ دروست کردو، لەڕووی زریانەکەدا بۆی‌کردە سەنگەرێك.

بۆی دانەوییەوەو دانیشتە سەرچۆك. دووسێ جار دەستی سۆزێکی پڕ بەدڵی بەسەریدا هێنا. لەبەرخۆیەوە وتی: دەزانم بەرگەدەگریت و، هێندەت بۆ پاراستنت لە شاڵاوی زریان بەسە. دەنا دەمبردیتە هەیوان. بگرە دەمبردیتە ژوورەوە بۆلای خۆمان. کە هەستایە سەرپێ و کشایەوە، هەستی‌کرد بازە هاتۆتە دەرەوەو دوای کەوتوە. وەرگەڕایەوەو وتی:

— نا..پێویست ناکا..تۆ مەیە..بچۆرەوە کوختەکەت و بەڵام وریابە..ئاگاداربە.

بەدەم قسەکانییەوە، دەستێکی‌تری بەسەریدا هێناو، بەرەودواوە بەهێواشی پاڵی‌پێوەنا. بازە زوو تێگەیشت. کشایەوەو خۆی ئاخنییەوە ناو کوختەکەی و، گوێقوڵاغ نیشتەوە سەرزەوی. ئەمیش پشتی تێکردو بەرەوسەربان ملی‌نا.

بارستایی بەفری سەرزەوی و شاڵاوی گەردەلوولی دەمئاسمان، هەر هەنگاوهەڵهێنانەوەیەکیان لێدەکرد، هەنگاونان بەدەریایەکی قیروزفتدا. بەوباریاندا کە قاچی دادەنا، تا سەرروو پشتێن ڕۆدەچووە خوارەوەو، هەنگاونانی لەلا دەکردە کارێکی زۆر بەئەرك. بەمباریشیاندا گەردەلوولەکە، چوارچاوی دەکردو هێرشی کلووی بەفر، کە بەپێوخول لەهەرچوارلاوە پەلاماری ڕووخساریان دەداو، هەرچۆنێکی وەرچەرخاندایە پێیدا دەچزان، دەیکردە ژیشکێکی واقوڕماو.

سەرجەمی ماوەی نێوان بەرهەیوان و سەربان، لەکاتی ئاساییدا بەگشت پێچوپەناکانییەوە، واتە یەکەمجار شەفتوول بۆ ئاستی دەرگا تەنەکەکەی حەوشەو تەیمانییەکەو، لەوێوە بەرەوژوور تا ئاستی تاشەبەردەکەی پاڵ دیواری ژوورەکەی خۆیان و، ئینجا سووڕانەوە بەتەنیشتیدا تا پشتەوەی سەربان، کە ئەویش لەکاتی ئاساییدا هەروا بالاَپیاوێك بەرزدەبێ، لەسی هەنگاوێك زیاتر نابێ. کەچی بۆتەی زریان لێیکردە سەرکەوتنی کێوێکی هێجگار سەخت.

کاتێ گەیشت تەواو کەسیرە بووبوو. ئەو یەکەمجاری‌بوو، خۆی ئاوەها لەڕووی زریانەکەدا بەکەنەفتی ببینێ. بەفرماڵەکەی بەزەحمەت بۆ بەدەستەوە دەگیرا، چ جایە بەکارهێنان و بەفرپێماڵینی، کە تا سەرئەژنۆی تێدا ڕۆدەچووە خوارەوە. لەناکاو وای زایە مێشکەوە، کە واز لەماڵینی سەربانەکە بێنێ و، خۆی بگەیەنێتەوە کونی ژوورەوە. بەڵام خێرا بەخۆی وت: نامەردت نەکەن!..گوایە لەوە دەترسیت بەلادا بێیت و ڕەق ببیتەوە؟!. شتی وا ناشێ ڕووبدا. دەمێنێتەوە سەر ئازارەکەی..ژانە دڵپرۆینەکەی نووکی پەنجەی دەست و پێ و پۆپەی لووت و پەڕەی گوێچکەو!..ئێ..دەبێ شانی بدەیتەبەر. کەوابێ شانی بدەرەبەرو لەسەری مەوەستە.

لەسەری نەوەستا. مشت و شانوباهووی لەبەفر خستەکار. خەمی ستەمیی بەفرماڵینەکەی لەدڵدا نەما. ترسی کەوتنەخوارەوە بەدیوی حەوشەدا، مێشکی داگیرکرد. ترس لەوەنا گوایە

لەکەوتنەخوارەوەکەیدا ئازاری پێبگا، بەڵکوو لەوەی کە یا دەبوو ئازاری سەرکەوتنەوە بۆ سەربان بچێژێتەوە. یا واز لەسەربانماڵینەکە بێنیٚ.

بەهەرحاڵ سەربانی ماڵیو، ئەوە رووی نەدا. ئەوسا دوا تینوتوانایدایە بەرخۆیو، بەهەمان رێگەی سەرکەوتندا، بەرەوحەوشەو هەیوان خۆی بەکێش کردەوە. لەهەیوانەکەدا دەنگی ئایشی کەوتە بەرگویٚ کە دەیووت:

ـ باش خۆت بتەکێنە، ئینجا وەرەژوورەوە.

<u>شێرەبەفرینە</u>

کە خۆیکرد بەژووردا، بەدیمەن پتر لەشێرەبەفرینەیەك دەچوو وەك لەمرۆڤ!. ئایش لەسەرەتادا لێیبێئاگابوو. خەریك بوو زۆپاکەی بۆئاگردەدایەوە. کە وەرچەرخاو بەو شێوەیەی بینی، خێرا وتی:

ـ نەمووت خۆت..

بەلاٚم خێراش قسەکەی قووت دایەوەو، راچەنییە سەرپیٚ. تیژەسەرنجێکی ساتەوەختییدایەوەو بەرەوڕووی قەڵەمبازدیدا.

بەپەشۆکاوییەوە وتی:

ـ بارام!..چیتە؟!.

تەقەلایدا وەرامێکی بداتەوەو، دەمی گۆی نەدەکرد. تەنیا کزەخەنینەوەیەکی بەڕووداداو، دەستیبەرزکردەوە سەرکلاٚوەکە لەسەری بکاتەوەو، ئایش نەیهێشت. لەپاڵ دەرگاکەدا داینیشاندە سەرزەوی. سەرکلاٚوەکەی لەسەری لادا. پاڵتۆکەی لەبەر داکەند. پێلاٚوەکانیشی لەهەردوو پێی هەڵپچڕینو، خستنییە پەنادەرگاکەوە. ئەوسا هەڵیساندە سەرپیٚو، بردی بەرامبەر زۆپاکە داینیشاندو، پاڵی بەدیوارەکەوە پێدایەوە. ئینجا رایکردەوە بەلای زۆپاکەوە. کە سەیریکرد زۆپا ئاسایی ئاگری خۆش بۆتەوە، وازی لێهێناو چۆوە بەلای بارامەوە. سەرنجیدا چەندین تنۆکە ئاو، نیشتوونەتە سەر ناوچەوانو بڕۆو برژانگەکانیو، بەڕوومەتو لاجانگیدا رۆدەچنە خوارەوە. هەرزوو زانی قەتماغەی بەفرە..سەهۆڵەو دەتوێتەوە. پەلاماریدایە خاولییەكو کەوتە سڕینی دەموچاوی. بەدەمییەوە سەرنجیدا پێڵووەکانی، دەنیشنە سەریەكو چاوانی دەنووقێن. خورپەی ترسێکی لەناکاو دای لەدڵی. بەقورگی پڕ لە گریانێکی تاساوەوە هاواریکرد:



ـ بارام..بارام گیان..چ خێرتە؟!.

لەهاوارەکەی بەئاگابوو. تینیدایە بەرخۆیو هەردوو چاوی، بەزۆر زەق کردنەوە. بەزۆریش خۆی قیت کردەوەو دانیشت. بەلاٚم چەندە تەقەلایدا بەزمان وەرامی بداتەوە، لەبڵمەبڵمێك بەولاوە هیچیتری بۆ دەرنەبڕدرا. ناچار ئەمجاریش تەنیا، بەکزەخنینەوەیەك وەرامیدایەوەو، کەوتەوە سەر باری پاڵدانەوە.

ئایش کەوتە خۆی. پشتێنەکەی لەکەمەریکردەوە. پووزەوانەو گۆرەوییەکانی لە پیٚ داماڵینو رانکی لێداکەند، کە دەتووت لەئاو هەڵکێشراون. چوو لێفەو بەتانییەکەیانی هێنانە پێشەوە. ویستی بیان دا بەسەریداو لەدەرپێکەی بەئاگاهات. ئەویش تا سەر ئەژنۆ لەئاو هەڵکێشرابوو. ئەویشی لێداماڵیو فڕێیدایە لاتەنیشت. بەتانیو لێفەکەی بەسەردادا. وازی لەو هێناو چۆوە بەلای زۆپاکەوە. زۆپا کەوتبۆوە نێڵەنێڵ . لەوەدابوو وەرچەرخێتو بچێتەوە بەلای بارامەوەو، پاڵتۆو سەرکلاٚوو پێلاٚوەکانی کەوتنەوە بەرچاو. گچکە جۆگەلە ئاوێکیان، بۆ ناو ژوورەکە لێبەرەوخوار دەبۆوە. چوو پڕی پێداکردنو، هاویشتنییە سەر دارەکان. ئینجا وەرگەڕایەوەو، خۆی گەیاندە پاڵ بارام، کە ئەوساتە لەوەدابوو زمانی بکەوێتەوەگۆ. پچڕپچڕ وتی:

ـ لە زۆپاکەم دووربخەرەوە!.

جێگەکەی بۆ دووسیٚ شەقاو دوور لەزۆپاکە گواستەوە. باش داپۆشیو بەدیارییەوە دانیشت. ماوەیەك لەسەر ئەوبارە تێیڕوانی. دوایی نوشتایەوە بەسەریداو، روومەتی نا بەڕوومەتییەوە. روومەت رووی لەگەرمبوونەوە کردبوو. دڵی پێیحەوایەوە. بۆ زیاتر حەوانەوەی دڵ، قاچی درێژکردنە ناو جێگاکەوەو نووساندنی بەقاچییەوە. قاچ وەکوو

ڕوومەت نەبوو. هێشتا دەتووت پارچە سەهۆڵن. بنی پێی بەخشاندن بەپووزو ڕانیدا سەرخست. ئەوانیش هێشتا دەتووت سەهۆڵن. ئەوسا دەستیبرد دەرپێی لەلەشی خۆی داماڵیو، فڕێیدایە لاوە. کراسیشی هەتا سەرسنگ هەڵماڵی. چووە ناو جێگاکەوەو، توند خۆی تێوە ئالاند. هەستیدەکرد وا هەر تۆزقاڵێکی لەشی بارام، وەك دەمەگوێزان بەلەشیدا دەچزێ. بەلآم بەخۆشنوودییەوە خۆی لەبەر ئەو چزەی ئازارەدا ڕادەگرتو، پێیگەشکەدار دەبوو.

ئایش

( وتم مەچۆ..وتم وازی لێبێنە بۆ سبەینێ، بەقسەی نەکردم. چیلێبکەم!.. سەرسەختییەکەی لەوەدا نییە. کە قسەیەکیکرد ئیتر هەر ئەوەیەو، هەردەبێ بیباتەسەر. لەگەڵداوتنی بێسوودە. ئەو ئێوارەیە کەهاتەوەو وتی:

- بکەوەرە پێچانەوەی کەلوپەلەکان!..

ورتەم لەدەمم نەهێنایە دەرەوەو، چۆنی داواکرد وام کرد. تەنیا هێندەم لە دەسەڵاتدابوو، بچم باوکمی لێهان بدەم کە هەوڵێکیتری لەگەڵدابدا. باوکم وتی:

- هەرچەندە دەزانم سوودی نییەو قسەکەم دەدۆڕێنم، بەلآم لەبەرخاتری تۆ دەیکەم.

خۆ من خۆشم دەمزانی سوودی نییە. ئەو لەمانگێك لەوەبەرەوە، دەستیکردبووە دروستکردنی خانووەکەو، لەوماوەیەدا باوکمو دایکمو هەرچی دۆستو ناسیاوان هەن، تیایدا کولوکافربوونو هەر کۆڵینەداو پاشگەز نەبۆوە. ئێ چی بکەم؟!..وتم بەڵکوو ئەم دواجارلەگەڵداوتنە کاری تێبکا. کەچی هیچ. بگرە لەوەرامی باوکمدا تەنیا وتی:

- مامەگیان..من پڕ بەدڵ تۆم خۆش دەوێ، حەزدەکەم ئامۆژگاریت بگرمە گوێ. زۆر بەتەنگەوەم دڵت لێم نەیەشێو، لێم عاجز نەبیت. بەلآم تکات لێدەکەم لەم مەسەلەیەدا، لێم ببوورە کە ناتوانم بەقسەت بکەمو لەبڕیارەکەم پەشیمان ببمەوە. ئەمەیان باسێکەو لەدەمێکەوە، بڕیارم لێداوەو وا ئێستا دەیبەمەسەر.

باوکم لەزووەوە تێگەیشتبوو، کە نیازی چییەو چی دەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا دوا تەقەلایدا بەگیری بێنێو بیبەستێتەوە. لەوەرامی ئەو قسانەیدا وتی:

- چاکە..زۆر چاکە..بەلآم با من پرسیارێکت لێبکەم!..

باوکم بەدوایدا خۆی بێدەنگ کرد. ئەو بەپەرۆشەوەبوو بزانێ پرسیارەکە چییە. خێرا وتی:

- فەرموو..فەرموو مامە..زۆر حەزدەکەم بیزانم.

باوکم وتی:

- ئایا تۆ هیچ بیرت بەلای ئەوەدا نەچووە، کە مەسەلەکەت پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەسێ ئادەمیزادی تڕەوە..بەدوو منداڵی ساواو ژنێکەوە هەیە، کە وەك ژنومنداڵی تۆن، کچو کچەزای منیشن؟!.

بارام لەئاستی پرسیارەکەدا خامۆش بوو. دوایی سەری بەرزکردەوەو ڕوانییە منو منداڵەکان. ئینجا سەیرێکی باوکمیکردو، سەرلەنوێ خامۆش بۆوە. من لەلای خۆمەوە دڵم بۆی گوشراو تەنگەتاو بووم. سەرنجێکی پڕ لەپاڕانەوەم لەباوکم گیرکرد. باوکم زوو تێگەیشت. هەڵسایە سەرپێو ویستی، بێوەرگرتنی وەرامی پرسیارەکەی، جێیبێڵێو بڕوا. ئەو لێیبەئاگاهات. لەگەڵیدا هەڵسایە سەرپێ. بەدەنگێکی پڕ لە خەفەتبارییەوە وتی:

- مامە..ئەگەر تۆ وات پێباشە کە ئەمان..

باوکم نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا. وتی:

- نا..ئەوەم پێباش نییە. تەواو..بڕیمانەوە..بڕۆ خوات لەپشت بێ. تەنیا ئاگات لێیان بێو بەسات لێیان غافڵ مەبە.

من قسەکەی باوکمم پێخۆش بوو. لەوساتەدا ترسی ئەوەم لێنیشتبوو بڵێ: ( ئا..وام پێباشە ئایشو منداڵەکان لێرە جێبێڵێتو، خۆت بەتەنیا بچیتە خەڵوەتە نەگریسەکەتەوە). نەیکرد..شوکور ئەو قسەیەی نەکردو بۆ ڕۆژی دوایی، گواستمانەوە بۆ ئێرە. ئێ بەڕاست ناخۆشییەکەی لەکوێدابوو؟!. ئەشەدوبیللا هیچ!.. ئەم شەش حەوت ڕۆژەی لێدەرچێ کە زریانە پیسەکە تۆزێ هەراسانی کردووین، دەنا ئیتر دەتووت لەبەهەشتێکداین. بەدرێژایی ئەو هەشت مانگی پێشووە لەچیمان کەم بووە؟!. ژیانێکی بێقرەوبڕەو بێگێچەڵو سەریەشە. نەکەس هەقی بەسەرمانەوە بووەو، نەئێمەش بەسەر کەسەوە. هەروەختێکیش بیری دایكو باوكو کەسوکارم کردبێ، هەمووی چارەکەسەعاتێك ڕێگایەو، بەئاسانی لەگەڵ منداڵەکاندا چووموو هاتوومەتەوە. بۆیە منیش زوو تێگەیشتم بارام چی دەویستو بەئاواتی چییەوەبوو. تا وای لێهات کە من هاتنەکەم بۆ ئێرە لەو پێخۆشتربێ. ئێستەش با زریانی بەفرو باوبۆران نەبێ، زریانی خڕکەبەردو کوچكو کەڵەك بێ. خۆ تا ساڵی تەقیانووس دەوام ناکا. وا شەش حەوت ڕۆژیتەرو بگرە وا دوو ئەوەندەیتریش دەوامیکرد. لە هیچمان کەم نییە. هەموو شتێکمان هەیەو خۆشمان ئاخنیوەتە ژوورەوەو، سەری لێنابەینە دەرەوە تا بەسەردەچێ. بۆمن ئاوهێنانەکەو بۆئەو بەفرماڵینەکە، تۆزێ بەئەركو ئازارە. دەنا خوا دەیکرد بەردی دەباراند. خۆزگە کانییەکەم کەمێ لێنزیکتر دەبوو. با لەوێدا نەبوایەو هەروا دەپانزە هەنگاوێك سەرووتربوایە. خۆ کفر نەدەبوو.ئەوسا بەئاسانی بەجۆگەلەیەك، ئاوەکەی بۆ دەگەیاندمە ناو حەوشەکە. ئێستا دەبێ چل پەنجا هەنگاو بۆی بڕۆم. هەرچەندە ئەگەر ئەم زریانە نەگریسە نەبێ، چل پەنجا هەنگاو هیچ نییە. خۆ بۆ ئەمیشیان زوو وتی:

- تۆ ئەم هاتوچۆیەی سەرکانی لەخۆڕایی دەکەیت. ئەوە بەفرێکی زۆرو بیتوێنەرەوەو ئاوەکەی بەکاربێنە. قسەکەی لەهەوەڵەوە نەدەچوو بەگوێمدا. کە زریانەکە درێژەی کێشا، ئینجا ناچاربووم وا بکەم. ئەویش بۆ خواردنەوە نا. بۆ خواردنەوە تامی خۆش نییەو، هەردەبێ بچم ئاوی کانییەکە بێنم. ئێ ئەوەش ڕۆژی یەك جار چوونی زیاتر پێناوێ. گوایە خۆ..).

شەوچەرە

بارام لەژێر جێگاکەوە، جەستەی بەرەوژوور هەڵکشاندو، خۆی خستە سەرباری دانیشتنو، پاڵیدایەوە. ئایشیش لەگەڵیدا بەئاگاهاتەوەو وەك ئەویکرد. بەدەمییەوە وتی:

- گەرمت بۆوە؟.

- زۆرباش..دەڵێیت قەت من ئەو بارامە نەبووم.

- پێم نەووتیت وازیلێبێنە بۆ سبەینێ؟. من دەمزانی کە لەوەدا نەماوە، سەر لەژوور بریتەدەرەوە.

- بۆ گوایە من نەمدەزانی؟!. من خۆشم هەر کە پێم نایە ئەودیو هەیوانەوە، هەستم کرد جیاوازیی لەگەڵ جارەکانیتردا زۆرە.

ـــ دەبوو وازت بهێنایەو بگەڕایتایەوە ژوورەوە.

ـــ نەدەبوو..ئەوەم لەمنداڵییەوە لەمێشک چەسپیوەو بڕایەوە. دەترسام خانووەکەمان بەسەردا بتەپێ!.

ئایش بێدەنگ بوو. تەنیا قاچ و قۆڵی لێئالاندەوە. سەری نیشاندە سەرسنگی و خۆی خامۆش کرد. بارام دوای ماوەیەک بێدەنگی وتی:

ـــ ئەم جارەیان هیچ..دەترسم ناچار ببم لەنیوەشەویشدا بچم بیماڵمەوە.

ـــ ناچیت..دەڕووخێ بەسەرماندا نارووخێ قیروسیا. ناچیت و پێ لەژوور نابەیتە دەرەوە.

ئایش قسەکانی بەتووڕەییەکی تێکەڵ لەهەڕەشەوەکرد. ئەو ناچار بۆی پێکەنی. دەستێکی پڕ لەسۆزو خۆشەویستیی بەسەریداهێنا. ناوچەوان و دەمولێوی ماچ کردو وتی:

ـــ ناچم..بابە ناچم و قیروسیا. چی دەبێ بابێ.

بەدوایدا خۆی لەژێر جێگە دەرکێشایە دەرەوە. هەڵسایە سەرپێ و چوو بەلای زۆپاکەوە. ئاگرەکەی کزبووبوەوە. وەرچەرخا بەلای دارەکاندا. سەیریکرد کەم بوونەتەوە. وازی لەزۆپاکە هێنا. چوو دەرپێکەی لەپێکردەوە. کەمێ خۆی گورج کردەوەو وتی:

ـــ دەچم هەندێ دار دێنمە ژوورەوە. تۆش زۆپاکە ئاگر بدە.

ئەو چوو بۆ دارهێنان. ئایشیش راپەڕییە سەرپێ و، چوو بەلای ئاگردانەوەی زۆپاکەوە. لەهێنانەژوورەوەی باوەشی چوارەمدا، ئایش وتی:

ـ بەسە.

بارام وەک گوێی لەقسەکە نەبووبێ، دەرفرتایەوە دەرەوەو چوو، باوەشێکیتریشی هێنا. ئەوی داناو وەرچەرخا بچێتەوەو، ئایش هاواری لێکردەوە:

ـ بەسە..چی دەکەیت؟!.

ئەوسا ئاوڕێکیلێدایەوە. بەدەم زەردەخەنەیەکەوە تەنیا وتی:

ـ بەس نییە..با یەکژەمیبێ.

ئیتر بەپرتاو چووە دەرەوە.

وەختێک دووقۆڵی بەرامبەر یەکتر دانیشتنەوە، زۆپا کەوتبۆوە نێڵەنێڵ و سووچی بنەوەی لای دەرگاکەش، بەبرەدار قەڵاپەچن بووبوو. بارام بەخۆشنوودییەوە وتی:

ـ شەوچەرەیەک ئێستا یەکاویەکە. سوودی تۆیشیتێدا دەبێ!.

ئایش تریقایەوە. بەگەشکەدارییەوە شەوچەرەی هێناو خستییە بەردەمی. قاپێکی پڕبوو لەمێوژوگوێزوبادەم. دووقۆڵی نیشتنەسەری. بارام بەدەمییەوە سەیرێکی منداڵەکانیکرد. وتی:

ـ بەشت دان؟.

ئایش وتی:

ـ نەوەڵڵا..هۆشم لەلای تۆبوو. من لەبیرم چوو بیاندەمێ و، خۆشیان داوایان نەکرد. دەزانیت سێ جار هاتمەدەرەوەو، سەرم لەدەرگای هەیوان کێشایە دەرەوە؟. ئیتر کە لەخشەخشی بەفر ماڵینەکەت دڵنیادەبووم دەگەڕامەوە ژوورەوە.

ـ دەترسایت؟.

ـ زۆر..

ـــ لەچی؟..لەوەی نەوەکوو گورگ خواردبێتمی؟!.

ـ ئا..بەڵام گورگی سەرما. ناهەقم نەبوو، زۆرت پێچوو. خۆ کە خۆم یەکەمجار سەرم کێشایە دەرەوەو، ئەو گورگە هارە دووسێ گازو نوقورچی لەدەموچاوم گرت، تەواو بۆ تۆترسم لێنیشت.

ـ جا بەڕاستی خۆشم وردەوردە ترسی ئەوەم لێنیشت، کە وام لێبێ رەق هەڵبێم و نەتوانم، خۆم بگەیەنمەوە ژوورەوەو، تۆش هەر چاوەڕوانی گەڕانەوەم بکەیت.

ئایش بەنیمچە گاڵتەو گازندەیەکەوە وتی:

ـ ئێ..ئێ..باشە..یانی وەهات خستبووە دڵەوە، کە من لێت ناپرسمەوەو گوێت نادەمێ؟!.

بارام باوەشیپێداکردو دەستیکردە ملی. بەپێکەنینەوە وتی:

ـ حاشا..حاشا..مەبەستم ئەوە نەبوو..بۆ وەهای لێکدەدەیتەوە؟!

ئایش خوی بۆ باوەش پێداکردنەکە شل کرد. ئەمیش بەپێکەنینەوە وتی:

ـ گاڵتەت لەگەڵدا دەکەم. بەڵام بەڕاستی جاری سێیەمیان، خەریک بووم بێم بەزۆر بتهێنمە خوارەوە.

شەوچەرە خورا. بارام سەیرێکی سەعاتەکەی دەستیکرد. کات خۆیدابوو لەیازدە. ئاوڕێکی لەمنداڵەکان دایەوە. لەشیرینخەوی خۆیاندا بوون. چوو بەلایانەوە. کەمێ لێیان وردبۆوە. لەبەرخۆیەوە وتی:

ـــ ئاگایان لەهیچ نییەو هەقیان بەسەر هیچەوە نییە. خوا دەیکرد دنیا سەرەوژێر دەبوو. هەقیان چییە؟!.

ئایش لەولاوە هەڵیدایە. ئەویش وەک بۆ خۆی بدوێ، وتی:

ـ خۆزگەم بەخۆیان.

بارام سەری نوشتاندەوە بەسەریاندا. بەسۆزەوە هەردووکیانی ماچ کرد. وازی لەوان هێناو هاتەوە بەلای ئایشەوە. باوەشی پێداکردەوەو وتی:

ـــ دڵ لەدڵ مەدە..نیمچە بەهەشتێکت بەدەوردا بۆ دروست دەکەم. ئەوەی هەتا ئێستا کردوومە جارێ تەنیا بناغەکەیەتی. خۆم دەزانم چیم لەمێشکدایەو، چۆنیشی جێبەجێ دەکەم. با زستانەکەمان لێبەسەر بچێ، ئینجا دەبینیت چۆن پووزوبازووی لێدەخەمەکار. خەونە دێرینەکەمەو بەدیم هێناوە.

خەون

(..کانیئاوێک و لەبن دارگوێزێکەوە هەڵبقوڵێ. لەبەرەوژووریدا پانایییەک بێ و، جێگەی خانوویەکی فراوانی تێدا ببێتەوە. حەوشەکەی وەهابێ بکرێتە باخچەیەکی قەشەنگی رازاوە، هەم بەگوڵ و گوڵزارو هەم بەداروردەختی بەردار. وەهابێ کە پێویستیم بەوە نەبێ، یەک دەنک هەڵووژە یا قەیسی یا سێو یا هەر میوەیەکیتری باخەکانی ئاوایی، بێتە ناو ماڵمەوە. ئینجا لەبەرەوخواریدا، تەنیا یەک دۆنم زەویی بەپیت بێ و ئاوی کانییەکەی، بەڕاست و چەپدا بەسەردا بگەڕێ..بڕایبڕ پێویستیم بەوە نەبێ، کە لەبامێ و باینجان و کوولەکەو تەماتەو ترۆزی و خەیاری بێستانەکەی خۆم بەولاوە، هی بێستانی هیچ کەسێکیتر، توخنی ناو ماڵم بکەوێ. هەروەها بەرەوخوارتر، لەملایەوەبێ یا ئەولا، هەروا تەنیا سێچل دۆنمێک زەویی دێمەکارم هەبێ، تا هێندەی بۆساڵێکی خۆمان پێویست بێ، گەنم و جۆو نیسک و نۆک و ماشی لێهەڵبگرم و، زیادەکەشی بۆفرۆشتن بێ. یاچاکتروایە بڵێم بۆگۆڕینەوەی بەشەکرو چاو قوماش و، بۆ پێویستییەکانیتری ژیان. دیارە بۆشیرو ماست و پەنیرەکەش، پێنج شەش سەرێک مەڕو بزنم دەبێ و، لەسنوورە

پانوبەرینەکەی مەملەکەتەکەمدا، تێروتەسەلتر لەهی هەر کەسێکیتر، بۆ خۆیان دەلەوەڕێن. بەڵام بەڕاست مەملەکەتەکەم شوورەداربێ چاکترە یا بێشوورە؟. یانی بیەڵم بێگانە پێیتێبنێ یا نەیەڵم؟. دیارە من خۆم مەگەر بەناچاری، بۆکڕین و فرۆشتن بەیناوبەینێك ڕێگام بکەوێتە ئاوایی، دەنا قەت ناچم. من خۆم وەها..ئەی ئەگەر ڕێبوارێك بەلای مەملەکەتەکەمدا تێبپەڕێ؟!. ئەمیان چۆن دەبێ؟!. دەکرێ قەدەغەی بکەم؟. ستەمە!. دەکرێ کە هاتە بەردەرگای ماڵەکەم و وتی: سەلاموعەلەیك، من بڵێم: نەعەلەیکەسەلام و بڕۆ وەلبە؟!. هەر هێجگار ستەمە. بەو بارەدا من دەبمە کێوی و جانەوەرو ئەوان مرۆڤ. نایکەم..ئەمەیان ناکەم..دەڵێم عەلەیکەسەلام و سەرچاوان هاتیت و فەرموو گەورەمان بکە. ئیتر ئاسایی ئەرکی سەرشانمی بەرامبەر بەجێدێنم و بەدوایدا، خواحافیزو بەخێر بچێت. خۆئەمە هەموو ڕۆژو وەختوسەعاتێك ڕوونادا. کە ڕووشیدا، ئەوە باجێکەو دەبێ بیدەم و بەناچاری دەیدەم. ئەی ئاخر..ئاخر تۆ ڕاوەستە!..ئەی ئەگەر بێتامیان کرد. ئەی ئەگەر سەیریان کرد وا تۆ بەهەشتێکت بۆخۆت دروست کردوەو، دەنگوباسی بەناوچەکەدا بڵاوبۆوەو خەڵکێکی بێشومار، بەنیازی هەروا بۆسەعاتەوەختێك دوورکەوتنەوە لەدۆزەخەکەی خۆیان و، حەوانەوە لە بەهەشتەکەی تۆدا، ڕۆژانە کەوتنە ڕێچکەبەستن بۆ لات چی دەکەیت؟!. دیارە هیچ..ڕیسەکەت لێدەبێتەوە بەخوری و، بەهەشتەکەت دەبێتەوە بەدۆزەخ و، ئاو بێنەو دەست بشۆ!. دەکەوابوو دەبێ هیچ بەلامەوە ستەم نەبێ، کە بڵێم نەعەلەیکەسەلام.ئا..وای لێدەکەم. نایەڵم کەس پێ بنێتە ناو مەملەکەتەکەمەوە. شوورەیەکی بۆدەکەم. شوورەیەکی لەبابەتی شوورەی کۆنەقەڵاکانی، بەدەوردا بۆ دروست دەکەم. من دەمەوێ نەیەڵم، میکرۆبی کوشتوبڕو دزی و درۆزنی و فرتوفێڵ و زۆرو جەور، لەمەملەکەتەکەمدا گەرا بکا. من لەتاو ئەو کاروکردارانەیان هەڵدێم و، بەخۆم و ماڵومنداڵمەوە گۆشەگیردەبم. ئیتر چۆن بیەڵم بەو هەموو میکرۆبانەیانەوە کە لەژمارە نایەت، پێ بنێنە مەملەکەتەکەمەوە؟!. کەی ئەوە کاری کردەیە، من لەبەرئەوەی گوایە عەیبە بڵێم نەعەلەیکەسەلام و بڕۆ بەڕێی خۆتەوە، بەهەشتێك بکەمەوە بەدۆزەخ؟!. بۆچی ئەوان کۆ لەعەیبە دەکەنەوە تا من بیکەم؟!. کامیان لەپیاوچاکیدا شایەکەیانە، ڕۆژی سەدویەك عەیبەی لێدەوەشێتەوەو، کەچی شەو کە سەر دەکاتە سەر سەرین، دەڵێیت نەبای دیوە نەباران. کامیان لەپیاوچاکیدا شایەکەیانە، لەگەڵ هەر هەناسەیەکیدا لالەوێچێك خراپەکاری هەڵدەمژێ و، لالەوێچێکی لێفەڕێ دەداتەوە دەرەوە. یانی من بیەڵم بێت و، لەمسەرەوە هەوا پاکە بێگەردەکەی مەملەکەتەکەم هەڵمژێ و، لەوسەرەوە دوو هۆقە میکرۆبی خراپەکاریم بۆ دەربفرتێنێتە دەرەوە؟!. نا..هەرگیز نا..ئەمە بۆ وەختی خۆی، بڕیارێکی بڕاوبڕ دەبێ و وازلێهێنانی بۆ نابێ.... ).

بارام

(.. ڕاستە وەهام بەدی نەهێناوە وەك لەمێشکمدا بوو. کانیوئاوەکە لە بندارگوێزدا نییەو، لەقوڵتێکی ڕووتو قووتدایە. ڕەنجی فەرهادم لەگەڵدادا، تا کردمە بلبلەکەی مەلای مەزبوورە. خانووەکە کۆشکە فراوانەکە نییەو، دوو هۆدەو هەیوانێکی قوڕینی تەنگەبەرە. حەوشەکەشی ڕازاوە نییە، بەگوڵوگوڵزارو داروددرەختی بەردارو، تەنیا هێندەی جێخەرمانێکەو تەیمانێکی پڕ لەدەلاقەی بەدەوردایە. دۆنمە بەڕاوەکەی خوارووی کانییەکە، سێیەکە دۆنمێکەو سیچلە دێمەکارەکەش، هاتە سەر تەنیا دە دۆنم. نەخێر نا..خەتا لەمامەوە نەبوو. ئەو خوا هەڵناگرێ وتی: کوێت پێباشە بچۆ بەئارەزووی خۆت هەڵیبژێرە. لەوەی هەمانە کامی بەدڵی تۆیە، دەستی بخەرە سەرو من بڵێم بەسەرچاو. ئەو وای وت و من خۆم ئێرەم هەڵبژارد. بەڵام دەڵێیت چی کە لەوەزیاتری بەبەرەوە نییە. تەقەلام دا لەگەڵ کوڕانی مام وسوودا بەکانی مامزانی بگۆڕمەوە. تەنیا ئەوێ هەیە لێرە باشتربێ بۆ من. بێسوودبوو . نەیان کرد. تەنیا وەیسەیان تێم دەگەیشت چیم دەوێ و ئەو وتی: بابە من بەهەر دەپەنجە بۆتی مۆردەکەم و، زۆریش پێخۆشحاڵ دەبم. هەوڵێکی زۆریشی بۆدام براکانیم بۆ قایل بکاو، قایل نەبوون. قسەی خۆمان بێ ئەویش لەمرۆڤە دەگمەنەکانە. لەمنداڵییەوە دەیناسم. بەدرێژایی خوێندنمان و هەتا ئامادەیی کشتوکاڵیمان تەواوکرد، هەر پێکەوەبووین. لەبەوەفاییدا بۆ برادەرێتی بێهاوتایە. یادت بەخێر وەیسە..دەتووت و هەر دەتووتەوە گوایە ئەوەی دەیڵێم خەیاڵێکی ڕووتەو هیچ کەس ناتوانێ بەکردار بیهێنێتەدی. لەسەرەتادا زۆر بەسادەیی وەرامت دەدامەوەو، هەردەم من تۆم بەگێردەهێنا. تەنانەت جاروبار وات لێدەهات ئەوەی دەمووت، بەئاسانی بۆمی مۆربکەیت. کەچی کەکەوتیتە داوی سیاسەتەوە، ئیتر نەعووزوبیللا!..لێم بوویتە فەیلەسووفێك و، بەچەشنێ فێری ڕاوڕێویهێنانەوە بوویت، کە ئینجا تۆ من بەگێربێنیت. منیش ناچار پشتم بەتەنیا ڕازە مەزنەکەی ناودڵم..ئاگرە سوورەکەی ناو دەروونم دەبەست، کە لەئاستیدا هیچت بۆنەدەکراو هەڵدەهاتیت. وەیسە یادت بەخێر..تۆ ئێستا کادرێکی حیزبایەتیت و، تا بینەقاقات نوقمی سیاسەتە. منیش گۆشەگیرێکی هەڵاتوو لەو کۆمەڵەی، کە تۆدەتەوێ گوایە بەسیاسەت چاکی بکەیت!. لەمرۆڤە دەگمەنەکانیت و بەوەی باش بوو تۆ نەك یەکێکیتر، یەکەم کەس بوویت ڕێت کەوتە مەملەکەتەکەمەوە. تۆ ناچارت کردم ..نا باشتر وایە بڵێم تۆقایلت کردم، کە لەبڕیارەکەم پاشگەز ببمەوەو بیگۆڕم. تۆ بوویتە یەکەم کەس و هاتیت وتت: سەلاموعەلەیك. ئەوساتە بۆ من گەلێ ستەم و سەخت بوو. زەمانی ناودەمم و زەمانی ناودڵمت، خستە بەرزۆرانبازییەکی گەلێ توندوتیژەوە.من وەرامم بۆ نەدرایەوە. تۆ بەدەم بزەیەکی شەیتانانەوە، زۆرانبازییەکەت بەئەنجام گەیاند. وتت: یەکێکیان بڵێ..یا عەلەیکەسەلام و دادەنیشم. یا نەعەلەیکەسەلام و پاشەوپاش دەگەڕێمەوە. کورە هەی وەیسەی ئیبلیس!..ئەم وتەی عەلەیکەسەلام و نەعەلەیکەسەلامەی خەونەکەمت، چۆن لەبیرمابوو. یا کە تۆ دەتزانی ئەوە بڕیارێك بوو دابووم، ئیتر چۆن هاتیت؟!. بەڵام نا نا..ئیبلیسیت.. بەتایبەتی لەو وەختەوەی دەستت دایە سیاسەت. سوور دەتزانی چ وەرامێکی تۆ دەدەمەوە. گوایە بەتۆ بڵێم نەعەلەیکەسەلام و بڕۆ وەلبە؟!. وەیسە..قسەی خۆمان بێ زۆر حەزدەکەم، زووزوو سەر لەمەملەکەتەکەم بدەیت و، دانیشین پێکەوە دوو قسەبکەین. قسەکانی تۆم بەدڵن و حەز بەبیستنیان دەکەم.

من ئەو جارە تەنیا هێندەت لێحاڵیبووم کە هاتیت وتت: پیرۆزباییت لێدەکەم و کە ڕۆیشتیت وتت: بزانم چۆنی دەبەیتەسەر!. بۆ گوایە

واتدەزانی نایبەمەسەر؟!. خۆ زۆر زۆرم پێخۆشە ئێستا..هەر ئێستا گوێم لەتەپەتەپی پێت بێ و هاوارت ببیستم بڵێیت: هۆ هۆ بارامە خەیاڵوییەکە..دەرگام لێبکەرەوە..ئەوە منی برادەرە دێرینەکەتو هاتوومەتە دیدەنیت..هاتووم جارێکی تر، لەخەیاڵە پڕ سەیروسەمەرەکەت بدوێین. بەڵام وەیسە کوایت؟!. چیدەتگەیەنێتە ئێرە؟!. مەگەر حیزبەکەت فەرمانت پێبدا. ئەمەیان دەبێ. فەرمانی حیزب لەلای ئێوەومانان ڕەتکردنەوەی بۆنییە. سەیرە!..کە دەڵێ بمرن دەمرن!..وەڵلاهی سەیرە!.نا..نا..زۆریش سەیر نییە. ئەی ئەوە نییە منیش حیزبێکم هەیە؟!. ئەوە نییە حوکمی مەملەکەتێکیشی پێدەکەم. یا ....).



بازە

ـ بارام..بارام..نوستوویت؟.

ـ ها!..من!..نا..

ـ گوێت لێیە؟!..بازە..

بارام تەواو بەئاگاهاتەوە. دەستی لەئایش بەرداو قیت بۆوە. بازە بەوپەڕی حیرس و توورەییەوە دەوەڕی.

ـ لەخۆڕایی نییە!..شتێکی بەدی کردوە.

ئەمەی وت و ڕاپەڕییە سەرپێ. خۆی گورج کردەوەو پەلاماری پاڵتۆکەی‌داو لەبەری‌کرد. جامانەکەی لەسەروملییەوە پێچاو، بەرەودەرگا قەڵەمبازدی‌دا. پێش ئەوەی دەست بۆدەرگاکە بەرێ، وەرچەرخایەوەو چوو پڕی بەدەمانچەکەیداکرد. بەپەلە لەژوور دەرپەڕییەدەرەوەو، خۆی گەیاندە ئاستی نایلۆنبەندەکە. بازەی بینی لەکوختەکەی چۆتە دەرەوەو، کلکی خستۆتە سەرشانی. وەڕینێک دەوەڕی کە ها ئێستا هاساتێکی‌تر، پەلامار دەدرێ و پەلاماردەدا. هەرهێندەی ئەم گەیشتە پشت نایلۆنبەندەکە، ئەو زوو هەستی پێکردو دووسێ‌جار، بەدەم وەڕینەوە ئاوڕی بۆ پشتەوە لێدایەوە. لەوە دڵنیابوو کە شتێک لەئارادا هەیە. دەرگای نایلۆنبەندەکەی کردەوەو هەنگاوی‌نایە دەرەوە. لەگەڵ چوونەدەرەوەیدا، بازە توندتر دەستی کردە وەڕین و، چەند هەنگاوێکیش چووە پێشتر. کە بەرەوڕووی وەڕینەکەی بازە هەڵیڕوانی، لەدوور چەند تارماییەکی لەناو بەفرەکەدا بەدی‌کرد، کە بەپێچووپەنا دەبزوان و بەیەکدادەهاتن. لەدڵدا وتی:

ـ دەشێ گورگ بن!.

تەقەلای‌دا بیانژمێرێ. کارێکی زەحمەت نەبوو. ئەوساتە بەفر نەدەباری و ئەوانیش لەبەفرەکەدا، ڕەش دەچوونەوە.

ـ یا حەوتن یا هەشت..لەوە زیاتر نین.

ـ بارام..بۆچی چوویتەتە دەرەوە؟!..مەسەلە چییە؟!.

ئایش سەری کێشابووە دەرەوەی ژوورو، بانگی لێدەکرد. ئەم ڕاستەوخۆ وەرامی نەدایەوە. گەڕایەوە ناو هەیوانەکەو بەهێمنی وتی:

ـ چەند تارماییەک لەدوور بەدی دەکەم. لەوەدەچێ گەلەگورگێک بن. ترست نەبێ. تۆ بچۆرەوە ژوورەوە باسەرمات نەبێ. من و بازە چاریان دەکەین.

ئایش دڵی داخورپا. وتی:

ـ گەلەگورگ؟!..دڵنیایت؟!.

ـ ئا.

ـ چەند دەبن؟!.

ـ حەوت هەشتێک.

ئایش تەنگەتاوبوو. وتی:

ـ چی دەکەیت؟!..نیازی چیت هەیە؟!.

ـ لەخۆتی مەکە بەغایلە. تۆ بچۆرە ژوورەوەو هەقت نەبێ.

ئایشی بەژووورداکردەوەو، دەرگای بەدوادا ڕاکێشایەوە. خۆیشی چووە دەرەوە. بازەی بێدەنگ کردو خۆی مەڵاس دا. گەلەگورگ زۆری پێنەچوو گەیشتنە بەرەوە. بازە خۆی پێڕانەگیرا. دەستی‌کردەوە بەوەڕین و تەکانی‌دا هەڵمەت بەرێ. کەچی هەر دوای چەند هەنگاوێك، لەجێی‌خۆی ڕەق ڕاوەستاو، لەسەر وەڕین بەردەوام بوو. ئەوسا ئەم هەڵسایەوە سەرپێ.

سەیریكرد گەلەگورگ تەواو نزیك بوونەتەوەو، هیچ سڵێك لەوەڕینی بازە ناكەنەوە. خێرا دەمانچەی لێخستنە سەرپێ. نیشانی لەنزیكترینیان گرتەوەو زرمەی لێهەڵساند. بەڵام نەیپێكاو گەلەگورگیش پەرت وبڵاو، هەریەكە بەلایەكدا هەڵاتن. راوەستاو چاوەڕوانیكرد، تا هەموو لەچاوی ون بوون. بەدوایدا كشایەوە هەیوان و دوای قایم كردنەوەی دەرگا، خۆی بەژووورداكردەوە. خێرا ئایش لێیپرسی:

ـ چیت كرد؟!.

بەپێكەنینەوە لەوەرامیدا وتی:

ـ نەمپێكا..

ـ ئەوەندە لێتەوە دووربوون؟!.

ـ نەوەڵا..بەڵام دیارە نیشانشكێن نیم.

ـ بەڵامی پێناوێ..پیلكەت خوارە. ئەوەیان هیچ..دەترسم نەتویستبێ بیپێكیت!. دەنا گورگێكی زلوزەبەلاح و ئەوەندە لەنزیكەوە، چۆن لێنادرێ ؟!.

ـ ئێ ئێمە چیمان دەوێ؟.. هەڵاتنیان و لێمان دووربكەونەوە..تەنیا ئەوەندە نییە؟. ئێ وەهایان كرد. بابچنە ناو ئاوایی و لەوێ لەگەڵ گورگە دووپێیەكانی هاوەڵیاندا، دەست بدەنە یەخەی یەكتری.

هەردووكیان دایانە قاقای پێكەنین. ئایش بەدەم پێكەنینەكەیەوە وتی:

ـ ئەی باوكم و دایكم..ئەی كاكم و..

ـ نا..ئەوان نا..ئەوانی لێدەردەچن.

دووقۆڵی بەتەنیشت یەكەوە بەرامبەر زۆپاكە دانیشتنەوە. بۆ ماوەیەك خامۆشییەكی قووڵ باڵی بەسەریاندا كێشا. هەردووكیان بیروهۆشیان ئاڵاندبووە یەك كێشەو ئایش، لەدەربڕینیدا دەستی پێش خست و وتی:

ـــ زۆر هەقایەت و سەرگوزشتەم، لەبارەی گورگ و گەلەگورگەوە لەدایكم بیستوە، بەتایبەتی لەساڵانی وەك ئەمەی ئێمەدا. تۆ بڵێیت..

بارام قسەكەی پێبڕی. وتی:

ـــ سەیرە!..منیش بیرم لەهەمان باس دەكردەوە. بەڕاست تۆبڵێیت شەڕیان لێلادابین و، ڕۆشتبن بەرێی خۆیانەوە؟!.

ـــ تۆ وەك ئەوەیە، باسی حەوت هەشت گورگی دووپێی خاوەن ئەقڵ بكەیت و، گوایە لەترسی دەمانچەكەت شەڕت لێلابدەن!.

ـــ ئەشەدوبیللا..بگرە گوایە لەبەرئەوەی نەمپێكان، بەسوپاس و ستایشەوە شەڕم لێلادەدەن.

ـــ خۆ دەشێ وەها بكەن. بەڵام ئەی ئەگەر وەهایان نەكرد؟.

ـــ ئەگەر وەهایان نەكرد، دەردەكەوێ كە بێئەقڵن نەك ئاقڵ، ناچار دەیانپێكم. ئەوسا ئەوانیش ناچار دەبن شەڕمان لێلابدەن.

دیسان دایانەوە قاقای پێكەنین. (ئاڵا)ی كوڕە گەورەیان، بەوە لەشیرینخەوەكەی بەخەبەرهات. دایكی خێرا چوو بەلایەوەو كردییەوە خەو. ئینجا هاتەوە بەلای بارامەوە. راستەوخۆ وتی:

ـ من وای بەچاك دەزانم ئەمشەو نەنووین.

بارام وتی:

ـ ئافەرین..منیش وەهام نیاز بوو. بەمەرجێك تۆ نەگرێتەوە. تۆ تەنیا بچۆ چایەكی خەلیسم بۆ دەم بكەو،ئینجا بەبێهیچ ترسێك و وەك هەر شەوێكی تری لەوەبەرمان، لەپاڵ منداڵەكاندا رابكشێ و خەوی خۆت بكە. تا بەیانی بەئاگات دێنم و ئەوسا من لێیدەنووم.

ئایش هەڵساو چوو كترییەكەی پڕ لەئاوكرد. خستییە سەر زۆپاكەو هات لەتەنیشتیەوە دانیشتەوە. قۆڵی كرد بەقۆڵیداو بەخۆیەوە نووساند. وتی:

ـــ ئەوە چایە خەلیسەكەو زۆری پێناچێ پێدەگا. بۆ نوستنەكەش ، من تابەیانی لەگەڵتدا دادەنیشم و ئەوسا، تۆ دەنوویت تا تێرخەو دەبیت و ئینجا من..

بارام لێوی بەلێوییەوەناو قسەكەی پێبڕی. كە لێوی لەلێوی بەردا، ئیتر نەلەم قسەو نەلەو قسە. بەڵكوو چاوەڕوانكردنی پێگەیشتنی چایە خەلیسەكەو، بەدەمییەوە دووقۆڵی ئێشكگرتن.

## گورگ

ئایش خەریكی شتنی قۆری و پیاڵەكان بوو، كە بازە مرەمرێ لێهەڵسایەوە. دەستی بەپیاڵەكانەوە وشك بوو. ئاوڕیدایەوەو روانییە بارام. ئەویش لەلای خۆیەوە قیت بووبۆوەو گوێقوڵاغ بووبوو. وتی:

ـ لەوەدەچێ بەرێوەبن بێنەوە. دیارە شەڕمان لێلانادەن.

بەدوایدا هەڵساو بەدەستووری جارانیتری، خۆی پێچایەوەو پڕیكردەوە بەدەمانچەكەیدا. ئەوساتە مرەمرەكەی بازە رووی لەوەدەكرد، ببێتەوە وەڕینە پڕ لەحیرس و تووڕەییەكە. تەكانیدا لەژوور دەرپەڕێتە دەرەوەو ئایش وتی:

ـــ ئاگات لەخۆت بێ..گەلەگورگ ئامانیان بۆنییە. لەبەر هەیوانەكە دوورنەكەویتەوە.

ـ ترست نەبێ.

تەنیا هێندەی وت و چووە دەرەوە. خۆی گەیاندە بەرهەیوانەكە. بازە وەڕینێك دەوەڕی كە دەتووت، وەختە لەگەڵ هەر حەپەیەكدا، جەرگ و هەناوی خۆی دەربهاوێتە دەرەوە. بەردەوامیش تەكانێكی دووسێ هەنگاویی دەنا و پاشەوپاش دەگەڕایەوە. خۆ كاتێ ئەم گەیشتە ئاستی، هەر تەواو پێی لێهەڵبڕی و، بگرە تەكانیداو بەدووسێ قەڵەمبازد، خۆی گەیاندە ناوەڕاستی حەوشەكە.

لەبەر هەیوانەكەدا راوەستاو كەوتە هەڵڕوانین. ئەمجاریش لەدوور، تارماییانی لە بەفرەكەدا بەدیكردەوە، كە پەرتوبڵاو بەدزەدزە دەهاتن. بەڵام هەرزوو ژمارەیان سەرنجی راكێشا. لەدڵدا وتی: ( لەجاری پێشوو زیاترن!..سەیرە!..یانی چوون دەستەیەكیتریشیان هێنا؟!. یانی نەك هەر شەڕیان لێلانەدام، بەڵكوو دەیانەوێ شەڕم لێبكەنە جەنگی مەغلووبە؟!. ئێ چاكە..راوەستن بۆم!).

ئەوسا بانگی بازەیكردو بۆ لای خۆی بەكێش كردەوە. یەك دووجار دەستی بەسەریدا هێناو، بێدەنگی كرد. ئینجا دەستێكی قورسی نیشاندە سەر پشتی و وتی:

ـ وسبەو خۆت مەلاس بدە..نامەوێ ورتەت لێوەبێت.

بازەی لەسەر چوارچەمۆڵە دانیشاندە سەرزەوی. خۆیشی لەپاڵ بارستایی بەفری ماڵراوی سەرباندا، كە هەتا نزیك گوێسوانەكە كەڵەكەبووبوو، خۆی مت كردو دەمانچەی لێخستنە سەرپێ. ئایش لەو خامۆشییە سەرسام بوو. ئۆقرەی نەگرت و سەری كێشایە دەرەوە. كە گوێی هەڵخست و هیچ ورتەوجووڵەیەكی بارام و بازەی نەبیست، دڵی داخورپا. بێخۆپێچانەوە دەرپەڕییە دەرەوە بۆ هەیوان. لەوەدابوو دەنگ هەڵبڕێ و بانگ بكا، بارامی بەدیكرد كە بەچیچكانەوە خۆی مەلاس دابوو. كەمێكیتر چووە پێشەوەو بەدەنگی نزم لێیپرسی:

ـ ئەوە خەریكی چیت؟!. بۆ وا بێدەنگن ؟!.

ئەو وەرامی پرسیارەکەی نەدایەوە. بەڵکوو بەچرپە وتی:

ـــ کچێ بۆچی هاتوویتە دەرەوە؟!..ڕەق دەبیتەوە نەگبەت..ڕاکەرەوە ژوورەوە.

ـ ئەی نابێ بزانم چییەوچی نییە؟.

ـ خۆمان بۆناونەتەوە. خەریکن دێنە بەرەوە. ڕاکە بچۆرەوە ژوورەوە.

ئایش خۆی بەژووردا کردەوە. ئەوان لەچاوەڕوانیدا مانەوەو، گەلەگورگ تا دەهات نزیکتر دەبوونەوە. بازە دووسێجار سووکە مرەیەکی، بەنیازی دەسپێکردنەوەی وەڕین لێبەرز بووەو، ئەم خێرا بێدەنگی کرد. بڕیاریدابوو ئەمجارەیان پەنا بەرێتە بەر، ئەو پەندەی لەبارەی گورگەوە باوە. واتە بەگۆشتی لاشەی یەکێك لەخۆیان تێریان بکاو، خۆی لەشەڕیان بپارێزێ. بۆیە لەدڵدا وتی: ( کەوابوو دەبێ وازیان لێبێنم تا تەواو نزیك دەبنەوە).

ئەو هەتا ئەوساتە، ئەگەرچی ئەم قسەیەی بەچەندین جۆرو لەچەندین هەقایەت‌و سەرگوزەشتەدا بیستبوو، بەڵام تەنیا وەك قسەیەکی رووت وەریگرتبوو. لەبەرئەوە گومانێك لەناکاو لەدڵیدا سەریهەڵداو وتی: (ئەی ئەگەر وانەبوو؟!..ئەگەر وانەبوو، ئەوا من دەبێ هەتا بەیانی خەریکی گورگکوشتن بم!). زۆر لێیڕانەماو وتی: ( جا بێنەوبەرەی بۆچییە؟..ئەوە گەلەگورگ‌و، ئەمەش گەلەگوللەی مەرگ بەدەستمەوەو، درۆو ڕاستیی قسەکە ساغ دەکەینەوە).

گەلەگورگ تەواو هاتنە بەرەوە. لەتەیمانی حەوشەکە نزیك بوونەوە. بەدەستووری پەلێك چەکداری پەلاماردەرو بیانەوێ، هێرش بەرنە سەر سەنگەرێکی دوژمن، بەرەوڕووی ئەمان ریزیان بەستبوو. بازە خۆی پێڕانەدەگیرا. لەیەکبینا کلك‌و گوێچکەو چوار چەمۆڵەی دەبزواندن‌و، پەیتاپەیتاش ئاوڕی لەم دەدایەوە. ئەمیش بەردەوام تەقەلایدەدا، هێمنی بکاتەوەو نەیەڵێ لەجێی خۆی ببزوێ.

گەلەگورگ گەیشتنە ئاستی تەیمان. ئینجا زۆر بەهێمنی‌و زۆر ورد، نیشانی لە یەکێکیان گرتەوە. پەلەپیتکەی هێنایەوەیەك‌و، زرمەی لەدەمانچە هەڵسان. گورگە قورسکەیکردو ڕەتیبرد. ئەوانیتر سڵەمینەوەو هەر یەکە بەلایەکدا، بەرەودواوە هەڵاتن. بازە لەگەڵ تەقەکەدا، چەند هەنگاوێك بەرەوپێش تەکانیداو، دەستیکردەوە بەوەڕین‌و حەپەحەپ. ویستی بەدوایاندا هەڵمەت بەرێ‌و ئەم نەیهێشت. وتی:

ـــ تۆ عەزێت مەکێشە..پێویست ناکا..یەکێکیانم پێکاوەو چۆنی نۆش دەکەن، ئارەزووی خۆیانە.

هەر لەو ساتەدا گورگی پێکراو، وەك تینوتوانای حەوت گورگی ساغوسەلیمی پێبەخشرابێ، راست بۆوەو کەوتە دڕدان بەبەفرەکەو هەڵاتن. پێوەی دیاربوو کە پێکراوێکی کوشندەیەو، کەچی بەجۆرێك دڕ بەبەفرەکەدەدا، کە دەتووت تەنانەت نووکە دەرزییەکیش نەچەقیوەتە لەشی. بازە سەرلەنوێ تەکانیدایەوە هەڵمەت بەرێ‌و، ئەمجاریش نەیهێشت. لەدڵدا وتی: ( ئەگەر قسەکە راست بێ، تەنیا بریندارکردنی‌و بگرە تەنیا دووسێ دڵۆپ خوێنی پێوەبێ، کاریلەکار دەترازێ ).

ئایش بەدوای تەقەکەدا، هەمدیس سەری کێشایەوە دەرەوەو بانگی لێکردەوە. ئەم لێیپەست بوو. لەوەرامیدا وتی

ـــ پێم نەووتیت سەر لەژوور مەهێنەرە دەرەوە؟..تۆ خوا گرتووتی؟!.

ئایش کە هەستیکرد بەتووڕەییەوە قسە دەکا، کشایەوەوچۆوە ژووروە. ئەویش بازەی خستە تەك خۆی‌و بەرەوحەوشە هەنگاوینا. لەوە دڵنیابوو کە گورگی پێکراو، دەبێ لەو نزیکانە لەگەڵ گەلەگورگی هەڵاتوودا یەکدگیر ببنەوەو، راستی‌و ناڕاستیی قسەکە بسەلمێ. نیازی ئەوەی نەبوو لەتەیمانەکە بچێ بەودیوداو، لەماڵ دوور بکەوێتەوە. بگرە نەگەیشتە ئەوەی پێویستی پێی هەبێ‌و، هەرزوو ئەنجام بەدەرکەوت. گەلەگورگی لەدوور بەقەدپاڵی گردۆلکەیەکی لاتەنیشتەوە بینی، کە وەك گێژەنێك لوولیان بدا، بەیەکدادەهاتن‌و بەئاشکرا دیاربوو، کە نیشتوونەتە گیانی گورگی پێکراوەو، ونجڕونجڕی دەکەن. ماوەیەك بەدیمەنەکەیدا هەڵڕوانی‌و وردبۆوە. ئەوسا سەرێکی باداو بەرەوژوورەوە کشایەوە.

### دەمانچە

هەر کە پێینایە ناو ژوور، ئایش بەپەرۆشەوە وتی:

ـ بۆ ناڵێیت ئەمجاریش نەتپێکا!.

ـ با..ئەمجارەیان پێکام.

ـ ئادەی بۆمی باس بکە..بزانم چۆن بوو؟.

لەنووکەوە بۆی گێڕایەوە. بەوەش کۆتایی پێهێنا کە وتی:

ـ دەمانچەبۆر کاری خۆیکرد.

ئایش سەرنجێکی بەمەغزایدایەو، بەدەم بزەیەکی توانجئامێزەوە، لەوەرامیدا وتی:

ـ یانی باوەڕت هێنا کە شتێکی پێویست بوو؟. باشە ئەو دەمانچەیە نەبوایە چیت دەکرد؟.

ـ بەتەور..بەبێڵ..بەتێلاڵ.

ـ ئابەڵێ..ڕۆستەمی زاڵیت!. بگرە ڕۆستەمی زاڵیش بوویتایە، ئەوەت لەگەڵ یەکێك یا دووانـدا پێدەکرا، نەك گەلەگورگێك. یا وەك خۆت دەڵێیت دوو گەلەگورگ. وا نییە؟.

ـ ئۆباڵ بەگەردنم وایە.

ـ باشە لەباتیی دەمانچەکە، تفەنگ بوایە چاکتر نەبوو؟!. وتم وەك دەمانچەکە دەکڕیت، هەندێ پارەیتری بەقەرزوقۆڵە بۆ پەیدا بکەو بیدە بەتفەنگێك، بەقسەت نەکردم.

بارام هیچ وەرامێکی ئەوی نەدایەوەو، خۆی بێدەنگ کرد. ئەو وەختە سەرلەنوێ گەرمی بووبۆوەو، کشابۆوە پاڵ دیوارەکە. سەیرێکی سەعاتەکەی دەستیکردەوە. نزیکی دووازدەو نیوی نیشان دەدا. لەدڵدا وتی: ( تۆ بڵێیت بێنەوە؟!). کەمێ لە پرسیارەکە راما. ماوەیەك تاووتوێی پێکرد. بەوەرامدانەوەی پەست دەبوو. چونکە دەیزانی کە وەرام دەبێ چیبێ: (ئا..دوور نییە..هیچ دوور نییە. گەلەگورگەو برسییەو بۆنی هەشت نێچیری، ناو خانوویەکی تەریکی دوور لەئاواییان کردوەو، جارێك‌و دووان‌و دە شاڵاویان بۆ دێنن. شەوگاریش هێشتا زۆری بەبەرەوە ماوە. ئایش ڕاست دەکا. ئەگەر لەبریی دەمانچەکە تفەنگێك بوایە، کێشەکە بەجۆرێکیتر دەکەوتەوە).

بەدوایدا دەمانچەکەی لەبەرپشتێنی دەرکێشاو گرتی بەدەستییەوە. شانەی لێدەرهێنا. فیشەکەکانی لێبەتاڵ کردن‌و ژماردنی. پێنجی تێدامابوونەوە. شانەی یەدەکیشی هێنایە پێش. ویستی فیشەکەکانی لێبەتاڵ بکاو نەیکرد: (پێویست ناکا..حەوتن..ئەوە دوازدە!). لایکردەوە بەلای ئایشدا. لەتەنیشتییەوە نەمابوو. خەریکی چراکەبوو دایبگرێتە خوارەوەو پریبکاتەوە لەنەوت. ئەمیش لەلای خۆیەوە هەستیکرد، کەشەوقەکەی تەواو کزبووە. لەگەڵ ئەوەشدا وتی:

- فیشەکەکانیترت لەکوێ داناون..بۆمیانی بێنە!.

— باچراکە پڕبکەمەوە لەنەوت. ئاگامان لێیبڕابوو. خەریکبوو دەکوژایەوە.

ئەم لەدڵدا وتی: (وا بزانم هەشت فیشەکیترم هەن. ئێ ئەوە بیست..بەسە..خۆ شەڕەسەنگەر نییە!).

ئایش چرای گەڕاندەوە شوێنی خۆی. چوو فیشەکەکانیتری هێناو، خستنییە بەردەستی. خۆیشی لەتەنیشتییەوە دانیشتەوەو، کەوتە سەرنجدانی. کە سەیریکرد وا دەیانژمێرێو دووانیان لێدەخاتە ناو یەکێك لەدوو شانەکە، وتی:

- تۆبڵێیت بێنەوە؟!.

بارام یەکسەر وەرامی نەدایەوە. یەکێ لەدوو شانەکەی چەسپاندەوە دەمانچەکەو، دەمانچەی نایەوە بەرپشتێن. شانەی دووەمو فیشەکەکانیتری خستنە گیرفانییەوە. ئینجا ڕووی تێکردو ئاسایی وتی:

- دوور نییە بێنەوە.

- ئەی چارچییە؟..چی بکەین؟!.

— چار؟!..ئەوە دەمانچەو گوللەو، ئەوە منوبازەو، ئەوەش ئەوانو هێرشو پەلاماریان بەکەڵبەونینۆك. ئێمە لەسەنگەرداینو خۆمان ئامادەکردوەو، ئەوان هێرش دێنن. خۆ تۆپو نارنجۆکیان پێنییە هەڵمانتەکێنن. ئەوان هەیانە کەڵبەو من هەمە گوللە. پێش ئەوەی ئەوان کەڵبە لەمن گیربکەن، من گوللە دەسرەوێنمە ئەوانو بڕایەوە. ئایش بەم قسانە دڵی حەوایەوە. پێشتر لەدڵدا زۆر تەنگەتاو بووبوو. سەدویەك پرسوڕا لەمێشکیدا گینگڵیان دەخواردو، دەیویست دەریانبڕێ. بەڵام ئەو قسانە ڕەواندنییەوە. بەدەم زەردەیەکی شادییەوە وتی:

— لێت ناترسم..ڕاستە تا ڕادەیەك کەمتەرخەمیت. بەڵام کاتێ خەمخۆری بۆ شتێك یەخەت دەگرێ، بۆی دەبیتە شێری بەرمەیدان.

ئەویش هەر بەدەم زەردەخەنەکەیەوە وتی:

- ئەمە ستایش بوو یا تانووت؟.

- تانووت؟!..حاشا..

— ئەی تۆ نالێیت من کابرایەکی کەمتەرخەمم؟.

- با..بەڵام یەکەم ئەوە تانووتلێدان نییەو، سیفەتێکی ئاسایی خۆتە. دووەمیش وتم کە لە وەختی پێویستدا دەبیتە شێری بەرمەیدان.

بارام سەیریکرد وا دیسان ساکاریو خۆشبڕواییەکەی، گاڵتەگلەییەکەی ئەمی وەك هەمووجارەکانیتر، لێکردۆتە ڕاست. جارەکانیتر لەگەڵیدا دەیدا بەدەمییەوەو، بۆ ماوەیەك درێژەی پێدەداو لەئەنجامدا، دەیکردەوە بەگاڵتەوگەپو پێکەنین. بەڵام ئەمجارەیان زوو هەستیکرد، کە دۆخەکە هی ئەوە نییە بدا بەدەمییەوە. بۆیە بەنەرمە پێکەنینێکەوە وتی:

— هەمدیس تێکەوتیتەوە!. کچێ تانووتی چیو تەڕەماشی چی!. ئەشەمبیللا وایەو خۆم لەتۆ باشتری دەزانم، کە کابرایەکی کەمتەرخەمم. تەنیا ویستم..

ئایش قسەکەی پێبڕیو وتی:

- جا ئەمە وەختێتی؟!.

— نا..هەقتە..بۆیە منیش وا زوو وازم لێهێنایت.

— جا باشە تۆ بەتەواوی، واز لەم خووەت بێنیتو، لەکۆڵم ببیتەوە باشتر نییە؟.

- تۆ ئەوەیان بخەرەلاوە..بابێینە سەر باسی کەمتەرخەمییەکە..

- دەست پێدەکەیتەوە؟.

- نا..نەوەڵڵا..بەڕاستمە. دەمەوێ بۆتی ڕوون بکەمەوە، کە ئەو سیفەتی کەمتەرخەمییەم لەچییەوە هاتوە. جارێ دەبێ نەووترێ کەمتەرخەمی، بەڵکوو کەمهەڵپەیی، بگرە بێهەڵپەیی. یانی من هەڵپە بۆ ژیان ناکەم. بەهەرچوار پەل شاڵاو نابەمو پەلامارنادەم. بەتەنگ کەڵەکەکردنیماڵو موڵکو سامانەوە نیم. تەنیا هێندەم لامەبەستە ئاسایی پێیبژین. تۆچاکت وت. ئەوەی بۆ ژیانەکەمان پێویست بێ، بۆی دەبمە شێری بەرمەیدان. ئەوەشی پێویست نەبێ، بەهیچ کلۆجێ گوێی نادەمێو، لەئاستیدا کەمتەرخەمم. من قێزم لەو بابەتە کەسانە دێتەوە، کە هێندەی کێوێك سامانیان کەڵەکەکردوەو، کەچی هێشتا هەڵپەی زیادکردنی دەکەن. من بەدەستم بێ دێم هەرچی سامانێکی ئەوانە هەیە، زەوتی دەکەم. ئینجا یەکەمجار بەندیخانەیەکیان هەر لەبناغەوە هەتا سەربان لەو سامانە، لەزیو بۆدروست دەکەم. هەریەکەیان کۆتوپێوەندێکی لەزێڕدروستکراوی، لەملو دەستوپێ دەخەمو، دەیکەمە میوانی یەکێ لەژوورە زیوینەکانی بەندیخانەکە. دواجار هەرچیمان لەسامانەکە پێچایەوە، دەیکەمە لیرەی

ڕەشادیو هەرکامیان هەرهێندەی وتی برسیمە، ئانوسات یەکێك لەو لیرانەی دەخەمە دەمەوە. ئیتر قووتیدەدا یا نایدا ئارەزووی خۆیەتی. خۆراکیان هەر ئەوە دەبێ. بۆی هەیە نەیخواتو بۆشی هەیە لەڕۆژێکدا هەزار..دە هەزار..سەد هەزار لیرە بخوات. تێم گەیشتیت چیم وت؟.

ئایش کەمێك بۆ وەرام ڕاما. ئەمە یەکەمجاری نەبوو، لەم بابەتە قسانەی لێببیستێ. بەڵام یەکەمجاریبوو وا بەڕوونیو بەئاسانی لێیتێبگا چی دەڵێ. لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەزانی چ وەرامێکی بداتەوە.

- تێم نەگەیشتیت؟!..دووبارەی بکەمەوە؟.

ئەوسا بەناچاری تەنیا وتی:

- نا..پێویست ناکا..تێتگەیشتم.

ئەویش ئیتر لەسەری نەڕۆیشت. باسەکەی گۆڕیو وتی:

- چاکتر وایە تۆ سەرخەوێك بشکێنیت.

— پێم وتیت نانوومو شانبەشانت ئێشك دەگرم. ئیتر ئەم قسەیە مەکەرەوە.

وەرامدانەوەکەی نیمچە تووڕەبوونێکی پێوە دیاربوو. بۆیە بارام بەڕوویەکی خۆشەوە وتی:

- دەکەوابوو چایەکە لێبنێرەوە.

لوورە

بێدەنگیو خامۆشییەکی قووڵ هەردووکیانی لەئامێز گرتبوو، کاتێ زۆر لەدوورەوە لوورەیەکیان بەئاستەم کەوتە بەرگوێ. پێکەوە لەیەك ساتدا، ملیان قوت کردەوەو گوێقوڵاغ بوون. ئانوسات بازەش، دەستیکردەوە بەوەڕینو بینی پێوەگرتو ئیتر، زۆری پێنەچوو لوورەی گورگو وەڕینی بازە، تێکەڵ بەیەکتریبوون.

ئایش سەرنجێکی تێکەڵ لەوڕبوونو شڵەژانیدایە بارام. وەك لەبەرخۆوە بدوێ، بەدەنگی نزم وتی:

- هاتنەوە!..

بارام هەستی بەو شڵەژانەیکرد. بەلایەوە بەناهەق نەبوو. ئەم خۆیشی هیوایەکی بەوە هەبوو، کە دوای دوو جار تەقەلێکردنو، کوشتنی یەکێکیانو خواردنی لەلایەن ئەوانیترەوە، ئیتر هاتنەوەیان نەبێو ڕوویان لەلایەکیترکردبێ. لەبەرئەوە ئەگەرچی بەدەمو زمان تەقەلایدا، ئەو دڵنیابکاو ترسی لەدڵدا نەهێڵێ، بەڵام خۆی بەبیروهۆش ئالابووە گرفتەکەو وردیدەکردوە. بەرلەهەموو شت،

بەبوونی دەمانچەکەو بیست فیشەکەکەی ، خۆی بەپشتئەستوور دەبینی. لەگەڵ ئەوشدا، سووکەترسێك لەناخدا تەنگەتاوی دەکردو، هەستی پشت ئەستوورییەکەی بەدەمانچەکە لێدەشڵەقاند. تەقەلای دەدا بچێتە بنجوبناوانەوە، کە ئەوە لەبەر چییەو بۆ چییەو زەفەری پێنەدەبرد. بۆ ماوەیەکی زۆر خامۆش بوو. تا ئایش بەئاگای هێنایەوەو وتی:

ــ ئەوە بیر لەچی دەکەیتەوە؟..بۆ وا متوخامۆشیت؟..گوێت لەبازە نییە؟.

ئەوسا راچەنین و گوێهەڵخستن و خۆسەرپێخستنی، تەنیا یەك ساتەوەختیان خایاند. دەستبەجێ هەستی کرد، بازە بەرهەیوانەکەی جێهێشتوەو چۆتە بەرتەیمانی ئەوپەڕی حەوشەکە. بازە بەلایەوە، تەنیا سەگێکی بەوەفای پاسەوانی بەردەرگای حەوشە نەبوو، بەڵکوو ئەندامێکی خێزانەکەبوو. زۆری لامەبەست بوو بەدەستووری پاراستنی خۆی و ژن و منداڵەکانی لەدەمی گورگ، ئەویش بپارێزێ. بۆیە راستەوخۆ رووەودەرگا قەڵەمبازدی داو، دەرپەڕییە دەرەوە. گوێی نەدایە بانگ و هاواری ئایش. هەڵمەتی بردە دەرەوەی هەیوان. زۆر بەتووڕەییەوە دەنگی لەبازەکردو کشاندییەوە. کە گەیشتەوە ئاستی، ئەم وەکوو یەکێك لەمنداڵەکانی تەمێ بکا، دەستی دایە گوێچکەیەکی و لەبەردەمی کوختەکەیدا، لەسەر چوارچەمۆڵە نیشاندییە سەرزەوی. دووسێ سووکە لەپەدەستیشی کێشا بەتەوقی سەریدا. ئەوسا جێی هێشت و کشایەوە. بەڵام هەر کە پێی نایەوە هەیوانەوە، لووتی بووبەلووتی ئایشەوە. لێی پەست بوو. وتی:

ـ هەمدیس ..

ئایش وەرامی نەدایەوە. پشتی تێکردو گەڕایەوە ژوورەوە. کاتێ ئەمیش بەدوایدا پێی نایەوە ناو ژوور، سەیری کرد

وا ئەو پاڵتۆکەی بۆ بەدەستەوە گرتوەو، بێورتەوجووڵە راوەستاوە. زوو لێی تێگەیشت. خۆی بۆ وەرچەرخاندو هەردوو قۆڵی کرد بەهەردوو باڵی پاڵتۆکەداو، چەسپاندییە بەری خۆی. ئینجا بەرەورووی وەرگەڕایەوە. دەستی کردە ملی و بەوپەڕی سۆزەوە ماچی کرد. کە دەستیی لێبەردا وتی:

ــ لەوەدەچوو نزیك بووبنەوە. چاکتر وایە بچمە وێزەیان.

کە وەرچەرخا بچێتەوە دەرەوە، ئایش بەدەنگێکی پڕ لەبەتەنگەوەهاتنەوە وتی:

ـ بارام گیان..وریابە..چاك ئاگاداری خۆتبە.

بارام بەدەم چوونەدەرەوەیەوە، تەنیا بزەیەکی گەشی بەرووداداو بەقسە هیچ وەرامێکی نەدایەوە.

کاتێ وەك جاری پێشوو خۆی مەڵاس دایەوە، سەری سوڕما کە هیچ تارماییەکی لەدوور یا لەنزیك بەدی نەکردو، تەنیا دەیبینی بازە جێ بەخۆی ناگرێ و، بەردەوامیش بەکپی دەمڕێنێ. پەیتاپەیتاش سەیری ئەم دەکاو بێئارامیی خۆی نیشان دەدا. جارناجارێك سووکە تەکانێك بەرەوپێش دەداو دەکشێتەوە. ئەم گومانێکی لەدڵدا لاپەیدا بوو. هاتە سەرئەوەی زیاتر گوێ هەڵبخا، وەك لەئاڕاستەکردنی بینایی چاو. گوێهەڵخستن سووکە خرمەخرمێکی رۆیشتنی سەربەفری لەسەربانەوە لەلا ئاشکراکرد. لەتەنیشتی لای چەپپیشییەوە، کە بارستایی بەفری ماڵراوی سەربان بەرچاوی دەگرت، هەمان سووکە خرمەی کەوتە بەرگوێ. ئینجا کە بەلای راستدا لەودیو تەیمانەکەی حەوشەوە لمۆزی گورگێکی بەدی کرد، کە ساتناساتێك دەردەکەوێ و ون دەبێتەوە، خێرا تێگەیشت باس چ باسەو لەدڵدا وتی:

( کەوابێ ئەمە ئەو حاڵەتەبوو کە لێی دەترسام و زەفەرم پێنەدەبرد. چی بکەم باشە؟.نیازو بڕیاریان ئاشکرایە. سەیرە..دەڵێت لەشکرێکی رێکوپێکن و هێرش بۆ سەر سەنگەرێکی دوژمنەکەیان دەبەن..چی بکەم باشە؟..).

ساتێکی زۆر سەختوستەم بوو. نەیدەزانی چی بکا. لەسەربان و لەتەنیشتی لای چەپەوە، خرمەخرمەکە تادەهات زیادی دەکردو نزیك دەبۆوە. لمۆزەکەی لای راست دەبووە دووان و سیان و پێنج و بەیناوبەین خێراتر دەردەکەوتن. بازە تادەهات زیاتر سرەوتی لەبەردەبڕاو تەنگەتاودەبوو. تا وای لێهات ئەمیش لەلای خۆیەوە، لەوە زیاتر ئۆقرەی نەگرت. لەناکاوێکدا بڕیاری خۆی داو ئانوسات بردییە سەر. پەلەپیتکەی لەدەمانچە هێنایەوە یەك و رووەو لمۆزەکان تەقاندی. بەڵام ئەوەی دەمودەست لەبازەی روودا، وای لەم کرد لەجێگەی خۆی تەواو بحەپەسێ و واقی وڕبمێنێ. بازە دەستوبرد لەگەڵ تەقەکەدا، وەك دوای چاوەڕوانکردنێکی زۆری ئازاربەخش، بیەوێ بەپەلە بچێ داخی دڵی بڕێژێ، کوێرانە بەرەولای تەیمان هەڵمەتی برد. هەرهێندەی گەیشتە ناو حەوشە، گەلەگورگ لەسەربان و لەتەنیشتی لای چەپەوە، وەك گەردەلوولێك خۆیانیان پێداداو زەق بەبەرچاوی ئەمەوە، تەیمانیان شەقوپەق کردو بەرەوخوار رایانماڵی. ئەم بۆماوەی چەند ساتێك وەها واقی وڕمابوو کە لەجێی خۆی وشك هەڵات. وەختێکیش تینوتوانای بەبەرداهاتەوەو بەرەوپێش تەکانی دا، سەیری کرد وا گێژەڵووکەکە گەیشتۆتە قەدپاڵی گردۆڵکەکەی بەرامبەریان. لەو ساتەدا بەچاوی ناخ بازەی دەبینی کە هەزارویەك جار، کەڵبە لەجەستەی چەقیوەو هەزارو یەك دەلاقەیان تێکردوە. لەگەڵیدا وای هەست دەکرد، کە هەزارویەك دەلاقە کراونەتە جەستەی خۆی. تەووژمی ئازارێکی دەروونیی سەخت زۆری بۆ هێنا. بەبێئاگا بەدەم هاواری کرد:

ـ با..زە..

بەدەمییەوە بێئەوەی بزانێ چی دەکا، هەرچی گوللەیەك لەدەمانچەکەیدابوو، رووەو گێژەڵووکەکە تەقاندنی و بەدوایدا، گێژەڵووکە داخزایە ئەودیو گردۆڵکەکەوەو لەچاو بزربوو. ئایشیش دیسان لەژوورەوە خۆی پێڕانەگیرا، بەتایبەتی کە بەدوای هاوارەکەی بارام و تەقەکاندا، هەستی بەخامۆشییەکی سامناك کرد. کەمێ خۆی پێچایەوەو دەرپەڕییە دەرەوە بۆ هەیوان. راوەستاو گوێی هەڵخست. هیچ ورتەوجووڵەیەکی نەبیست. بانگی کردە بارام و وەرام نەبوو. کە جاری دووەم بانگی لێکردەوەو وەرام هەرنەبوو، دڵی داخورپا. شێتانە هەڵمەتی بردە دەرەوەی هەیوان و بارامی بینی، لەبەفرەکەدا بەچۆکدا هاتووەو، سەری بەسەرسنگیدا شۆڕبۆتەوە. خۆی گەیاندێ و باوەشی پێداکرد. ئەوسا بارام سەری هەڵبڕییەوەو کەوتە سەرپێ. بەبێدەنگ بەرەوهەیوان هەنگاوی نا. لەودیو دەرگای نایلۆنبەندەکەوە چاوەڕوانی کرد، تا ئایش بەدوایدا بەژوورکەوت و، بەبێدەنگیش دەرگاکەی قایم کردەوە . ئینجا خۆی بەژووردا کردەوەو ئایشیش بەدوایەوە.

مۆتەکە

ــ بارام..چیبوو؟!..بۆم باس بکە..چی رووی دا؟!.

بارام هێشتا هەر حەپەسابوو. سەرنجێکی گێژوویژیدایەو هیچ وەرامێکی نەدایەوە. هێشتا دیمەنی بازەو گێژەڵووکەکەو ئاوابوونی بەودیو گردۆڵکەکەدا، سەراپای بیروهۆشی داگیرکردبوو. لێیبووبووە مۆتەکەیەکو بەرۆکی بیروهۆشی بەرنەدەدا. بگرە تا زیاتر گەرمیدەبۆوەو، جێگەی گازونوقورچی بەتەووژمی زریانەکەی لێخۆش دەبوونەوە، پتر شانی بۆ مۆتەکەکە شل دەبوو: (..زۆری پێناچێ دێنەوە. کە هاتنەوە ئەمجارە من لوول دەدەن و وەك بازەم لێدەکەن. جاری دواتر ئایش. دواتریش دێنە کونی ژوورەوە بۆ ئاڵاوباڵا. یانی ئەمشەو.. یانی..گورگ..گورگی چوارپێ..یانی..گوایە. ..)

لەناکاوێکدا هەڵسایە سەرپێ. شێتانە کەوتە هەڵڕوانین بەدەوری خۆیدا. بینایی لەسەر هیچ شتێکی ناو ژوورەکە راگیرنەدەبوو. رووخساریشی وەهای دەنواند، کە ئازارێکی کاریگەر دەروونی هەژاندبێ. ئایش سەری لێیسوڕما. لەگەڵ ئەوەشدا باوەشی پێداکردو دایمرکاندەوە. کە لەخۆی بەئاگاهاتەوە، وەك چاوی بۆماوەیەك لەبینین کەوتبێ و لەپڕێکدا بەری روون بووبێتەوە، ئاوها بەپەشۆکاوییەوە سەرنجێکی خێرایدایە ئایش و ئینجا منداڵەکان. کەلێیان دڵنیابوو، تەواو هێمن بۆوە. لەجێی خۆی دانیشتەوەو، خامۆشییەکی قووڵ دایگرت. ئایش دەستی لەشانی گیرکرد. یەك دووجار رایوەشاندو وتی:

ـ بارام..بارام گیان..بۆ وا دەکەیت ؟. چیت دەوێ؟..چیت بەسەرهات؟. بۆ قسە ناکەیت؟!.

ئەوسا لایکردەوە بەلایداو سەرنجێکی وشیارانەیدایە. لەو وەختەوەی هاتبوونە ژوورەوە، یەکەمجار بوو تەووژمی شاڵاوی مۆتەکەکە یەخەی بەرددەداو، دەیتوانی رووخساری بخوێنێتەوەو بزانێ لەچ حاڵێکدایە. رەنگی بووبوو بەلیمۆی زەرد. لێوی دەلەرزین و بەربینی قولپی دەدا. ترسوسامێکی تێکەڵ لەحەپەسان و رامان، لەچاویدا قەتیس مابوون. ئەو دیمەنە وریای کردەوە کە تاچ رادەیەك، وەرەیبەرداوەو چۆن ئایشیشی لەگەڵ خۆیدا راپێچ کردوە. لەسەرەتادا لەخۆی تەریق بۆوە. وەك لەپڕ تایەکی قورس دایبگرێ، سەرتاپای لەشی نیشتە سەر ئارەقێکی گەرم و هەستیکرد، هەردوو لاجانگی گڕیان لێدەبێتەوە. بەتوندی کەوتە سەرزەنشتکردنی خۆی. وتی:(شوورەیی ناکەیت؟..لەترسنۆکییەوەیە یا لەچی؟!. وەرەوە سەرخۆت..بڕوانە ئایش و بزانە لەچ حاڵێکدایە..خێراکە..خێرا..).

ئیتر وەك هێزێکی تەلیسماوی دەستی دابێتە بنباڵی، قیت بۆوەو بزەیەکی گەش کەوتە سەرلێوی. رووخساری روون بۆوەو چاوانی بریسکەیان تێکەوتەوە.دەستومەچەکی بزواند. سەری ئایشی گرتە ناو هەردوو لەپ و، کەوتە ماچکردنی دەم و رووومەت و ناوچەوانی. بەنەرمە پێکەنینێکەوە وتی:

ـ هیچم نییە..هیچم نییە ئایش گیان. کارەساتەکە کەمێ گێژوویژی کردم، چونکە بەلامەوە ستەم بوو. گوێ بگرە با بۆتی بگێڕمەوە..

بۆی گێڕایەوە. کە لێبۆوە ئایش وتی:

ـ شتێکی سەیرە..ئەمە یانی چی؟..

ـ بگرە حاڵەتێکی سەیرە..منیش سەرم سووڕماوە. حاڵەتێکەو ناچێتە ئەقڵەوەو کەچی ئەوەتا رووی‌دا.

ـ ئێستا چیبکەین باشە؟..دیارە لەکۆڵمان نابنەوەو دێنەوە وێزەمان.

ـ گومانم لەوە نەماوە کە دێنەوە. ئەوەیان هیچ. حاڵەتێکی لەرادەبەدەر سەیرەو، بەهیچ کلۆجێ رێی تێناچێ و، لەچارەمان نوسراوە ئێمە تووشی ببین.

ـ ئێ باشە بۆچی ئێمە؟..

ـ تێناگەم..نازانم بۆچی ئێمە؟.

ـ ئەی چار..چارمان چییە؟..

بارام بێدەنگ بوو. جگەرەیەکی ئاگرداو کەوتە مژلێدانی. کەمێ بیریکردەوە. کێشەکەی لەمێشکیدا هێناوبرد. لای روون بوو کە گەلەگورگ وەك هێزێکی نهێنی هەڵیانسووڕێنێ، یابگرە وەك خۆیان بڕیتیبن لەو هێزە نهێنییە، وەها بەرامبەر بەوو مەملەکەتەکەی کردارەکەن. هەروەکوو لەلای ئاشکرابووبوو، کە گەلەگورگ لەئاستی ئەمدا، بڕیاری جەنگێکی مەغلووبەیان داوەو، تا کۆتایی لەگەڵیدا دەیبەنەسەر. بۆیە ئەمیش خێرا بڕیاری خۆیدا. روانییە سەعاتەکەی. زۆر لەسەرخۆ باری دانیشتنەکەی گۆڕی و، رووی بۆ ئایش وەرگێرا. دەستی ئەوی خستە ناودەستییەوەو وتی:

ـ گوێم لێبگرە ئایش گیان..ئێستا وا سەعات نزیکی دووە. دەبێ زیاتر لەچوار سەعاتی‌تر بەم حاڵەوە بەسەربەرین، تا شەبەق دەداو لەم مۆتەکەیە دەخەلەسێین. تێم دەگەیت دەڵێم چی؟..چوار سەعاتی‌ترو دەشێ چوار جاری‌تر هێرشمان بێننەوەسەر. گوێم لێبگرە بزانە چیم بڕیارداوەو، حەزیش دەکەم بزانم تۆ چی دەڵێیت؟.

ئایش ئەوساتە ئاسایی بووبۆوە. ترسوسامەکە لەچاویدا ڕەوی‌بۆوە. لەوەرامدا وتی:

ـ تۆ چۆن بڕیاردەدەیت، من وا دەکەم.

بارام خۆی خستە سەرپێ و وتی:

ـ کەوابێ هەڵسەو دەستوبردکە. نوێنەکان و ئەم هەندە دارەی ژوورەوە نەبێ، ئیتر هەرچیمان کەلوپەل هەیە، بابیبەین و بەری هەیوانەکەی بەمدیو نایلۆنبەندەکەدا پێبتەنین. چیشمان دار لەهەیوانەکەداو داروپەردوو لەژوورەکەی ئەوبەردا هەیە، هەر دەیدەینە پاڵی و دەیانکەینە دیوارێك لەڕوویاندا. دەمێنێتەوە دوو پەنجەرەکەو کلاوڕۆژنەکە . پەنجەرەی ژوورەکەی خۆمان وەها دەتەنم، کە قوش نەتوانێ خۆی پێدابکا. پەنجەرەی ژوورەکەی ئەولاش ، خۆی‌لەخۆیدا هی ئەوە نییە لە توتکەسەگێکی زیاتر پێوە بچێ و، لەگەڵ ئەوەشدا هەر چاکچاك دەیئاخنم. ئێ خۆ کلاوڕۆژنەکەش هەم شووشەبەندەو، هەم ئێستا تا ئەژنۆیەك بەفری لەسەر کەڵەکەبووە. زانیت چی دەڵێم ؟.

ـ باشباش..ئەوسا ئیتر با تا بەیانی، بەدەوری قەلاکەماندا بسووڕێنەوەو بلوورێنن.

ـ ئا بەڵێ..با هەر کەڵبەشمان لێتیژ بکەنەوە.

ـ ناکرێ..دەنا حەزم دەکرد لەکونێکەوە بیانبینم و، بزانم کەڵبەیان چۆن تیژ دەکەن.

بارام بێدەنگ بوو. قسەکەی ئایشی لەمێشکیدا دەجۆوە. دیمەنی لوولدان و رافڕاندنەکەی بازەی هاتەوە پێش چاو. رووخساری گرژبۆوە. کەکەوتەوە قسە وتی:

ـ من دەیکەم..من دەیانبینم. ئەمجارە من دەزانم چۆن تۆڵەی بازەیان لێدەکەمەوە.

ئایش ئەم قسەیەی لێخۆش نەهات. رەنگوڕووی تاڵ بۆوە. لێیپرسی:

ـ نیازی چیت هەیە؟.

ـ تەنیا جێگەدەستێك بۆخۆم دەهێڵمەوە، کە بتوانم لوولەی دەمانچەکەی لێوە ئاراستەی دەرەوە بکەم. چەندم گولله ماوە، دەبێ هێندەیان لێبکوژم.

ـ بارام..من وای بەچاك دەزانم خۆتیان لێبیدەنگ بکەیت. چاکتروایە هەردوو دەرگای ژوورەکانیش قایم بکەین‌و، وازیان لێبێنین تا ڕۆژدەبێتەوە.

ــ مەترسە..خۆ دێودرنج نین شالاوم بۆ بێنن‌و، هەرەس بەو هەموو کەلوپەلە بێنن.

هەردووکیان بێدەنگ بوون. بارام لەپڕ وریابۆوەو وتی:

ـ خێراکە..با دەستوبرد بکەین. نەوەکوو زوو بێنەوە.

وایان کردو کەوتنە خۆیان. ئایش کەلوپەلەکانی دەگەیاندە ئاستی نایلۆنبەندەکەو، بارام بەدەستوورێکی تایبەتی، توندوتۆڵ کەڵەکەی دەکردن. لەئەنجامدا دیوارێکی کونبڕیان لێپێك هێنان‌و، تەنیا دەلاقەیەکی بچووکیان بەبەرزەوە، بەپاڵ دیواری هەیوانەکەوە تێدا هێشتەوە. ئەوسا خۆیان بەژووورداکردەوەو چوونە وێزەی پەنجەرەکە. ئەویشیان توند تەنی‌و چاك لێی‌دڵنیابوون. لەوەدابوون رووبکەنە ژوورەکەی‌ترو، لوورەی گەلەگورگیان لەدوور بەرگوێ کەوتەوە. راوەستان‌و روانییانە یەکتر. بارام خێرا بزەیەکی خستە سەرلێوی‌و وتی:

ـ با ئەوەندە بلوورێنن، تا قورگیان دەتەقێ. خۆیان دەبیننەوە.

ئیتر ئەو لەسەرخۆ بەرەوژوورەکەی‌تر هەنگاوی‌ناو، ئایشیش بەچراکەوە بەدوایدا. بزنەکان‌و کەرەدێزە، لەهەموو ئەم کەینوبەینە بێئاگابوون. تەنانەت کاتێ ئەمان بەچراکەوە چوونە ژوورەوەو کردیانە تەقەوڕەقە، ئەوان تەنیا سەرێکیان لێبەرزکردنەوەو کەمێ تێیان روانین‌و، کەوتنەوە سەرباری خۆیان. کە لێبوونەوە، بەدڵنیاییەوە گەڕانەوە ژوورەکەی خۆیان. بارام پاڵی‌دایەوەو قاچی لێڕاکێشا. ئایش چوو بەلای منداڵەکانییەوەو، کەوتە دەستهێنان بەسەرورووخسارياندا. لەشیرینخەوێکی خۆشدابوون. وازی لەوان هێناو گەڕایەوە لای بارام‌و لەتەنیشتییەوە دانیشت.

ـ ئێستا دەبێ چایەکە دەمی کێشابێ..

بەبیری هاتەوە. روانییە سەر زۆپاکە. کترییە ئاوەکە دەیلووشکاند. بەڵام قۆرێکە هێشتا، کەمێ دوور لەبەردەرگای زۆپاکەدا دانرابوو. راچەنی‌و چووبەلایانەوە.

<u>دێوو درنج</u>

گەلەگورگ زۆری پێنەچوو پەیدابوونەوە. بەئاشکرا هەستیان پێدەکرا، کە تەواو نزیك بوونەتەوەو، دەوروخولی خانووەکە دەدەن. بارام شانی‌دادابووە سەر سەرینێك‌و پاڵی لێدابۆوە. ئایش وتی:

ـ لەوە دەچێ هاتبنە حەوشەکەوە.

ئەو بەپێکەنینەوە لەوەرامیدا وتی:

ــ دیارە..دەزانن بازەو بارام لەوێ نین‌و، بەئارەزووی خۆیان تەراتێن دەکەن. بەڵام خۆیان دەبیننەوە. باکەمێکی‌تر بێنە پێشەوەو دڵنیابن..بابێنە بەر هەیوانەکەوە، ئینجا دەچمەوە وێزەیان.

ــ من هەر ئەوە بەچاکتر دەزانم، کە دەرگاکەش باش قایم بکەین‌و، وازیان لێبێنین چی‌دەکەن بیکەن. بارام ..ئەمانە لەوە ناچێ گورگ بن. ئەگەر گورگ بوونایە، بەگۆشتی هاوەڵەکەی خۆیان‌و بازە، تێریان دەخواردو لەکۆڵمان دەبوونەوە. یا تەقەکان چاوترسێنی‌دەکردن‌و لەم دەوروبەرە نەدەمان.



ئەو کەمێ لەقسەکەی راما . وەك جۆرە راستییەکی تێدا هەست پێبکا، بەسەرسوڕمانەوە لێی‌پرسی:

ـ ئەی دەبێ چی‌بن؟.

ـ دەبێ دێودرنج بن‌و، خۆیان خستبێتە پێستی گورگەوە.

ـ بەڕاستتە یا بەگاڵتە؟.

ـ وەڵا بەڕاستمە.

ئەوسا بەقسەکەی پێکەنی. لەگەڵ ئەوەشدا نەیهێشت بچێتە قاڵبی گاڵتەپێکردنەوە. وتی:

ـ خۆتۆ باوەڕت بەم بابەتە قسانە نەمابوو. کەچی دەڵێیت گەڕاویتەوە سەر باوەڕپێکردنیان!.

ئایش خۆیشی پێکەنی. وتی:

ـ ئەی دەنازانم بڵێم چی..ئەمانە چۆن گورگێکن؟!.

ـ هیچ بەهەڵە مەچۆ . گورگی زۆر ئاسایین‌و بەڵام، هێجگار برسین‌و بۆتێرکردنی ورگیان، پەلامار دەدەن‌و سڵ لەهیچ شتێك ناکەنەوە. گوایە گورگی دووپێش هەروەها ناکا؟!.

ـ هەمدیسان باتدایەوە سەر بەزمەکەی خۆت؟. فەرموو بزانە بەچ حاڵێکی گەیاندووین. تۆ ئەگەر ئەو خەیاڵە نەیدایە لەکەللەت، بۆ ئاوەها تووش دەبووین؟!.

ئەم قسەیە بۆ بارام زۆر لەناکاوبوو. چاوەڕێی نەدەکرد شتی وەهای لێببیسێ. لەبەرئەوە نەیدەزانی چ وەرامێکی بداتەوە. تا ئایش لەلای خۆیەوە، زوو هەستی‌کرد کە قسەکەی لەجێی خۆیدا نەبوو، بەتایبەتی لەوەختێکی وەها سەختوستەمدا. بۆیە خێرا پەشیمانیی خۆی نیشان داو وتی:

ـ بارام گیان..لێمی بەدڵەوە مەگرە. ئەگەر راستت دەوێ من ترسم لێنیشتوە. من هەناوی ئەو دووانەم کەوتوە. گەلەگورگێکی دڕو برسی‌و لەودیو دیواری ژوورەکەمەوە..بەبەردەمی هەیوانەکەمدا بێن‌و بچن‌و کەڵبە لەمنداڵەکانم تیژبکەن، چۆن نەترسم؟.

ئەو دوای ئەم قسانە، تانووتلێدانەکەی تەواو فەرامۆش کردو، کەوتە هەڵپەی دڵدانەوەو دڵنیاکردنی‌و وتی:

ـ ئێ ئاخر ئەوەتا دەبینیت ژوورو هەیوان کونبڕکراون. ئەوەش من‌و چەکم پێیەو بۆیان لەسەرپێم. واتە ئەگەر دە گەلەگورگیش بن ،هیچیان پێناکرێ‌و هەردەبێ تابەیانی، بەدەوری خانووەکەدا سەرەخوولێیان بێ. ئیتر بۆچی ترست لێنیشتوە؟.

ـ دەزانم..دەزانم..بەڵام بەدەست خۆم نییە. دیواری پۆڵاشمان لەبەیندا بوایە، ئەو ترسەم هەر لێدەنیشت.

ـ باشە قەیناکە..تێدەگەم..خۆ تۆ..

لەوساتەدا تەقەی بەربوونەوەی، یەکێك لەکەلوپەلەکانیان هاتەبەرگوێ. ئایش وەك کێچ راپەڕی‌و بەقەڵەمبازدێك، خۆی گەیاندە پاڵ منداڵەکان. وەك لەناخدا، ترسی شاڵاوێکی لەناکاوی گەلەگورگی راستەوخۆ بۆ ناوژوور لێنیشتبێ‌و، مەبەستیشیان دوو کۆرپەکەی‌بێ، ئاوەها باڵی بەسەردا درێژکردن‌و چاویشی بڕییە دەرگاکە. بارام نەگەیشت دیمەنەکەی ئەو ببینێ. قسەکەی خۆی قووت دایەوەو ئەویش هەر لەگەڵ بیستنی تەقەکەدا، دەستی‌دایە دەمانچەکەی‌و راچەنییە سەرپێ. بەپەلە پێڵاوی لەپێ‌کردو دەرپەڕییە دەرەوە. بەرلەوەی بچێتە دەرەوە، لەبەردەرگاکەدا سەرنجێکی‌دایە کەلوپەلەکان. زوو بۆی دەرکەوت کە لەودیوەوە پاڵیان پێوەدەنرێ. لەوەزیاتر لێی‌رانەما. دەمانچەکەی خستە سەرپێ‌و، خۆی گەیاندە ئاستی جێدەستەکە. ئەو دیمەنەی کەوتە بەرچاوی، هێجگار سەرسامی‌کردو بگرە، خورپەیەکی تیژیشی لەدڵی‌دا. گەلەگورگ ژمارەیان هێندە زۆر بووبوو، کە بۆی نەدەهاتنە ژماردن. تەنانەت لەبینایی خۆی کەوتە گومانەوە. زۆربەیان لەحەوشەکەدا دەهاتن‌و دەچوون‌و، تەنیا پێنج شەشێکیان هاتبوونە بەرهەیوانەکەوەو، بەیناوبەین سەرولمۆزیان پێدادەدا. دەستوبرد بڕیاریدا. لەدڵدا وتی: ( چاکتروایە یەکێك لەوانەی حەوشەکە بپێکم، نەك ئەمانەی ناو هەیوانەکە، تا هەراوئاژاوەی خواردنەکەی دوور بکەوێتەوە. لەبەر ئایش‌و منداڵەکان وا چاکترە..).

نیشانی گرتەوەو پەلەپیتکەی هێنایەوە یەك. گورگ دایە قروسکەو گلا. کەچی هەڵسایەوەو شانبەشانی ئەوانی‌تر هەڵات. زۆر لەتەیمانەکە دوورنەکەوتەوەو بەلادا هات. چاوی تێوەبوو دووسێ‌جار لنگەفرتێی‌کردو خپ بوو. لەدڵدا وای بڕیاردا، چاوەڕێ بکا تا ئەوانی‌تر دەگەڕێنەوە سەری بۆخواردنی‌و، فرسەتی تەقەلێکردنیان بەکۆمەڵ لێبێنێتەوە. بەڵام دەنگی گریانی بەکوڵی ئایش، وازی لەو بڕیارە پێهێناو، بەپرتاو گەڕایەوە ژوورەوە. سەیری‌کرد بەدیار منداڵەکانەوە بەکوڵ دەگری. لەیەکەم ساتدا بەبینینی دیمەنەکە شڵەژاو، دڵی ختوورەی کرد. بەپەشۆکاوییەوە چووە تەنیشتییەوەو لێی‌پرسی:

ـ چی بووە؟!..چ خێریانە؟!.

کە بۆی دەرکەوت ئەوان هێشتا لەشیرینخەوی خۆیاندان‌و، مەسەلە بریتییە لەتەنیا ترسوسامەکەی ئایش خۆی‌و، بەو گریانە دەیڕەوێنێتەوە، کەوتە تەقەلادانی هێمنکردنەوەی. باوەشی پێداکردو بەنیازی دڵدانەوەی بۆی گێڕایەوە کە چۆن یەکێکی‌تری لێکوشتوون‌و، ئەوانی‌تر هەڵاتوون. ئیتر هەرهێندەی ئەوی هێمن کردەوە، هەڵساو چووە دەرەوە. کە بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکەی، بەپەرۆشەوە بۆ شوێنی کەوتنی گورگی کوژراو هەڵیڕوانی، سەرسام بوو. وای هاتە بەرچاو کە لەوێ نەماوە. سەرەتا لەدڵدا وتی: (رەنگە داخزابێتە ناو بەفرەکەوەو نەبینرێ). بەڵام کە باشتر وردبۆوەو هیچی نەدی، وتی: ( خۆش دەباریێ..رەنگە لەم ماوەیەدا هێندەی بەفر لەسەر کەڵەکەبووبێ، کە داپۆشی‌بێ). ئینجا کە زیاتر وردی‌کردەوە وتی: ( نا..لەوەدەچێ لەماوەی چوونەژوورەوەکەی مندا، تینی‌دابێتە بەرخۆی‌و هەڵاتبێ‌و لەدوورتر کەوتبێ).

کێشەکەی وەها شکاندەوە، کە پتر ئەم بۆچوونەی لەلا بەجێ‌بێ. بەڵام پەیدابوونەوەی گەلەگورگ لەو دەمەداو بێدەنگییان، سەری لێتێك دا. لەو وەختەدا دەبوو هیچ نەبێ، نیشتبنە گیانی گورگی کوژراو. چونکە نەدەچووە ئەقڵییەوە لە هەڵاتنەکەیدا، لەچنگیان دەربازی بووبێ. سەرلێتێکچوونەکە بۆ ماوەی ساتەوەختێك، بیروهۆشی شڵەژاند .لەدڵدا وتی: ( سەیرە..تۆ بڵێیت قسەکەی ئایش راست بێ ؟. دەشێ ئەمانە دێوودرنج بن؟. ). خێرا وتی: (نا..دیارە دەبێ هێشتا لەو شوێنەدابێ‌و، داخزابێتە ناو بەفرەکەوە. ئا..لەوە زیاتر نییە). بڕیاریدا چاوەڕێ بکا تا دەگەنە ئاستی‌و، باسەکەی تەواو بۆ روون دەبێتەوە. زۆری نەبرد بەخۆی زانی، کە پاڵتۆکەی لەبەردا نییەو سەری قۆتییەو سەرما تەزاندوێتی. بەناچاری گەڕایەوە ژوورەوە.

ئایش هێشتا لەپاڵ منداڵەکاندا، خامۆش دانیشتبوو. لەگەڵ چوونەژوورەوەی ئەمدا، تەنیا

سەرێکی بەرزکردەوەو سەیرێکی‌کردو هیچی نەووت. ئەم بەپەلە پاڵتۆکەی لەبەرکردو، جامانەکەی لەسەرو ملییەوە پێچاو بەدەرکەوتەوە. کە گەیشتەوە شوێنی خۆی، روانی وا گەلەگورگ بەرێزو بەڵام، هەریەکەیان دوور لەوی تەنیشتی بەسێ چوار هەنگاو،دەهاتن‌و گەیشتبوونە نزیک شوێنی لاشەی گورگی کوژراو. ئەمجاریش سەری سورما. لەوە کەوتەوە گومانەوە، کە ئەو جۆرە هاتنەیان وابگەیەنێ، لاشەکە لەجێی خۆیدا نەمابێ. سەرلەنوێ بیروهۆشی شڵەژا، بەتایبەتی کە سەیری‌کرد وا گەیشتنە شوێنەکەو، لێی‌تێپەڕین‌و هیچ رووی نەدا. چەندە لێکی‌دایەوەو هێنای‌و بردی، سەری لێدەرنەکرد. هێجگار تەنگەتاو بوو. نەیدەزانی چی بکاو چ بڕیارێک بدا. وای هەست دەکرد کە مێشکی لەکارکەوتووە. تا لەناکاو وەک لەقوولایی ناخدا بڕیارێکی‌دابێ‌و هێشتا لەلای روون نەبووبێتەوە چییە، دەمانچەکەی بەرزکردەوەو بێنیشانگرتنەوە، گوللەیەکی تەقاند. سەرلەنوێ ریزی گەلەگورک رەوییەوەو پەرتوبڵاو بەرەودواوە هەڵاتن‌و لەبەرچاوی ون بوونەوە. ئەمیش وەک ئەوە بەفرسەتێک بزانێ‌و، بیەوێ بچێ پشوویەک بداو بیرێکی قووڵی لێبکاتەوە، راستەوخۆ وەرچەرخاو کشایەوە ژوورەوە.

تەناف

لە ژوورەوە بێئەوەی بڕوانێتە ئایش‌و منداڵەکان، هەر بەپێوە بۆ خۆگەرمکردنەوە، پشتی‌کردە زۆپاکەو چاوی بڕییە دەرگای ژوورەکە. دیاربوو کە سەراپای بیروهۆشی، ئالاندۆتە گەڕان بەدوای چارەسەرێکی بەپەلەدا. ئەنجامیش هەر وەها کەوتەوە. چاوی لەدەرگاکەلاداو، بەخێرایی بەژوورەکەیدا گێڕا. تەنافی جلهەڵخستنەکە سەرنجی راکێشا. دەتووت کلیلی شکاندنی تەلیسمێکی ستەمی بینیوەتەوە. پەلاماری‌دایەو لەهەردوو سنگی دیواری ئەمبەرو ئەوبەری ژوورەکەی‌کردەوە. لەمشتی‌دا گرمۆڵەی‌کردو، دەرپەڕییەوە ناوهەیوان.

ئایش کە بەبێدەنگ تێی‌دەڕوانی، لێی‌سەرسام بوو. خۆی پێڕانەگیراو بەدوایدا چووەدەرەوە. ویستی بپرسێ کە ئاخۆ چی دەکاو ئەو بواری نەدا. وەک فەرمانێکی زۆر پەلەی پێبکا، وتی:

ـ بچۆ قەڵەمبڕەکەم بۆبێنە..خێراکە..

لێی‌نەپرسی بۆچییەتی. بەفڕکانێک چوو هێنای‌و دایە دەستی. زیاتر سەرسام بوو کە بینی، وا بەنووکەکەی بەربۆتە ناوەڕاستی دەرگاکەو هەڵیدەکۆڵێ!.. بەپەرۆشەوە لێی‌پرسی:

ـ ئەوە چی‌دەکەیت؟!.

لەوەرامیدا تەنیا وتی:

ـ دوایی دەزانیت..با لێبمەوە بۆتی باس دەکەم.

زۆری‌نەبرد کونێکی بچکۆلەی تێکرد. سەرێکی تەنافەکەی پێدا رەتکردە ژوورەوەو وتی:

ـ بابچینەوە ژوورەوە.

لەوێ دەستی‌دایە بڕەدارێک‌و وتی:

ـ بڕوانە..سەری ئەولای تەنافەکەم توند بەستوە، بەئەڵقەی بنەوەی ئەڵقەڕێزی دەرگای ئەوبەرەوە. ئەمسەریشی ئەئاوەها لەناوقەدی ئەم بڕەدارە گرێ‌دەدەم‌و، لە دەرگاکەی توند دەکەم. ئەوسا ئیتر ئەگەر هەموو گورگی دنیا، سەرولمۆز لەم دەرگا یا لەویان گیربکەن‌و بیانەوێ بەپشتیاندا بخەن، هیچیان بۆ ناکرێ. چونکە پاڵ بەویانەوە بنێن ئەمیان راگیری‌دەکاو، بەمیانییەوە بنێن ئەویان راگیری دەکا. ئیترسا مەگەر تەنافەکە بپچڕێ‌و، تەنافیش خۆت دەزانیت چەندە قایمە. ئێستا بۆت روون بۆوە چیم کرد؟.

ئایش وەک گوڵ گەشایەوە. دەتووت ئەو ئایشەی چەند ساتێک لەوەبەر نییە، کە رووناکی لەرووخساریدا نەمابوو. بەدەم بزەیەکی گەشەوە وتی:

ـــ دەست خۆش..هەرچەندە دڵم هەر دەگوشرێ، ئەوە بێنمەبەرچاوم، کە هاتبنەوە ناو هەیوان‌و سەرولمۆزی خۆیان بەدەرگاکەدا بدەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەی کردت زۆر دڵنیام دەکا.

پرپشکی گەشانەوەکە ئەویشی‌گرتەوە. ئەویش رووخساری روون بۆوەو وتی:

ـ ئەمە دواچارەسەرمان دەبێ بۆ خۆپاراستن لەشاڵاویان. دەزانیت خەریکم باوەڕ بەقسەکەت بێنم، کەئەمانە گورگ نین‌و دێوودرنجن؟!.

ـ چاوت لێیە؟..ئەی خۆ من لەخۆڕایی ئەو قسەیەم نەکرد.

ـــ لەسەرمی مەکە بەماڵ. وتم خەریکم باوەڕبێنم، نەک باوەڕم هێناوە.

ـــ دەی خوابکەم من بەهەڵەچووبم‌و قەت وانەبێ.

ـ تۆ واز لەوە بێنە..من دەمەوێ بزانم ئاخۆ..

قسەکەی تەواونەکردو دیسان، تەقەی بەربوونەوەی کەلوپەلیان هاتەوە بەرگوێ. دیسان بەپەلە خۆی گورج کردەوە. دەستی‌دایەوە دەمانچەکەی‌و قەڵەمبازدی‌دایە دەرەوە. بەپرتاو خۆی گەیاندە شوێنڕوانگەکەی. بەڵام ئانوسات وەک دەرزییەک بەبنی نینۆکیدا کرابێ، ئاوەها راچەنی‌و سڵەمییەوە. دیمەنەکە هێجگار سەرسوڕهێنەرو سامناک بوو. سەیری‌کرد گەلەگورگ هەموو لەبەردەمی هەیواندا، لەودیو نایلۆنبەندەکەوە بێهیچ ترس‌و سڵکردنەوەیەک، گردبوونەتەوەو بەیەکدادێن!..بەتایبەتی کەبینی وا هەندێکیان بەئەنقەست، رووەو ئەم لمۆز هەڵدەبڕن‌و کەڵبە جیڕەکەنەوەو، بەئاشکرا دەیانەوێ پێی‌بڵێن: ( بۆکوێ دەچیت؟!. ئەمشەو بەهیچ کلۆجێک گیان لەچنگمان دەرناکەیت!). ئەو هەستە تەواو زۆری بۆهێنا. لەوەدابوو بەدەستووری جارەکەی‌تر کەللەیی ببێ. چی گوللە لەشانەی دەمانچەکەیدا ماوە، تیایاندا بەتاڵی بکاتەوەو دانی بەخۆیداگرت‌و نەیکرد. بەڵکوو نیشانەی لەیەکێک لەوانە گرتەوە، کە رووەو ئەم لمۆزیان هەڵبڕیبوو. پەنجەی پێداناو گورگە لەشوێنی خۆی، بەلادا هات‌و کەوت. ئەم لەلای خۆیەوە چاوەڕێ‌بوو گەلەگورک، بنیشنەگیانی‌و ونجڕونجڕی بکەن‌و بیخۆن. کەچی هیچ شتێک لەم بابەتە رووی‌نەدا. تەنیا کردیان بەژێر دەستوپێوەو، زۆر ئاسایی لەسەر شاڵاوهێنانەکەیان بۆناو هەیوان بەردەوام بوون. ئەم هەر ئەوەبوو ئەقڵی تێک نەچێ!. لەبەرخۆیەوە وتی: (نابێ..قەت نابێ!...قەت شتی وا نابێ!). لەوەدابوو دەنگ هەڵبڕێ‌و بیکاتە هاتوهاوار. زوو لەخۆی بەئاگاهات‌و تەنیا وتی: (ئایش راست دەکا..گورگ نین..ئەمانە گورگ نین!).

لەوساتەوە ئیتر، گەلەگورگی لێبوونە گەلەدێوودرنجێک، کە لەهیچ شتێک کۆنەکەنەوە. تەقەیەکی‌تری لێکردن‌و یەکێکی‌تری لێخستن. ئەویش وەک ئەوەکەی پێشوو، کەوتە ژێر دەستوپێوە. بگرە سەیری‌کرد بەدوایدا، شێتگیر بوون‌و وەک گەردەلوولێک، کەوتنە تەکاندان بەنایلۆنبەندەکە. لەئەنجامیدا کەلوپەلەکان

لەقەلەقیان پێکەوتو، ئەوانەی سەرەوە هەندێکیان لێبەربوونەوە. گەرای ترسێك لەناخیدا سەری هەڵدا. وای هێنایە پێش چاو کە هائێستا هاساتێکیتر، هەرەس بەکەلوپەلەکان دێنن. نایلۆنبەند شڕووڕدەکەنو، شالاو دێننە هەیوانەوە، کە ئەوسا ئیتر کارلەکار دەترازێ. فریاناکەوێ خۆی بگەیەنێتە ژوورەوەو، دەرگاکە قایم بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا وای بەبیرداهات، کە لەبەردانەوەی کەلوپەلەکانو کەڵەکەکردنەوەیاندا، لەگەڵیاندا بکەوێتە زۆرانبازی. بەڵام زوو بۆی دەرکەوت کە ئەوە، کارێکی بێهوودەیەو دەرەقەتیان نایەت.

لەم کەینوبەینەدابوو کە ئایشیش لەلای خۆیەوە، تاقوتۆقی بەربوونەوەی کەلوپەلەکانی کەوتبوە بەرگوێو، سەری لەدەرگاوە کێشابووە دەرەوە. کە بەڕوانینێکی خێرا بۆی دەرکەوت چی روودەدا، هەڵمەتیبردو خۆی گەیاندێ. پڕیکرد بەقۆڵیداو بەڕاکێشان رایفڕاندە ژوورەوە. ئەم وەك ساتی جێبەجێکردنی بڕیارەکەی پێشووی تەواو نزیك بووبێتەوە، خۆی بۆ راکێشانەکەی شل کرد. هەرهێندەی ئاودیوی دەرگابوون، پڕی بەبڕدارەکەداکرد. سەری تەنافەکەی چاك ئالاندە ناوەڕاستیو، لەدەرگاکەی چەسپاندو توند گرێیدا. کە باش لێیدڵنیابوو، دووقۆڵی چوونەوە بەرزۆپاکەو هەربەپێوە، کەوتنە خۆگەرمکردنەوە. هیچیان قسەیان نەکرد. هەردووکیان لەدڵدا لەگەڵ خۆدا دەدوان. ئایش دوای کەمێ چۆوە تەنیشت منداڵەکانیو، خامۆش دانیشت. بارامیش باری راوەستانەکەی گۆڕی. پشتیکردە زۆپاکەو ، بینایی بەسەر دەرگاکەدا روا.

<u>شالاوی گورگ</u>

(..کات!..تێپەڕبوونی کات تاکە چارەسەرە!. هەر کە شەبەقیدا، ئیتر وەلدەبنو لە کۆڵمان دەبنەوە. مەگەر بەوە ئەم بەسەرهاتەمان کۆتایی پێبێ. دەنا هیچ چارەسەرێکیترمان لەبەردەمدا نییە. ئەی ئاخۆ سەعاتمان بەچەند گەیاندبێ؟). بینایی لەدەرگاکە هەڵپچڕیو روانییە سەعاتەکەی. کات خۆیدابوو لەچوار چارەکێك کەم. وەك بیەوێ مژدەیەکی خۆش بەئایش رابگەیەنێ، لایکردەوە بەلایداو وتی:

ـ چوار چارەکێك کەمە..هێندەمان نەماوە.

ئایش لەوەدابوو دەم هەڵبێنێتەوەو، تاقوتۆقی هەرەسهێنانی کەلوپەلەکان، زمانی بەستو ورتەوجووڵەی لێبڕی. بارامیش کە هێشتا لەبەرزۆپاکەدا راوەسابوو، خۆی قیت کردەوەو گوێقولاغ بوو. کە بۆی دەرکەوت وا گەلەگورگ، کەڵبەو چنگونینۆك لە نایلۆنبەندەکە گیردەکەنو دەیدڕێنن، گومانی نەما کە هائێستا هاساتێکیتر، شالاو دێننە هەیوانەوە. لەگەڵیدا شانبەشانی ئەو بێگومانییە، گومانێکیش لەقوولایی بیروهۆشییەوە سەریهەڵدا. گومانەکە وەك کێچ هەڵیبڵووقاندەوەو، رایفڕاندە ئاستی دەرگاکە. بەپەلەپڕووزێ دەستی لەبڕەدارو پێچی تەنافو توندوتۆڵیی گرێکانی کوتا. کە چاك لێیدڵنیابوو، وازیلێهێناو گەڕایەوە تەنیشت زۆپاکە.

زۆریپێنەچوو گەلەگورگ رژانە هەیوانەوەو، بەپێچەوانەی جارانی پێشوویانەوە، کە پتر بەبێدەنگ هێرشیان دەهێنا، کردیانە مرمڕو غەڵبەغەڵبو ئینجا، چنگەکڕیو سەرولمۆزنان بەهەردوو دەرگاوە. سەرنجیدا تەگبیرەکەی پڕ بەپێست، جێی خۆی گرتوە. دەرگا دەڕەتێنریو لەقەلەقی پێدەخریو، تەنافو بڕدار توند راگیری دەکەن. لایکردەوە بەلای ئایشدا ئاگاداریبکا. سەیریکرد خۆی بەسەر منداڵەکاندا نوشتاندۆتەوەو دەکڕووزێتەوە. دیمەنەکە چەندە دڵتەنگیکرد، هێندەش وریایکردەوە. کە روانییەوە دەرگاکە لەدڵدا وتی:( ئەی ئەگەر تەنافەکە پچڕاو دەرگایان بەمدیودا داڕماند؟!. ئەی ئەگەر شالاویان هێنایە ژوورەوە؟!.یانی..). قسەکەی تەواو نەکرد. بێچاولادان لەدەرگاکە، وەك لەبەرخۆوە بدوێ وتی:

ـ ئایش..چاکتروایە بیتەنین..ئەویش باش بتەنینو وەك پەنجەرەکەی لێبکەین.

بەدوایدا چاوێکی بەژوورەکەدا گێڕاو بێچاوەڕوانکردنی وەرام، چوو بەلای بڕەدارەکانەوە. دەستیکردە هاویشتنیان بۆلای دەرگاکە. کە لێبۆوە، خۆشی چوو بەرامبەری راوەستا. بەچاونا، بەبیروهۆش گەلەگورگی دەبینی چۆن لەهەیوانەکەدا بەیەکدادێنو، بگرە چۆن پاڵەپەستۆی سەرولمۆزکێشان، بەم دەرگا یا بەویاندا دەکەن. کە بەچاوی بیرەهۆش ئەم دیمەنەی دەبینی، بەسەرێك دڵی دەکەوتە لەرزەو بەسەرێکیش، تەنینی دەرگاکەی لێدەبووە کارێکی پێویستی زۆر بەپەلە.

بەڵام چی بکاوچۆنی بتەنێ؟!.. (بڕەدارەکان؟.. دەبێ سوودیان چی بێو چۆنیان بەکاربێنم؟). ئەوساتەی چوو گواستنییەوە بۆ بەردەرگاکە، هیچی لەم بارەیەوە بڕیار نەدابوو. بیری لێکردەوەو نەگەیشتە ئەنجام..( کورتن..لەمبەرو لەوبەر گیرنابن!..سوودیان نییە). ئەوەی وازلێهێنا. (چییترمان کەلوپەل لەژوورەکەدا ماوە؟). چاوی گێڕایەوە. (هیچ..راخەرەکانو نوێنەکانو هەندی قاپوقاجاغ..کتریو قۆریو پیاڵەکانیش. باشە چییان لێبکەم؟!).

گەلەگورگ دووسێ تەکانیتریان بەدەرگاکەدا. ئەمیش دووسێ جار دڵی خورپەیکرد. خورپەکان دەروونیان هێنایە ژەنگوژار..(..کە دەرگا بەمدیودا داڕما، هورووژم دێننە ژوورەوە!..کە هورووژمیان هێنایە..).

ئەگەرچی قسەکەی تەواونەکرد، بەڵام ئەوساتە جەستەی وەك بینی ئاو دەلەرزیو، سەروروخساری ئاگریان لێدەبۆوە. وەك بڵێیت لە غەیبەوە پێیڕاگەیەنرابێ، راستەوخۆ بیری بۆ هێزی شانوباهووی چوو..(..دەرگاکەش تەختەدارگوێزێکی ئەوتۆیە، کە چنگوکەڵبە کاری تێناکەن). سێودووی لێنەکردو هەڵمەتیبردە ناو دەرگاوە. هەر چوارپەلی لەمبەرو لەوبەری دیوار گیرکردو، پشتی پێوەنا. دەرگای توند چەسپاندە چوارچێوەوەو جووڵەی لێبڕی. کە بەدوایدا یەکەم تەکانی سەرولمۆز، بەپشتیدادراو هەستیکرد لەئاستیدا زاڵە، گەلێ پێیخۆشحاڵ بوو. لەدڵدا وتی:(چی لە منە؟..تا رۆژدەبێتەوە لەسەر ئەم بارە دەوەستمو، فزەی بۆ ناکەم).

ئایش کە تا ئەوساتە تەنیا خۆی ئاخنیبووە پاڵ منداڵەکانەوەو، چاوێکیشی هەر لەلای بارام بوو، لەپڕ پەنجەرەکە سەرنجی راکێشاو یەکەمجار لەدڵدا وتی: (دەرگاکە وەها..ئەی پەنجەرەکە؟!..). ئەوسا دەنگی هەڵبڕیو بەشڵەژاوییەوە وتی:

ـ بارام..ئەی پەنجەرەکە؟!..ئەی ئەگەر لەوێوە!..

قسەکەی بۆ تەواو نەکراو، بینایی بەسەر پەنجەرەکەدا ئەبڵەق بوو. بارامیش لەلای خۆیەوە، وەك لەناکاو لەمەترسییەکی زۆر زەق ئاگادار بکرێ، چاوی بەسەریدا رواو لەدڵدا وتی: ( بەڕاست یانی چی من تا ئێستا لێی بێئاگابووم؟!. زۆر راستە..دەزانم کە بەفر لەودیوەوە بەریگرتوەو، لەگەڵ گوێسوانەکەدا لەیەکیان داوە. بەڵام خۆ بۆشاییەك لەنێوان دیوارو بارستایی بەفرەکەدا ماوەتەوەو، لەسەری لای هەیوانەکەوە شەبەقێکی تێدایە، کە بوار بۆ



ناو بۆشاییەکەو ئینجا بەرپەنجەرەکە دەدا!. من لەوە دڵنیام. ویستم بۆ رووناکی بەری پەنجەرەکە بەرەڵابکەمو لەوێشەوە دەست پێبکەم. کەچی وازم لێهێنا. وتم وا چاکترەو سەرما دەگێڕێتەوە. کەواتە دەتوانن لەوێوە بێنە بەرپەنجەرەکە. دەبێ فریابکەوم. پەنجەرەکە بەو وەزعەیەوە، لە ئاستیاندا خۆی راناگرێ. چی بکەم باشە؟!).

نەیدەزانی چی بکا!. چاوی لێلاداو روانییە ئایش. ئەویش هێشتا چاوی بەسەریدا روابوو. ئەم بیری بۆ ئەوەچوو، داوای لێبکا بچێ وەکوو ئەم بکاو، زوو لێی پەشیمان بۆوە. لەدڵدا وتی (شووشەیەو دەیشکێنن. کە شووشەیان شکاند، ونجڕکردنو دەرکێشانی کەلوپەلەکانیش بۆ دەرەوە بۆیان ئاسانە).

بەخێرایی کەوتە چاوگێڕان بەژوورەکەدا. بەئاواتەوەبوو شتێك لەوانەی تێدامابن. یا تەنانەت دیوارەکانو بنمیچەکەش بەفریای بکەونو، چارەسەری گرفتە نەگریسەکەی بۆ بکەن. تا لەناکاوێکدا سەرنجی لەسەر زۆپاکەو، بەتایبەتی لوولەکانی راگیرکرد. لەسەری

ـ ئایش..هەڵسە خێراکە..زۆپاکە بکوژێنەرەوە.

ئایش سەرسام بوو. وتی:

ـ بۆچی؟!.

ـ تۆ هەڵسە..دوایی..خێرا سەرەبزووتکەکانی لێدەربێنەو بیانکوژێنەرەوە.

ئایش دەستوبرد چۆنی پێووترا وەهای‌کرد.

ـ چاوەڕێی ساربوونەوەی مەکە. بەپەڕۆیەك پارچەکانی لوولەکەی لێدابگرەو ئاویان پێدابکە.

لوولەکان سێ پارچەبوون. بارام حسابی بۆ درێژییەکەیان کردبوو. بڕیاریشی‌دابوو کە چییان لێدەکاو وتی:

ـ وەرە جێگای من..دەتوانیت؟.

ـ دەتوانم.

ـ ترست نەبێو لەچنگەکرێیان سڵ مەکەرەوە. تۆ وا هەست دەکەیت لەوەدایە لە پشتتی گیربکەن. بەڵام وا نییە. مەترسەو بەرگە بگرە. داریگوێزەو هیچیان لەئاستیدا ـ ئێ.

جێگەیان گۆڕییەوە. بارام چوو پڕی بەپارچە لوولەکانداکردو، رایفڕاندنە لای پەنجەرەکە. حسابەکەی راست دەرچوو. بەپەلە کەلوپەلەکانی لەپەنجەرەکە دەرکێشایەوە. بەزۆر لوولەکانی وەك سێ توولْ لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لەپەنجەرەکە چەسپاندن. سەرنجێکی وردی بەپەلەی‌دانێ. دڵی پێیان حەوایەوە. لەگەڵ چوارچێوەی پەنجەرەکەدا، بووبوونە تەیمانێکی توندوتۆڵ. ئینجا کەلوپەلەکانی تێئاخنییەوەو بۆ تاقیکردنەوە، دانیشتە سەر قەراغی پەنجەرەکەو، پشتی پێوەنا. ئەوسا بەئایشی وت:

ـ بینیت؟..ئەمەش پەنجەرەکە. هیچی‌تر ماوە؟. مەگەر دیوارڕووخێن بن، دەنا ژوورەکە لەدیوار بەولاوە، هیچی‌تری تێدا نییە.

دوای قسەکەی پشتی لەپەنجەرە بەردا. چۆوە بەلای دەرگاکەوەو وتی:

ـ لاچۆ بۆ من..

کە پشتی بەدەرگاوە نایەوە، بەهێمنییەوە وتی:

ـ گوێ بگرە..ئێستا چیت پێدەڵێم وەها بکە. یەکەمجار بچۆ منداڵەکان زۆر باش داپۆشە. ئینجا هەرچی راخەرێك لەژوورەکەدایە، جگە لەوەی ژێر

منداڵەکان، بۆمیان بهێنە. لەپاڵ دەرگاکەدا کەڵەکەیان دەکەمو لەسەریان دائەنیشم. دواجار تۆش لێفەکە چاک لەخۆتەوە بپێچەو بچۆ وەک من، پشت بەپەنجەرەکەوە بنێو دابنیشە.

ئایش هەستی بەدڵنیاییکردو زۆری پێخۆش بوو. گورج ئامۆژگارییەکانی جێبەجێکردن. بەڵام پێش خۆپێچانەوەو دانیشتنی، ویستی زۆپاکە لەبارام نزیک بکاتەوە، تا بەپشکۆکانی گەرمی ببێتەوەو بارام نەیهێشت. وتی:

ـ بیبەرە نزیکی خۆتەوە. تۆ پێویستیت زیاتر پێیەتی.

دوای کەمێ مشتومڕ، قسەی بارام زاڵ بوو.

لمۆزی گورگ

هەردووکیان ئەگەرچی جۆری دانیشتنەکەیان ماندووی دەکردن و ئازاری دەدان، بەڵام ئەو سرەوت و ئارامەی لەدڵدا هەستیان پێدەکرد، وای لێدەکردن بەئاسانی دان بەخۆیاندا بگرن. بارام سەرەڕای بەردەوام ڕەتاندنی دەرگاکە بەپشتیدا، جگەرەیەکی بەلێوییەوەنابوو. بەدڵنیاییەوە مژیلێدەداو بەدەمییەوە، ئاسایی بۆ ئایش دەدوا. باسی لەوەزعی خەڵکەکەی ناو ئاواییبوو، کاتێ ئایش قسەکەی پێبڕیو هاواریکرد:

ـ هاتن!..ئێرەشیان پێزانی..هاتن!.

بارامیش وازی لەقسەکەی هێناو وتی:

ـ چی دەکەن؟..بۆمی باس بکە.

ـــ هەست دەکەم بەبەرپەنجەرەکەدا دێن و دەچن و، جارجارێک یەک دووانێکیان، سەرولمۆزی پێدادەدەن.

ـــ هیچ گوێی مەدەرێ..هەمان بەزمەکەی دەرگاکەیە!. هیچ مەترسە..دەترسیت؟.

ـ نا..ناترسم..لەپەنجەرەو لەدەرگاکەش ناترسم.

ـ ئەی؟!.

ـ نازانم..لەشتێک دەترسم کە نازانم چییە!.

ـ ئایش گیان..خۆت مەشڵەژێنە..یانی مەبەستم ئەوەیە بڵێم خۆت مەترسێنە. تۆخۆت دەترسێنیت. تۆ دڵنیایت کە هیچیان بۆ ناکرێو ناتوانن زەفەرمان پێبەرن. ئیتر بۆچی دەهێڵیت ترس زۆرت بۆبێنێ؟!.

ئایش هیچ وەرامێکی نەبوو بیداتەوەو خۆی بێدەنگ کرد. ئەو بۆ زیاتر هێمنکردنەوەی، وتی:

ـــ کاتمان گەیاندوە بەنزیکی سەعات پێنج. هێندەمان نەماوە. هەرهێندەی شەبەقیدا، ڕزگار دەبین. تین بدەرە بەرخۆتو وره بەرمەدە. ئەوەتا دەبینیت چۆن ژوورەکەمان لێکونبڕکردوون. خۆ دیوارەکان کون ناکەن!.

ئەو ئەم قسانەی لەناخی دڵەوە بۆکردو، خۆیشی ئەمە هیوای هەرەگەورەیبوو. کەچی لەپڕێکداو بێهیچ هۆیەکی ئاشکرا، پرسیارێک لەمێشکیدا بروسکەیدا: (ئەی ئەگەر شەبەقیداو بەرۆکیان بەرنەداین؟!.. بگرە!..)،لەوەدابوو بدا بەدەمییەوەو کسپەیەک، دای لەهەناویو ئازارێکی وەهای پێگەیاند، کە پتر لەپێچی ئازاری ژانەسک دەچوو. تەنانەت ئایش لەلای خۆیەوە کە لەوساتەدا، بەدەم وشکە خۆشنوودییەکەوە تێیدەڕوانی، کسپەی ئازارەکەی لەشێواویی ڕووخساریدا خوێندەوەو هاواری کرد:

ـ بارام..چ خێرتە؟!.

بارام زوو خۆی ئاساییکردەوە. گەندەبزەیەکی خستە سەرلێویو وتی:

ـ هیچ نییە..وا تێدەگەم سەرما کاری تێکردووم. پێچی ژانێکی تیژ بەناو سکمدا رابورد.

ئایش پشتی لەپەنجەرەکەبەرداو خۆی خستە سەرپێ. بێئەوەی بزانێ دەیەوێ چی بکا، بەرەورووی هەنگاوی نا. ئەو نەیهێشت بگاتە ئاستیو وتی:

ـــ هیچ نییە..تەنیا پاکەتو شقارتەکەم بگەیەنەرێو، خێرا بگەڕێوە جێی خۆت.

کە گەڕایەوەو دانیشتەوە، وای هەست کرد ئەودیو پەنجەرەکە خامۆشە. ماوەیەک چاوەڕوانیکردو هیچی نەووت. نەیدەویست تاتەواو دڵنیا دەبێ بیدرکێنێ. کە هەرگوێی هەڵخستو هیچ ورتەوجووڵەیەکینەبیست، ئەوسا بەدەنگێکی تێکەڵ لەگەشکەداریو سەرسوڕمانەوە وتی:

ـ بارام..جموجووڵیان نەما!..ئەودیو پەنجەرەکە تەواو خامۆشە!.

ـ منیش..لای منیشەوە وەهایە!..سەیرە!..

بارام بەپەرۆشەوە ئەم وەرامەی دایەوەو بەدوایدا، بەخێرایی دەستی چەپی بەرزکردەوەو ڕوانییە سەعاتەکەی. لەو کارە زۆر سەرسام بوو. لەدڵدا وتی: (سەعات پێنجو شەش حەوت دەقیقەیە. گوایە دەبێ شەبەقیدابێ؟!. نەخێر نابێ!..قەت نابێ. من ئەگەرچی لەئایشو لەخۆشم دەکرد بەسەعات شەش، بەڵام ئەوی ڕاستیبێ لە دەوروبەری شەشو چارەکدا شەبەق دەدا).

ـ تۆبڵێیت شەبەقی دابێ؟!.

ئایش بەم پرسیارە ورییاکردەوە. ئەو بێوەرامدانەوەی، پشتی لەدەرگابەرداو هەڵسا ڕووی بۆ وەرگێڕا. ویستی زوو بۆی روون ببێتەوە. چاوی چەپی نووقاندو چاوی ڕاستینا، بەو کونەوەی تەنافەکەی لێوە ڕەت کردبووە ژوورەوە. بۆی دەرکەوت کە هێشتا تاریکستانی ئەموستەچاوە. ئەوە گومانێکی گەورەی لەدڵدا خوڵقاند. ئیتر وەک بڵێیت گەلەگورگ نەک بیانەوێ تەنیا لەدەرگاو پەنجەرەوە، بەڵکوو لەدیوارو لەژێرزەویو لەبنمیچی ژوورەکەشەوە شاڵاو بێننە ژوورەوە، ئاوەها دانیشتەوەو پشتی لەدەرگا توندکردەوە. بەدەنگێکی پڕ لەشڵەژانیشەوە وتی:

ـ ئایش پیلانە!..پیلانەو هیچیتر!. باوەڕ بەو بێدەنگییەیان مەکە. پشت لەپەنجەرەکە توندبکەو بەهیچ کلۆجێ بەری مەدە. من دەزانم..

ویستی لەسەری بڕواو باش بیسەلمێنێ کە پیلانە. بەڵام کە سەیریکرد ئایش بەقسەکانی دەپەشۆکێ، خێرا زمانی خۆی گرتو باسەکەی گۆڕی. وتی:

ـــ من ئەگەرچی دەزانم کە هێشتا، نزیکی سەعاتە وەختێکی ماوە شەبەق بدا، بەڵام ڕەنگە بێزاربووبن و ڕۆیشتبن. ئەمەشیان دەبێ و خوابکەم وابێ.

ئایش هێشتا قسەکانی پێشووی لەمێشکیدا دەجۆوەو، لەگەڵ ئەوەشدا وتی:

ـ خوابکەم..

ئینجا ئەو هەر بۆ سڕینەوەی شوێنەواری قسەکانی پێشووی ، باسەکەی گۆڕیو بەلەرەی دەنگێکی پڕ لەسۆزو بەزەییەوە وتی:

ـ باری دانیشتنەکەت ماندووی نەکردوویت؟.

ئەگەر دەزانیت ناڕەحەتە، باچارەسەرێکی بکەم.

ـ نا..پێویست ناکا..باشە. بەڵام قاچم سڕبووە.

ـــ تۆزێ بیانجووڵێنە..یا بەنۆرە قورساییان بخەرەسەر.

ـ ژوورەکەش خەریکە تەواو ساردەبێتەوە.

ـ ئەگەر سەرماتە، با پاڵتۆکەمت بدەمێ لەبەری بکە.

ـ خەمی خۆم نییە..منداڵەکان!.

ـــ خەمی ئەوانیشت نەبێ. گەرم داپۆشراونو لەشیرینخەوی خۆیاندان. من تەنیا خەمی ئەوەمە خەبەریان ببێتەوە.

ـــ ڕاست دەکەیت..ئەگەر خەبەریان بۆوە چیبکەین؟!.

ـ نازانم..خوابکەم خەبەریان نەبێتەوە.

بۆ ماوەی چەند ساتێک هەردووکیان بێدەنگ بوون. بارام جگەرەیەکی ئاگرداو کەوتە مژێدانی.

تەووژمی ترسەکە لەبیرەوهۆشیدا ڕەویبوو. زۆر بەهێمنییەوە مژی لەجگەرەکەدەداو، بەهێواشی دووکەڵەکەی لەنێوان هەردوو لێوییەوە دەردەدایەوە. ئایشیش ئەگەرچی بڕیاریدابوو بەسات پشت لەپەنجەرەکە بەرنەدا، کەچی هێندە هێور بووبۆوە، کەبیری بۆئاگری زۆپاکەی بەردەمی بچێ. دەستی بۆ مقاشی سەر زۆپاکە درێژکرد. کە زانی بێپشتبەردان لەپەنجەرەکە دەستی نایگاتێ، ناچار لێیبەرداو مقاشی گرتەدەستو لەئاگرەکەی وەردا. ئاگر رووڵەوەبوو بێتە ژیلەمۆ. لەگەڵ ئەوەشدا شەپۆلێك گەرمای بەرووپداداو، ئیتر مقاشی نایەوە جێی خۆیو، پشتی لەپەنجەرە تەندکردەوە. ڕوانییە بارامو سەیریکرد، هێشتا هەر بەخۆشنوودییەوە مژ لەجگەرەکەیدەدا.

## پیلان

خامۆشییەکە زۆری نەخایاندو، بارام چۆنی بۆچووبوو وەها دەرچوو. گەلەگورگ کاتێ ڕژانەوە ناو هەیوانو بەرپەنجەرە، وەك شێتوهاربووبن بەداخلەدڵییەوەو دەستەدەستە، کەوتنەوە سەرولمۆزکێشان بەدەرگاو پەنجەرەداو، تەنانەت دەتووت لەوە بێ باکن، کە سەرولمۆزیانی تێدا شەقوپەق ببێ. هەردووکیان تەووژمی ترسوسامێکی زۆر سەخت لەم شاڵاوەیان، زۆری بۆهێنانو دڵەکوتێی پێخستن. بگرە ئایش هەموو گیانی کەوتە لەرزین وای هەست دەکرد، کە خەریکە لەشی شل ببێو بەربیبێتەوە سەرزەوی. بارام لەلای خۆیەوە زوو پێیزانی لەچ حاڵێکدایەو، لەساتی خۆیدا بەفریاکەوت. ڕووی قسەی تێکردو وتی:

ـ ئایش..تۆ سەیرم بکە..سەیرێکی من بکە..

ئەوساتە سەری بەسەر سنگیدا شۆڕبووبۆوەو، وەك پەڕی دەم ڕەشەبا دەلەرزی. بەزەحمەت توانی سەر بەرزبکاتەوەو تێیبڕوانێ.

ـــ ئینجا سەیرێکی لای دوو کۆڕپەکەشت بکە!..دەیانبینیت چۆن لەشیرینخەوی خۆیاندان؟..دەشزانیت بەپشتی کێ؟!.

بارام هێندە تینوتوانای بەرامبەر بەتەووژمی ترسوسامەکە لەدڵدا مابۆوە کەجگە لەخۆی، لەوەزعی ئایشیش بەئاگابێو، بزانێ چۆن هانیدەداو تینوتوانای بەرگەگرتنی دەکاتەوە بەبەردا. بەقسەکردن لەوەزیاتری نەووتو بگرە تەنیا هێندەش بەس بوو. چونکە ئایش بەو قسەیەو بەبینینی ئەوو ئینجا منداڵەکانی، وەك لەسەرەمەرگدا بووبێو لەناکاو هێزێکی نهێنی، گیانی مرۆڤێکی ساغلەمی بەبەردا کردبێتەوە، ئاوەها قیتو گورج بۆوەو بەوپەڕی چوستییەوە، جەستەی ئاخنییەوە ناو پەنجەرەکە. تەنانەت بارام هاواری لێکرد:

ـ ئاگاداربە..هێجگار وەها توندنا. من تەنیا ئەوەم لەتۆ دەوێ، کە هۆشت لەسەرخۆت بێو بەسات وره بەرنەدەیت. دەمەوێ بزانیت کە وره‌بەردان دەبێتە هۆی بەگورگانخواردووچوونی تۆشو منیشو ئەو دووکۆڕپەیەش. ئینجا حەزدەکەم ئەوەش بزانیت، کە من تەنیا یەك پشتم هەیەو، ئەوەتا بەدەرگاکەوەم ناوە. لەکاتێکدا ئێمە پێویستمان بەدوو پشت هەیە، کە دووەمەکەیان پشتی تۆیە. تێمدەگەیت دەڵێم چی؟!.

ئایش گیانێکیتری بەبەرداکرابوو. بێئەم قسانەش وەهای چەسپاندبووە مێشکی خۆیەوە، کە لەناو قەڵایەکی پۆڵایینداین، گەلەگورگ قەتوقەت ناتوانن زەفەری پێبەرن. بۆیە لەوەرامیدا وتی:

ـ تەواو..بێخەمبەو ترست لێم نەبێ. گوایە بیەڵم کەڵبەونینۆکی گورگ، بچەقنە لەشی کۆڕپەکانم؟!.مەگەر پشتو سنگم کون بکەنو لەوێوە، خۆیان بگەیەننە ژوورەوە!.

ئیتر ئەویش نەك تەنیا لەئایشو پەنجەرەکە دڵنیابوو، بەڵکوو خۆیشی هێندەیتر ورەی بەرزبۆوەو وتی:

ـــ تەواو..منیش تەواو..نەخەمم لەدڵدا ماو نەترس.

بەڵام هەر لەوساتەدا، دووسێ تۆپەڵە بەفر لەشوێنی کونی لوولەی زۆپاکەوە، لەبنمیچەوە بەربوونەوە بۆناو ژوور. بارام وای دانا کەکارێکی ئاساییەو لەدڵدا وتی: (دەبوو کە لوولەکەمان دەرکێشا، شتێکمان تێبئاخنیایە). تەنیا هێندەو ئیتر سەرنجی لێلادا. لەکاتێکدا ئایش وەك لەدڵی گەڕابێ کە ئاسایی نییە، چاوی هەر تێبڕی بوو. تا زۆری نەبرد هاواری بەرزبۆوەو وتی:

ـ بارام..بڕوانە!..

کە ڕوانییەوە بنمیچەکە، پەنجەونینۆکی گورگێکی بینی، کە دەتووت ڕەتکراوەتە ناو هێلانەیەکەوەو، دەیەوێ لەبێچووە باڵندەیەك گیربێ!. سەرنجێکی خێرایدایە ئایش. کە دڵنیابوو لەسەرخۆیەو بەبینینی دیمەنەکە تێکنەچووە، سەرێکی ڕەزامەندیی بۆلەقاند. دەستیدایە دەمانچەکەیو وتی:

ـ خەمت نەبێ..هاتنەژوورەوەیان لەوێوە ستەمە. ئەگەر سیحربازیش بنو بتوانن خۆیان باریك بکەنەوەو شۆڕببنەوە، ئەوا بۆ هارپینی سەرولمۆزیان لەسەر پێم.

تەقەڵادانە تازەبابەتەکەی گەلەگورگ، زۆری نەخایاند. سێچوار جارو ئیتر چنگونینۆکیان بەدی نەکرایەوە. بەڵام دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم، دیسان ئایش هاواری کرد:

ـ بارام..گوێت لێبوو؟!.

ـ نا..لەچی؟!.

ـ شووشەیەکی پەنجەرەکەیان شکاند.

ـ من گوێم لەهیچ نەبوو.

ـ منیش تەنیا قرچەیەکم بیست. گوێم لێنەبوو پارچەی لێبکەوێتە خوارەوە.

ـ باشتر..کە لمۆزی پێدادەدەنەوە، دەموقەپۆزیان برینداردەکا. ئەی هیچ هەست بەوە دەکەیت، دەمیان بگاتەکەلوپەلەکانو ڕایبکێشن؟.

ـ نا.

ـ دەهیچ گوێ مەدەرێ. شووشەشکاندنەکەش دادیان نادا.

دوای کەمێ بێدەنگی، ئایش لێیپرسی:

ـ سەعات بووە بەچەند؟.

بارام بەپەرۆشەوە ڕوانییە سەعاتەکەی. بەبینینی ڕووخساری گەشایەوە. وتی:

ـ نزیکی شەشە.

ـ نزیکی..یانی چەندی دەوێ؟!.

ـــ دەتەوێ دەقیقەو ساتژمێرەکەشت بۆ بخوێنمەوە؟..چاکە..ئێستا حەوت دەقیقەی دەوێ بۆشەش..باشە؟.

ـ باشە.

ویستی بۆ زیاتر دڵخۆشکردنی، چەند قسەیەکیتریش بکاو بەپێویستی نەزانی. تەنیا سووکە زەردەیەکی خستە سەرلێوی، بەدڵێکی خۆشەوە جگەرەیەکی ئاگرداو کەوتە مژلێدانی. ئیتر قاچی لێڕاکێشاو بێئەوەی پشت لەدەرگا شل بکا، خۆی خستە سەرباری حەوانەوەوە. ئایشیش وەك ئەویکردو چووە سەرباری، پاڵدانەوەیەکی ئاسایی بەرپەنجەرەکە.

## کازیوە

سەرلەنوێ خامۆشییەکی سەرسوڕهێنەر لەناکاوێکدا، باڵی بەسەر هەیوانو پشت پەنجەرەدا کێشایەوە!. ئەمان تاقیکردنەوەی جاری پێشوویان هێشتا لەلا گەرماوگەرم بوو. تەنیا خۆیان وریاکردەوەو گوێقولاغ بوون. هەوڵیان دا نەك تەنیا ورتەوجووڵە، بەڵکوو بتوانن مشەمشی

هەناسەدانیشیان ببیسن و، ئەویشیان نەدەکەوتە بەرگوێ!. ئایش وتی:

ـ لەوە دەچێ ڕۆیشتبن!.

بارام باوەڕی وا نەبوو. وتی:

ـ نابێ..لەپڕ بێدەنگ بوون!. بۆچی وا لەپڕ؟!.

ـ دەمانخەڵەتێنن؟.

ـ دەشێ..وەکوو جاری پێشوو.

ـ ئێ ئاخر کات لەسەعات شەش تێپەڕی کردوە. تۆ نەتووت..

ـ با..بەڵام..

قسەکەی تەواو نەکردو گەلەگورگ، وەك هەموو پێکەوە لەیەك ساتدا دەنگ درابن، کردیانە ڕۆژی حەشر!.بەهەرچی تینوتوانایەکەوە کە لەقورگیاندا هەبوو، کەوتنە لوورانـدن و قرووسکاندن و بگرە زیقوزاقێکی ئەوتۆ، کە گوێی کەڕی کاس دەکرد!. بەڵام وازیان لەسەرولمۆزکێشان بەدەرگاو پەنجەرەکەدا هێنابوو. ئایش یەکسەر بیری بۆ لای منداڵەکان چوو. وتی:

ـ بارام..منداڵەکان..لەم قاووقیژە خەبەریان بێتەوە من چی بکەم؟!. خۆ زارەترەك دەبن!.

نەگەیشت وەرامی بەرگوێ بکەوێ و، هەردووکیان پێکەوە قوت بوونەوە. بۆ ماوەی چەند ساتێك حەپەسان و گوێقولاغ بوون. ئایش بۆ دڵنیاکردنیان، بەدەنگێکی پڕ لەسۆزەوە وتی:

ـ پاڵکەونەوەو بنوون بابەگیان..بنوون هێشتا زووە.

ئەو قسەکەی بۆئەوەکرد، کە نەیەڵێ قاووقیژەکەیان بەلاوە گران بێ. کەچی ئەوان لەساتی یەکەمەوە، تۆقیبوون و وەك قسەکەیان هەر نەشبیستبێ، پێکەوە دایانە زیڕەی گریانێکی هێجگار بەکوڵ. دایکەو باوکە هەر یەکە لەلای خۆیەوە، کەوتە تەقەلادانی هێمنکردنەوەیان و، چەندە هەوڵیان دا وایان لێبکەن ئەوان هەڵسن و بۆ لای ئەمان بێن، بێسوودبوو. لەجێی خۆیان نەبزوان و لەیەکبیناش دەیانزیڕاند. دایکیان ئارامی لەبەربڕا. پشتی لەپەنجەرەکە بەردا. خۆی خستە سەرپێ و، بارام هاواری لێهەڵساو وتی:

ـ نەکەیت..تۆ دانیشەرەوە جێی خۆت. من دەچم بەلایانەوە. دەشێ سەرولمۆز بەکاربێننەوە.

هاوارەکە وریای کردەوە. دانیشتەوەو پشتی لەپەنجەرە توندکردەوە.

ـ دەچم دەیانهێنم بۆلای تۆ.

ـ ئەی دەرگاکە؟!.

ـ پشت بەتەنافەکە دەبەستم.

ئیتر لەسەری نەوەستا. چوو پری بەهەردووکیاندا کردو بەتانییەکیش لەگەڵیاندا. بەفرکانێك بردنییە لای دایکیان و خستنییە باوەشییەوە. خۆیشی خێرا چۆوە پاڵ دەرگاکەو پشتی پێوەنایەوە. کە دانیشتەوە وتی:

ـ بەتانییەکەیان باش تێوە بپێچەو تەقەلا بدە، گوێچکەیان بئاخنیت.

ئایش وای کردو دواییش توند نووساندنی بەسنگییەوە. ئەوانیش زۆری پێنەچوو ژێربوونەوەو، لەباوەشیدا مت بوون. قاووقیژی گوێکەڕکەری گەلەگورگ، چۆن لەناکاوێکدا دەستی پێکرد، ئاوەهاش لەپڕێکدا کپ بوو. هەردووکیان بەسەرسوڕمانەوە ڕوانییانە یەکتر. بۆ ماوەیەك گوێیان هەڵخست و، ورتەیان لەدەم نەهاتە دەرەوە. تەنیا هێندەیان لاڕوون بوو، کە خامۆشییەکی تەواو باڵی بەسەر هەیوان و پشت پەنجەرەکەدا کێشاوە. دەنگی هیچ خشپەو جووڵەیەکیان نەدەبیست ، کە نیشانەی مانەوە یا ڕۆیشتنیان بێ. ئەوە زۆر سەرسام و چەواشەی دەکردن. نەیاندەزانی چۆنی لێکبدەنەوەو، چی لەبارەیەوە بڵێن. تا ئایش سرەوتی لەبەرهەڵگیراو وتی:

ـ دەبێ چی بێ؟!..ماون یا ڕۆیشتوون؟!.

ـ نازانم..منیش سەری لێدەرناکەم!..سەیرە!.

ـ ئەی چار چییە؟..چی بکەین؟.

ـ با ماوەیەکی تریش چاوەڕێ بکەین.. بزانین چی دەبێ.

ـ ڕەنگە شەبەقی دابێ.

بارام ڕوانییە سەعاتەکەی. نزیکی شەش و نیوی دەخوێندەوە. بڕیاریدا هەڵسێتە سەرپێ و لەکونی تەنافەکەوە، سەیری ناو هەیوانەکە بکاتەوەو ئانوسات، خورپەی پرسیارەکەی لەوەبەر چزەی لەهەناوی هەڵساندەوە..( ئەی ئەگەر نەڕۆشتبوون؟!). ئەمجاریش ڕووخساری گرژبۆوەو ڕەنگی هەڵبزرکا. ئەمجاریش ئایش لێی بەئاگاهات و وتی:

ـ بارام..بۆ وا تێکچوویت!..چیتە ؟!.

بارام بێوەرامدانەوەی، ڕاچەنییە سەرپێ و بەدەمییەوە لەدڵدا وتی: ( ئەگەر نەڕۆیشتبوون، ئەوا کۆتاییمانەو بڕایەوە!). ئیتر هەرهێندەی چاوی بەکونەکەوەنا، وەك یەکێك بەخۆی و ماڵومنداڵییەوە،لەبەردەمی سێدارەدا بووبن و مژدەی ژیانێکی نوێیان پێڕاگەیەنرابێ، وەرچەخایەوەو بەگەشکەدارییەکی بێوێنەوە هاواری کرد:

ـ ئایش..دنیا ڕووناکەو گەلەگورگ نەماون. تەواو..ڕزگارمان بوو..ڕزگارمان بوو..تەواو!.

ئایشیش لەلای خۆیەوە، هەناسەیەکی قووڵی دڵنیایی هەڵکێشا و، وەك گوڵ گەشایەوە. پشتی لەپەنجەرە بەرداو هەڵسایە سەرپێ. منداڵەکانی بردو چوو لەسەر جێگاکەیان دانیشت. ئەوانی لەتەنیشتەوە داناو خۆشی پاڵی بەدیوارەداو، بۆ حەوانەوە قاچی لێڕاکێشا.

لەو ماوەیەدا بارام دەرگای کردبۆوەو بەوریاییەوە، سەری کێشابووە دەرەوە. کەمێك لەسەر ئەوبارە هەڵیروانی و وردبۆوە. کە باش دڵنیابوو، ئینجا هەنگاوی هەڵهێنایەوە بچێتە دەرەوە. ئایش نەك لەترسەوە، بەڵکوو وەك دەقی بەو قسەیەوە گرتبێ وتی:

ـ ئاگاداری خۆتبە!.

کە گەڕایەوە ژوورەوە، چووە پاڵیانەوەو دانیشت. منداڵەکانی لەباوەش گرت و ماچی کردن. ئەوسا ڕوانییە دایکیان و بۆی خنایەوە. کەچی ئەو زۆر بەهێمنی و لەسەرخۆ وتی:

ـ ئێستا وا لەو مۆتەکە سامناکە ڕزگارمان بوو. بەڵام ماوەتەوە سەر پرسیارێك و وەرامەکەی..

بارام سەری لێنزیك خستەوەو ماچی کرد. وتی:

ـ پێویست بەکردنی پرسیارەکەت ناکا. جلوبەرگی پێویستی منداڵەکان و خۆم و خۆت، بپێچەرەوەو ئامادەبن. دەچینەوە ناو کۆمەڵگای گورگی دووپێ!.

1982/1/4

# نهێنییەکانی هونەری چیرۆکنووسین

## 1- پێشەکی دوو پرسیار

وادەبێ بە (21) ژمارە کەبەو (ورشە)یەو بەزنجیرە، بەشداری لە (هاوکاری)دا دەکەمەوە. ئینجا ئەوەبوو لە زۆربەی ئەو ژمارانەدا دوور لە پسپۆڕایەتیو، بەپێی ئەو هەندە زانیارییەی بۆ خودی خۆم لەلام پەیدابووبوو، باسم لە شیعر کرد بوو. دەمویست ئەو کەمەکە تێبینیو باری سەرنجەی بۆ خۆم لە ئەنجامی وردبوونەوەمدا لەلام کەڵەکە بووبوو، بیخەمە بەرچاوی هەم خوێنەرانو هەم بەتەنگەوەهاتوانی کاروانی شیعریمان، بەو نیازەی بەڵکوو سوودێکیان هەبێو کەسانێکیان لێپەیدا ببێ، بەدوایاندا بچنو باشترو تێرو تەسەلتر لێیان بکۆڵنەوەو، راستو چەوتیشیان لێکجودا بکەنەوە. دیارە من ناڵێم کە هەرچیم لەبارەی شیعرەوە هەبووە وتوومە. نا.. بەڵکو من خۆشم قسەی ترم زۆرهەن بیانکەم، یا هیچ نەبێ درێژەی ئەو تێبینییانەم زۆر پێماون دەریانبڕم. بەڵام لە بواری ئەم ورشەیەدا، تەنیا هێندە دەووترا کەووترا. بۆیە واجارێ لە شیعر لادەدەمو دێم هەندێکیش باس لە چیرۆک دەکەم، کە ئاشکرایە ئەمیان پیشەی خۆمەو دەبێ لە شارەزاییەکی باشترەوە لە شیعر، قسەی لێبکەم. بۆیە هەوڵ دەدەم قسەکانم لەگەڵ سەرباسەکەمدا بگونجێنو، وابن کەلە (نهێنییەکانی هونەری چیرۆکنووسین) بدوێن. با بنەماکانیش هەر ئەوانەبن، کەلەسەر زاری رەخنەگرو لێکۆڵەرەوەکانن (وەک دوایی دەکەوێتە بەرچاوتان).

پێشەکی من بەوەرامدانەوەی دوو پرسیاری ساکار دەست پێدەکەم، کە یەکەمیان دەڵێ: ئایا چیرۆکنووس بۆچی چیرۆک دەنووسێ؟. دووەمیشیان دەڵێ: ئەی ئایا خەڵک بۆچی چیرۆک دەخوێننەوە؟!. ئینجا ئەمە دەشێ بخرێتە قالبی مەسەلەی (مریشکو هێلکە)کەوەو بووترێ: ئایا چیرۆکنووس بۆیە چیرۆک دەنووسێ تا خەڵکەکە بیخوێندنەوە، یا خەڵکەکە چیرۆک دەخوێندنەوە بۆیە چیرۆکنووس چیرۆک دەنووسێ؟!. ئەگەر مەسەلەکە بخرێتە ئەم قالبەوە، منیش ناچار دەبم هەر وەرامە بێوەرامەکە بدەمەوەو بڵێم: بەڵێ.. مریشک لە هێلکەیەو هێلکەش لە مریشکە!. واتە چیرۆکنووس چیرۆک دەنوسێ تا خەڵکەکە بیخوێندنەوەو، خەڵکەکەش چیرۆک دەخوێندنەوە بۆیە چیرۆکنووس دەینووسێ!.

بێگومان من ئەم بارەی وەرامی پرسیارەکانم مەبەست نییە ئەم بارەی ئەوەتا بریتییە لە هەقایەتی مێشەکەو (خوام بەهەقە)کەو دەبڕێتەوە. بەڵکوو من چوونە ناوجەرگەی کردارەکەوەم مەبەستە.. چوونە ناوجەرگەی چالاکییە مرۆڤانەکەوە، کە دەکاتە (چالاکی+ مرۆڤ). واتە بۆ هەریەکێك لە دو لایەنەکە (نووسەرو خوێنەر)، هەردوو مەرجەکە (چالاکی، مرۆڤ) لە کایەدانو، لەلای هەردووکیش لەناو یەك کوورەدا جۆش دەخۆن، کەکارە هونەرییەکە خۆیەتی. یائەگەر روونتر موعادەلەکە بخەینەڕوو دەڵێین: نووسەر لەلای خۆیەوە وەك مرۆڤێك جۆرە چالاکییەك دەنوێنێو، لە ئەنجامیدا کارە هونەرییەکە بەدی دێنێ. لە کاتێکدا لە بەرامبەریدا خوێنەریش لەلای خۆیەوە وەك مرۆڤێك، جۆرە چالاکییەك دەنوێنێو لە ئەنجامیدا، کارە هونەرییەکە دەخوێنێتەوە. بێگومان ئەم موعادەلەیە وامان لێدەکا هەوڵ بدەین بزانین، کە ئایا بۆچی هەم نووسەرو هەم خوێنەریش، پەنا دەبەنە بەر ئەمجۆرە چالاکییە؟!. خۆ دیارە کە چالاکییەکە یەکێکە لە هەزارەها جۆر چالاکی، کە رۆژانە لەلایەن ملیارەها مرۆڤەوەو، ملیارەها جار دەنوێنرێن هەروەکوو دیارە کە لەو بابەتەش نییە ئەگەر نەکرێ (وەك خواردن)، مرۆڤی پێبەفەوت بچێ، کەچی دەشکرێ.. بۆچی؟!. لە دەمێکەوە وتراوە کە مرۆڤ تەنیا بەنان ناژی. خۆ ئەوی راستی بێ دەژی. بەڵام گرنگ مەغزای قسەکەیە کە دەڵێ: مرۆڤ جگە لەنان، زۆرشتی تریشی پێدەوێن، تا بەهەقیانەت بژی. یەکێ لەو زۆرە، هەستکردنێتی بەژیانەکە. بەپڕبەپڕی ژیانەکە. دەنا خۆ ئاژەڵیش دەخواو دەژی.! هەستپێکردنەکەش هەزارو یەك باری هەیە. ئینجا یەکێك لەو هەزارییەکە خۆسەلماندنە. خۆسەلماندن لە ڕیزو لەڕووی ئەو ملیارەهایەی تردا کە هەن. دیارە ئێمە لێرەدا باسمان لە نووسەرو لە خوێنەری چیرۆکە. ئا.. نووسەر کە دەگونجا دارتاشی یا ئاسنگەری بۆ خۆسەلماندنەکە لەخۆ بگرێو، کەچی چیرۆکنووسینی لەخۆگرتوە. دوای تێپەڕبوونی بەبۆتەی چەندین موعادەلەی تردا، ئەمیانی لەبەردەمدا لێبۆتە تاقە رێگایەکو گرتوێتییەبەر. واتە تەنیا ئەمیان بەمسۆگەترین رێگا بۆ خۆسەلماندنەکە دەزانێ. بێگومان لێرەدا دەبێ ئیشارەت بەوە بدەم، کە ئەم بنەمایە تەنیا نووسەری سەرکەوتوو دەگرێتەوە، چونکە ئەو کارێکی هەروا سووکوئاسان نییەو، گەلێ مەرجی تایبەتی خۆی هەن، کە بێمسۆگەکردنیان نایەتەدی، باهەرچی حەزو ئارەزوویەکیش لە دڵیدایە، بۆی بخاتەکار. ئیتر هەر لێرەشەوەیە ئەو حاڵەتە روودەدا کە دەووترێ: فڵانە نووسەر داهێنەرو خوڵقێنەرەو، دواجار گەورەو نەمرەو، فیسارە نووسەریش ئەرزوحاڵنووسێکەو هیچی تر. بەڵێ.. بۆ نووسەر وەها، کەلە بنەڕەتدا بۆ خۆیو لە پێناوی سەلماندنی بوونی خۆیدا دەنووسێو کەچی، ئەنجامە هەرە راستەوخۆو دیارو ئاشکراکەی وادەکەوێتەوە، کە نووسینە بۆ ئەو کەسانەی دەیخوێندنەوەو، کە ئەوی راستی بێ بێبوونی ئەو کەسانە، ئەوی نووسەر قەت نایەتە بەر زەین بتوانێ، بوونەکەی خۆی بسەلمێنێ.

کەوابوو ئێستا بابێینە سەر خوێنەرو بپرسین: ئەی ئایا ئەم بۆچی دەخوێنێتەوە؟!. گومانی تێدا نییە کە ئەمیش راست وەکو نووسەرەکە کرداردەکا، بەڵام بەباری خۆدۆزینەوەدا کە دیوەکەی تری خۆسەلماندنە. خۆ وەنەبێ خۆدۆزینەوەکەش یەك جارەکیو لە تەنیا یەك بەرهەمدا بێ، هەرگیز نا.. بەڵکو بەژمەژمەو هەر تۆزەی لە بەرهەمێکداو، ئەنجامیش وەها دەکەوێتەوە، کە قەت لەو بەرهەمانەدای دەیانخوێنێتەوە، بەتەواوی خۆی نادۆزێتەوەو هەردەم بەچەشنی بەدواداچوونی سێبەری خۆی، هەر دەخوێنێتەوەو هەر نایگاتێو، ئیتر ئەمەشە هۆی بەردەوام بوونی خوێنەر، لەسەر خوێندنەوەی چەندین بەرهەمی جۆراو جۆری، چەندین نووسەری جیالەیەکتر. بەم پێیە جیهانی نووسەرو جیهانی خوێنەر، چەندە لەیەکتر دابڕاونو لە یەکترەوە دوورن، هێندەش بەیەکترەوە بەندنو پێکەوەنووساون. واتە هەریەکەیان بۆ خودی خۆی تێدەکۆشێ، کەچی هەریەکەشیان لەپێکی کۆششی ئەوی

تریان دەنۆشێ.. یا پێکەوە کاروان دەگەیەننەجێ.!

## 2-زمان

لەوتاری یەکەممدا هەوڵم دا، وەرامی ئەو دوو پرسیارە ساکارە بدەمەوە کە دەڵێن: چیرۆکنووس بۆچی چیرۆك دەنووسێ و، خوێنەریش بۆچی چیرۆك دەخوێنێتەوە؟!. لەم وتارەشمدا تەقەلا دەدەم، لەزمان و بایەخی زمان لە هونەری چیرۆکنووسیندا بدوێم. ئینجا دەپرسم: بۆچی زمانم پێش لایەنەکانی تر خست؟!.

لە وەرامدا دەڵێم: چونکە زمان بەردی بناغەیەو ئاشکرایە، کە نووسەر بەبێزمان، هەر لە بنەڕەتەوە هیچی لە بواری نووسیندا پێناکرێ. من بەشبەحاڵی خۆم، بەهیچ کلۆجێك نایەتە بەرزەینم، کە نووسەرێك بێبەرکارهێنانی زمان بتوانێ بنووسێ. ئەمە کارێکی زەق لەبەرچاوەو، هیچ بێنەوبەرەو ئەملاولایەکی تێناکەوێ.

دەکەوابێ چیرۆکنووس بەر لە هەر لایەنێکی تری هونەرەکە، زمانە- بەردەبناغەکەی لەبەردەمدا دەبێتە تەگەرە هەرە سەختەی، کە دەبێ لەوەختێکی زووەوە، لای لێبکاتەوەو هەوڵی زاڵبوون بەسەریدا بدا. خۆ من وەنەبێ نیازم لەم نووسینەو لەوانی تریشدا کە دادێن، ئامۆژگاریکردن بێ.. هەرگیز نا. بەڵکو دەمەوێ لە مەسەلەی زمان وەك یەکێك لە نهێنییەکانی هونەرەکە بدوێم و بڵێم: چیرۆکنووس ئەگەر بەردی بناغەکەی باش نەچەسپاندبوو، دوایی هەزار بەردی زەرکەفتکراویشی لەسەرهەڵچنێت، ئەگەر هەرەسیش نەهێنن، لەبەرچاوان هەر شەقوشڵۆق دەنوێنن و باقوبریقیان دادنادا. لەگەڵ ئەوەشدا بەلاتەوە سەیرنەبێ ئەگەر بڵێم: هەرچەندە زمان ئەوبەردی بناغەیەیە کە هەیە، بەڵام بەردێکی ڕەقی ڕووتیش نییەو بووترێ: ئەوەتا زمانەکەم بەپێی هەموو دەستوورەکانی، کۆك و ڕێکوپێکەو هەڵەی زمانەوانیی تێدانییەو دەبێ بۆم بسەلمێنرێ، کە بەردی بناغەی چیرۆکەکەم بێکەموکوڕییە!.

نەخێر.. قەت ئەمەش وانییەو بەشی هەرە گەورەی نهێنییەکە لێرەدایە. بۆیە من لەلای خۆمەوە دەڵێم: بەردەکە هێندەی ڕەقێکی ڕووتە، هێندەش نەرمونیانێکی (کورد واتەنی) تووکی قوویییە. یا باشتروایە بەزمانی سەردەم بڵێم: نەرمونیانێکی ئیسفەنجییە!. چۆن؟!. باباسی بکەم.. ئایا تۆ قەت پارچە ئیسفەنجێکت لەئاو وەرنەداوەو ئینجا بیگوشیتەوە؟!. بابیگومان کردووتە. ئینجا تۆ سەرنجدە.. پارچە ئیسفەنجەکە بەوشکی و دوای لەئاو وەردانەکەی، بەبارستایی جیاوازییەکی ئەوتۆیان نابێ. لە کاتێکدا بەکێشان، جیاوازییەکی گەورەیان دەکەوێتە نێوانەوە.

ساکاریمان لەگەڵ بەکارهێنانی زمان لە هونەری چیرۆکنووسیندا (هێندەی پەیوەندیی بەنهێنییەکەوە هەبێ)، ڕاست وەها دەکەوێتەوە. تۆ بەردە ئیسفەنجەکە (کە بەردی بناغەکەیە)، بەڕێکوپێکی بەکاردەهێنێت. بەڵام ئایا لە حاڵەتی وشکییەکەیدا بەکارت هێناوە، یا لە ئاوی مانا و مەغزای قووڵت وەرداوەو، خستووتەتە بەرچاوی خوێنەرەکەت؟!. خۆ ئاشکراشە کە ئەگەر تۆ توانیبێتت ئەوە بکەیت، ئەوا ئیتر چارونووست (واتە چارەنووسی بەرهەمەکەت)، دەکەوێتە بەرحوکمی لایەنەکەی بەرامبەرت، کە خوێنەرەو کە ئەمیش ئەوەتا (وەك لە وتاری پێشوومدا دەسنیشانم کرد)، خاوەنی جیهانێکی تایبەتیی خۆیەتی و، بەڵام وێڵی گەڕانیشە بەدوای یەکێك (یاخود یەکانێکدا)، کە بەحاڵەتی خۆ دۆزینەوەو یەکگرتنەکەی بگەیەنێ. حوکمەکەش (من باوەڕم وایە) کەلە زۆربەی جاردا، بەلایەنگرتنی تۆدا دەشکێتەوەو کەمجار بەپێچەوانەوە دەبێ. بۆچی؟!. چونکە هێندەی تۆ کۆششت لە لەئاووەردانی ئیسفەنجەکە (مانا دەردانەوە بەمێشکت) کردوە، هێندەش ئەو کۆششی بەوەرگرتن و خۆخواردنەوە لەگەڵ وەرگرتنەکەو، جۆشخواردنی بۆخۆی لەگەڵیدا کردەوەو بەوە هەردوو جیهانەکەتان، سەرەڕای جیاوازیشیان لەیەکتر، بەیەك گەیشتوون و دیسان کورد واتەنی، بەیەکتر شادو شوکروبوون، کەهەر ئەمەشە مەغزا هەرە گەورەکەی کۆششی هەردوولاتان. دەنا دەیڵێمەوە: تۆ چ مەجبووریت چیرۆك بنووسیت و، ئەویش چ مەجبوورە چیرۆك بخوێنێتەوە!!.

بەم پێیە زمان لە هونەری چیرۆکنووسیندا، نابێ تەنیا بریتی بێ لەوەی بووترێ: واهات واچوو، بەڵکو پێویستە گەلێ بەولاوەترەوە بێ و دەبێ جگە لە مەرجە هەرە سەرەتاییەکە، کە زانینی دەستوورە ئاساییەکانێتی (یەکەمجار بەسەلیقەو دوایی بەتێگەیشتنەوە)، هەوڵدانی مەلەوانیکردنیش بێ لە دەریا قووڵ و بەرینەکەیدا، بەئامانجی بەدەستەوەدانی زۆرترین و کاریگەرترین مانا و، ڕاگەیاندنی بەو کەسەی کە ئەوەتا لەبەری ئەوبەرەوە، لە چاوەڕوانی وەرگرتندایە لە تۆی نووسەر. تۆ بۆ ئەم مەسەلەیە دەبێ هەر لە وەختێکی زوودا لە خۆت بپرسیت، کە بۆچی کورد لە دێر زەمانەوە وتویەتی: فلانەکەس زمانلووسە؟!. تۆ وەرە بچۆرە بنجوبناوانی وتەکەوە. خۆ من خوانەخواستە نالێم تۆ زمانلووسبە بۆ هەڵخەڵەتاندن!. نا.. بەڵکو زمانلووسبە بۆ ڕاکێشانی (یاداخزاندنی) بۆ ناو جیهانەکەی خۆت، کە من قەت گومانم نییە جیهانی ڕووناکی و خێرو خۆشییە. ئابەڵێ زمانی لووس، کە قەتیش نابێ وەها بگەیەنێ گوایە چیرۆکنووس، ببێتە پسپۆڕێکی زمانەوانی!. هەرگیز نا.. بەڵکو من داوادەکەم و مەرجیشە، کە چیرۆکنووس ببێتە پسپۆڕی زمانی چیرۆکنووسین. بەڵام ئایا چۆن دەبێتە ئەم پسپۆڕە، ئەوە ئەرکی سەرشانی خۆیەتی. ئینجا خۆ لە خۆڕایی نییە کە دەووترێ: فلانە چیرۆکنووس خاوەنی عەجەب زمانێکی پاراوی تایبەتیی خۆیەتی؟!. لێرەدا زاراوەی (لووسی)یەکە لە بیرمەکەو دەشێ بووترێ: عەجەب زمانێکی لووسی هەیە؟! یا دەووترێ فیسارە چیرۆکنووس، زمانێکی زۆر خراپی لە نووسینی چیرۆکەکانیداهەیە!. لێرەشدا لووسییەکە هەر لە بیرمەکەو دەشێ بووترێ: بڕوانن کابرا چ زمانێکی زبری کوڵکنی هەیە؟!.

بەهەرحاڵ زمانی پوختیش.. بەردی بناغەکەش.. بەردە ئیسفەنجییەکەش.. تەنانەت لووسییەکەش، هەر کەس ناکا بەچیرۆکنووسێکی باش، ئەگەر مەرجەکانی تری نەچنە پاڵ. مەرجەکانی تریش (کە بریتین لە نهێنییەکانی تر)، زۆرن و لقوپۆپی زۆریشیان لێدەبێتەوە. لە وتاری داهاتوومدا، هەوڵدەدەم لە یەکێکی تریان بدوێم.

## 3-کەسان

لە وتاری پێشوومدا وتم زمان، بەردی بناغەیە لە هونەری چیرۆکنووسیندا.

بەڵام ئاشکرایە کە بەتەنیابە بەردی بناغە، بینای چیرۆکێك دروست نابێ، بەڵکو زۆر

کەرەسەی تری پێدەوێ، بەکارهێنانی ئەو کەرەسانەی تریش، وەستایی و شارەزاییەکی زۆریان پێویستە، کە دواتر لێیان دەدوێین و لەسەریان رادەوەستین. بەڵێ.. هیچ چیرۆکێك بێکەسانێك نابێ، کە باسیان لێوەدەکا. بەڵام با پێشەکی ئەوە بڵێم کە مەبەست لە کەسان، تەنیا ئادەمیزاد نییە، بەڵکوو هەموو گیاندارێك و، تەنانەت دەشێ بێگیانیش بگرێتەوە، ئەگەرچی لە ئەنجامدا گیاندارو بێگیانەکانیش، هەر بەپەیوەندی لەگەڵ ئادەمیزاددا باس دەکرێن. چونکە ئەگەر هیچ ئادەمییەکیش لە چیرۆکەکەدا لە ئارادا نەبێ، خۆ ئەوەی باس لە گیاندارو بێگانەکانی تر دەکا کە نووسەرەکەیە، هەر ئادەمییەو هەر زادەی بیروهۆش و هەستونەستی ئەوە، دادەڕێژێتە سەرکاغەزی سپی و دەبێ بەو چیرۆکە. هەروەها دەبێ ئەوەش بڵێم کە کاتێ کەسان بەکۆ ناودەبەم، مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەرچی چیرۆکێك تەنانەت لەیەك کەسی سەرەکیش بدوێ، قەت واناکەوێتەوە کە ئەو یەك کەسە، بەتەنیاو بێهیچ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ کەسانی تردا، (ئادەمی بێ یا گیانداری تر یا بێگیان)، قسەی لێوەبکرێ. من لەلای خۆمەوە، قەت ناتوانم حاڵەتێك لەم بابەتە بێنمە بەرزەینی خۆم.. حاڵەتێك کەئەو کەسە بەشێوەیەکی رەها تاکوتەنیا و بڕاییبڕ، لەگەڵ دەوروبەریدا بێپەیوەندی بێ. بەم پێیە دەتوانین بڵێین: چیرۆك بەبێکەسێك کە دەبێ لێی بدوێ، قەت دروستنابێ. کەسەکەش باسەرەکیش بێ، بێپەیوەندی لەگەڵ کەسانێکی تری ناو دەوروبەریدا، دیسان قەت دروست نابێ. کەسانیش مەرج نییە تەنیا ئادەمیزادبن، بەڵکو دەشێ هەرگیاندارو بێگانێکی تربن، بەڵام هەر بەپەیوەندی لەگەڵ ئادەمیزاددا. چونکە هەرهیچ نەبێ خولقێنەری چیرۆکەکە ئادەمیزادێکە.

ئێنجا ئایا ئەم وردکردنەوەیە بەچ ئەنجامێکمان دەگەیەنێ؟!. راست بەو ئەنجامەمان دەگەیەنێ، کە چەندە بمانەوێ ئەمدیوو ئەودیو بەمەسەلەکە بکەین، کار هەر وەها دەکەوێتەوە کە ئامانج لە نووسینی چیرۆکەکەو لە خوێندنەوەی تەنیا ئادەمیزادە. نووسەر ئەوەو خوێنەریش ئەوە. خۆ ئەگەر نموونە بهێنمەوە دەتوانم بڵێم: دەشێ شەمپانزییەك ببێتە کەسی سەرەکیی چیرۆکێك. کەچی ئەو ئەگەرچی یەکێکیشە لە زیندەوەرە هەرەزیرەکەکانی تر، نابێتە نووسەر یا خوێنەری چیرۆکێك!. (هیچ نەبێ لەم سەردەمەدا!. ئەمە مەسەلە بنەڕەتییەکەی کەسانە لە هونەری چیرۆکنووسیندا. بەڵام خۆ من پێم وانییە، کە تەنیا بەوەندە دەبڕێتەوە، نا.. گرفت لە لقوپۆپەکانیدایە. تکایە ئێوە سەرنج بدەن.. سێ چوار مانگێك لەمەوبەر، دەزگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەواڵێکدا بڵاوی کردەوە، کەوا ژمارەی ئادەمیزاد لەسەر زەمیندا بوو بەپێنج ملیار. هەمووش دەزانین کە ئەمانە پێنج ملیار پەنجەمۆر یا ئاوازی دەنگی جیا لەیەکتریان هەیە. بەیناوبەینیش دەخوێنینەوە کەئەها دەرکەوت فلانە یا فیسارە سیفەتیش، لەهەر ئادەمییەکدا لە ملیارەکەی تر جیایە. دیارە من نامەوێ داخزێمە زەلکاوی ئەو بۆچوونەوەی، کە دەڵێ گوایە پێنج ملیار جیهانی دژبەیەکتر هەن و، بەیەکتردا دەدەن و لە ئەنجامدا، شەڕو شەڕخوایی دەبێتە کارێکی ئەزەلی!. هەرگیز نا.. بەڵکو دەمەوێ بڵێم: کاتێ چیرۆکنووس دەیەوێ لەیەکێ لەو پێنج ملیارە بدوێ، دەبێ بزانێ کە بۆ نموونە: پەنجە مۆرەکەی جیاوازە لەهەر پێنج ملیارەهاکەی تر. کەلە ئەندێشەیەکی دەدوێ، با لەلای ملیارەهای تریش هەمان ناوی هەبێ (دڵداری، برسێتی، شین، هیوا، ترس، ئازایەتی..هتد)، دەبێ ئاگاداربێ کە جیاوازە لەوەی لەلای ملیارەهاکەی تر هەن. رەنگە جیاوازییەکە هێندەی تاڵەموویەك و زۆر کەمتریش بێ، بەڵام هەر جیاوازە.

ئێنجا لێرەدا دیسان ئەو پرسیارە سەرهەڵدەداتەوە، کە ئایا ئەوەی چیرۆکەکە دەنووسێ کێیە؟!. ئایا یەکێك نییە لەو ملیارەهایە؟!. با بێگومان!. دەیسا ئەمە چ مەغزایەمان دەداتێ؟!. بێگومان بەسەرێك دەستەوستانی و بەسەرێکیش کارامەیی. دەستەوستانی، چونکە راگەیشتن بەپێنج ملیار جیهانەکەدا، لەوزەی هیچ مرۆڤێکدا نییە. کارامەییش، چونکە کام نووسەر بەزۆرترینا رابگا، گرەوی بردۆتەوەو هەر ئەمەشە، کە نووسەرێك لە نووسەرێکی تر جوداکاتەوە. ئەمەی کەوتم راماندەکێشێ بۆ بارێکی تری باسەکە. ئەم بارەیان دەڵێ: هێندەی مەسەلە پەیوەندیی بەکەسانی چیرۆکەوە هەبێ، چیرۆکنووس رووبەڕووی نهێنیی دوو گەردوون دەبێتەوە. یەکەمیان ئەوەیە کەلە بەرچاوەو ئادەمیزاد لە بەرەبەیانی مێژووەوە پێوەی خەریکە، تاوای لێهاتوە کە ئێستا ئەستێرەیەکی لە دووریی ملیۆنەها ساڵی تیشکییەوە تێدا بەدی دەکاو، ناوی لێدەنێ و دەیناسێ. دووەمیشیان ئەوەکەی بندەستی خۆیەتی، کە بریتییە لە جیهانەکەی ناخی خۆی و ئەوەکانی ملیارەکەی تر، کەلەگەڵیداو لە رۆژگاری خۆیدا هەن. بۆ ئەم گەردوونەشیان، ئاشکرایە مرۆڤ لەوەی تێپەڕاندووە بریتی بێ لە تەنیا دڵ و جگەرو ریخۆڵەو گەدەو ئێسك و دەمارو ماسولکەو..هتدو، لە مێشکیش کە گەردوونە زەبەللاحەکەی پێتەی دەکا. بێگومان من نامەوێ لەم رووەوە بچمە ناو (توونی بابا)ی فەلسەفەوە. بەڵکو، تەنیا دەمەوێ بڵێم کە پەیوەندیی چیرۆکنووس، پتر لەگەڵ ئەم گەردوونیاندایە نەك ئەویان. هەروەکو ویاتریش لەگەڵ مێشکدایە بەدیوی ناوەوەدا بۆ قووڵایی ناوخۆی، نەك بەدیوی دەرەوەیدا بۆ بینین و ناسینی شتە زەبەللاحەکان.

بەم جۆرە چیرۆکنووس لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کەساندا، دەبێ دووجار زانابێ. جارێك وەك زاناکەی گەردوونناسی دەرەوەو، ئەمیان هەروا بۆ ئاگاداربوون لەوەی کەلەولا هەیە. جارێکیش وەك ئەوەکەی لەمەڕ خۆی، کە دەبێ بەهەموو پێچوپەناکانیدا گەڕابێ و، لەوسەریان هاتبێتەوە. دەنا منی خوێنەر ئەگەر بێم و چیرۆکی چیرۆکنووسێك بخوێنمەوە، کە باسی کەسێکم بۆ دەکا چۆن شەوێك لە شەوان بەدەم خەمێکەوە دەتلێتەوەو، تابەرەبەیان چاوی ناچێتە خەو، ئەگەر لەوسەری (ئەو خەمەی) (ئەو شەوەی) (ئەو کەسەی) (تابەرەبەیان) (دەتلێتەوە) نەهاتبێتەوە، چۆن دەتوانێ منی خوێنەری خاوەن خەمێکی تری تلاوە لە شەوێکی تردا، تابەرەبەیانێکی تر (وەك مرۆڤێکی تر)، قایل بکا کەوا بەخوێندنەوەی ئەو چیرۆکە، لەگەڵ کەسێکی راستەقینەی زیندووی خاوەن جیهانی تایبەتی خۆیدا کاتم بەسەربرد؟!. خۆ ئەمەش هەرگیز واناگەیەنێ کەمن دەبێ هەر بەباری (ایجاب)دا، ئەو کەسە بخەمە ناو چوارچێوەی ئەندێشەی خۆمەوە.. نا.. بەڵکو دەگونجێ بەباری (سلب)دا بێ و، لەو چوارچێوەیەدا بەپێچەوانەوە جێگەی بکەمەوە، وەك ئەوەی من خەمێکی فریشتەیی لوولیدابم و ئەو خەمێکی شەیتانانە!.

## 4-کارەسات و ڕووداو و بەسەرهات

ئەگەر زمان بەردی بناغەو کەسان کەرەسە سەرەکییەکەبێ لە هونەری چیرۆکنووسیندا، ئەوا کارەسات و ڕووداوو بەسەرهات، دەبنە مایەی هەڵسوڕاندنی ئەو کەرەسە سەرەکییەو، نیشانەی زیندوێتی و جموجووڵی بێڕاوەستانی لەژیاندا. کەسان (بەمانا مەجازییەکەی) بەردی بنگۆم نین، بەڵکوو پڕبەپڕی بوون (وجود)یان و بەدرێژایی ساتبەساتیان، لە گورجوگۆڵیی چالاکیدان و بەردەوام دەجمێن و لە ئەنجامیدا، کارەسات و ڕووداوو بەسەرهات دێنەکایەوەو لەبەردەم چیرۆکنووسدا، دەبنە مەرجێکی سەختی تری هونەرەکە، کە دەبێ زەفەری پێببا و بەسەریدا زاڵ ببێ.

سا ئایا مەبەستمان لە کارەسات و ڕووداوو بەسەرهات چییە؟!. پێشەکی با ئەوە بڵێم کەئەم سێکوچکەیە بەلای منەوە، سێ مانای تایبەتیی جیا لەیەکتر دەبەخشن، کە دوایی ڕوون دەبێتەوە. ئاشکرایە کە سێکوچکەکە بریتی دەبن لەوەی لە چیرۆکێکدا دەووترێ: فڵانە کەس (مەبەستیش تەنیا لە ئادەمیزاد نییە)، واهات و وا ڕۆیشت و وای لێقەوما. بەڵام ئایا چیرۆکنووس تەنیا ئەوەندەی لێداوا دەکرێ؟!. هەرگیز نا.. ئەمە تەنیا سەرکۆزەری مەسەلەکەیە.. تەنیا ڕووکەشی باسەکەیەو بارە ڕاستەقینەکەی، زۆر بەولاترەوەیە. جا ئایا بەولاترەوەکە کامەیە؟!. بەولاترەوەکە ئەوەیە کە بپرسێ: بۆچی؟!.. بۆچی واهات و ڕۆیشت و وای لێقەوماو، وەرامیشی بدرێتەوە. ئەمەیە کەلە خلیسکان بەمسەرو ئەوسەری تەختایی ڕووکەشدا ڕزگارمان دەکاو، دەرگای چوونە خوارەوەمان بۆ قووڵایی لێدەخاتە سەرپشت و، لە بنجوبناوانی کارەسات و ڕووداوو بەسەرهاتمان نزیك دەکاتەوە. دەڵێم نزیکمان دەکاتەوە، چونکە گەیشتن بەڕەگوڕیشە (لە گەردوونە فرە بەرینەکەی ناوەوەدا)، کارێکی هێندە سەختوستەمە کە ئەوەی زەفەری پێببا، بەهەقیانەت دەبێتە شاری چیرۆکنووسان.

ئینجا دیسان دەپرسم: ئایا مەبەست لەو چوونەخوارەوەیە بۆ قووڵایی و، لەو نزیکبوونەوەیە لە بنجوبناوان چییە؟. دیارە من باس لە نووسینی وتارو لێکۆڵینەوەی زانستی نییەو، باسم لە هونەری چیرۆکنووسینە. لە وەرامدا نموونەیەکی چیرۆکنووسانەش دەهێنمەوەو دەڵێم: تۆ وەرە سەرنج بدە!.. من کەسێکم لە چیرۆکێکدا هەیەو، لە شوێنێکی چیرۆکەکدا دەڵێم: (گەیشتە ساری کۆڵانەکە. لەوێدا ساتێك ڕاما. ئینجا گەڕایە دواوەو ملی ڕێگای گرتەبەر). ئاشکرایە ئەمە کارەساتێکەو لە مرۆڤێك وەشایەوە، کە دەگونجا ئەگەر ببرایەتەسەر، ڕووداوێك دروست بکا. ئینجا وەرە بائەم کارەساتە وردبکەینەوەو، بزانین (بۆچی)یەکە چۆن خۆی دەنوێنێ؟!. بڕوانە:

–بۆچی ئەو کەسە هاتە سەری کۆڵانەکە؟!.

–بۆچی ساتێك ڕاما؟!.

–بۆچی گەڕایەوەو ملی ڕێگای گرتەبەر؟!.

چیرۆکنووس کاتێ ئەو سێ ڕستەیەم بۆ دەنووسێ و، هیچ وەرامێکی ئەو سێ بۆچییەم، بەهیچ شێوەیەك و هیچ بارێکدا ناداتەوە (کە ئەمە پەیوەندیی بەلایەنی هونەرییەوە هەیە، مانای وایە کەڕووکەشییانە کار بەڕێ دەکاو، لە قووڵایی یا لە دیوی ناوەوەی مەسەلەکە بێخەبەرە!. یاوەکی تری بڵێم: مانای وایە کە کەسەکەی کوێرانە بەڕێوەدەبا (کوێرانە بۆ کەسەکە نەك بۆ خۆی). واتە کوێرانە دەیباتە سەری کۆڵانەکەو ساتێگ ڕاگیری‌دەکاو دەیگێڕێتەوە دواوە. لە کاتێکدا کرداری کەسەکە خۆی (بابەدیوی دەروەشدا وا بگەیەنێ کە کوێرانە هەڵدەسووڕێ)، بەڵام لە بنەڕەتداو بەدیوی ناوەوەی خۆیدا، قەت وانییە. بەڵکو لە ئاگادارییەکی تەواوەوەو، زیرەکانەو لە ئەنجامی چەندین ئەندێشەو لێکدانەوەو بێنەوبەرەدایە، کە ئاوەها کرداردەکاو ئەو کارەساتە دەخوڵقێنێ. ئەو چاك دەزانێ بۆچی هاتە سەری کۆڵانەکە. بابڵێین بۆ ئەوەبوو بچێ هەرایەك لەسەر هەرشتێك بێ بنێتەوە. هەراکەو هۆیەکانی پشتەوەی ئەگەر بخرێتە سەر کاغەز، کە ئەو وەختە کارەساتەکە ڕووداوو بەسەرهاتی لێدەبێتەوە، ڕەنگە ڕۆمانێکی چەند سەد لاپەڕەیی لێدەربچێ. بەڵام ئەو کە بەنهێنی.. بێئەوەی من و تۆی خوێنەر پێبزانین کەئەو لەژێر حوکم و دەسەڵاتی چیرۆکنووسیندایە، واناکاو ساتێك ڕادەمێنێ و بیرێکی لێدەکاتەوە. لێرەشدا لەخۆی بەئاگایەو دەزانێ بۆچی بیری لێدەکاتەوە. بابڵێین گومان لە پێویستیی ئەو هەرانانەوەیە پەیدادەکا. خۆ لێرەشدا هەر حاکم و دەسەڵاتدارە نهێنییەکەیە کە گومانی پێپەیدادەکا دەبینین چ بەیەکداچوونێك لە نێوان خوڵقێنەری چیرۆکەکە کە چیرۆکنووسەو، خوڵقێنەری کارەسات و ڕووداوو بەسەرهاتدا کەکەسانی چیرۆکەکەن دەقەومێ؟!. ئەمە لە کاتێکدا کەکەسانیش بەمانا هونەرییەکەی، هەر زادەی بیروهۆشی چیرۆکنووسن!. هەروەها ئەو دەزانێ بۆچی گەڕایەوە دواوە بابڵێین گەیشتە ئەو ئەنجامەی جارێ واز لە هەرانانەوەکە بێنێ.

گومانی تێدا نییە کەهەریەکە لەسێ حاڵەتەکەش، لەدرێژەی باسدا چەندین لقوپۆپی لێدەبێتەوە. ئینجا ئەم زانیارییانە لەوانە نین کەلە چیرۆکەکەدا دەخرێنە ڕوو، چونکە ئەم بەپێی ئەو نەخشەیە کەبۆی دانراوە، ڕوو لەلایەکی تر دەکا. بەڵام هێندە هەیە کە چیرۆکنووس شانبەشانی کەسەکە، دەبێ لە زەینی خۆیدا لێیان بەئاگابێ و بزانێ، کە نهێنیی وەرامدانەوەی (بۆچی)یەکە لێرەدایە. ئەمەی وتم لەبارەی کارەساتەوەبوو، کەبەهەمان دەستوور ڕووداوو بەسەرهاتیش دەگرێتەوە. بەڵام بالێرەدا جیاوازییەکەی نێوانیان ڕوون بکەمەوە. بەڕای من ئەگەر بمانەوێ بیانکەینە سێ زاراوە لە بواری ڕەخنەو لێکۆڵینەوەدا، دەبێ بڵێین: ئەگەر ئەوە کارەسات بێ، ئەوا ڕووداو بریتی دەبێ لە زنجیرەیەك کارەسات، کەدوای کەڵەکەبوونیان لەسەریەکتر، لەشێوەی تەقینەوەیەکدا ڕووداوەکە پێکدەهێنن. کارەسات بەتەنیایی، هەردەم وەك تاشە سەهۆڵێکی ناو دەریا خۆی دەنوێنێ، کە کەمی بەدەرەوەیەو زۆری لە حەشاردایە.

لە کلتێکدا ڕووداو کە ئەنجامی تەقینەوەکەیە، سەراپای دەکەوێتە ڕوو. ئینجا هەر بەم پێیە، بەسەرهاتیش بریتییە لە زنجیرەیەك ڕووداوو هەمان دەستوور لەخۆدەگرێ. بەمجۆرە سێکوچکەی (کارەسات، ڕووداو، بەسەرهات)، دەبنە ئەنجامێکی ئاسایی هەڵسوکەوت و جموجووڵی بەردەوامی کەسان و، بەڵام بەپێی سیستمێك هەڵدەسووڕێن کە ئەگەرچی جەنجاڵ دێتە پێش چاو، کەچی بەباری بنجوبناوانیدا، گەلێ ڕێکوپێکەو هیچ شتێکی تێدا بێمەڵامەت و، بێ (بۆچی) نایەتە ڕوودان.

## 5-کات و شوێن

لە وتاری پێشوودا وتمان کە کەسان (بەمانا مەجازییەکەی)، بەردی بنگۆم نین و پڕبەپڕی بوونیان، بەردەوام لە جموجووڵدان. هەروەکو ئەم

بەردەوام جموجوولەشیان (کارەسات و رووداو و بەسەرهاتەکان)، لە بۆشاییداو بەبەرەڵایی هەڵناسووڕێن، بەڵکو سنوورێك هەیە لە چوارچێوەیان دەگرێ، کە بریتییە لە کات و شوێن. بەڵام ئایا کات و شوێن چین؟. کات و شوێن بەباری کرداری ڕۆژانەدا (نەك بەباری فەلسەفیدا)، پێوانەیەکن و دروستکراوی مێشکی مرۆڤن. بۆیە بەبێپەیوەندی لەگەڵ تەمەنیدا (کە چاکتروایە بڵێین لەگەڵ بوونیدا)، هیچ مانایەك لە بواری کرداری ڕۆژانەیدا نابەخشن. کەوابوو پەیوەندییەکەیە کە ئێمە (لێرەدا ئێمەی چیرۆکنووس)، دەبێ سەرنجمان رابکێشێ و پاڵمان بۆ لێوردبوونەوەی پێوە بنێ، تا چاك شارەزای ببین و لەکاتی کارپێکردنیدا هوشیاربین.

ئینجا بۆ ئەمانیش، وەك چۆن لەگەڵ کارەسات و رووداو وبەسەرهاتدا کردم، بۆ روونکردنەوە نموونەهێنانەوە بەپێویست دەزانم. ئێمە با سەرنج بدەین: کاتێ کە چیرۆکنووسێك دەڵێ: (ئێوارەیەکی درەنگ بوو، زەلامێك لە دەرگای ماڵێکیدا)، دەبێ بزانێ کەئەو لە تەنیا ئەم دەستەواژەیەدا، خۆی رووبەرووی سێ بنەمای سەرەکیی هونەری چیرۆکنووسین کردۆتەوە،/ کە دەبێ دوایی سەرکەوتوانەو بێهەڵەو چەوتی، بەئەنجامیان بگەیەنێ. سێ بنەماکەش ئەمانەن:

1–کات کە دەڵێ: ئێوارەیەکی درەنگ بوو.
2–کەسان کە دەڵێ: زەلامێك.
3–شوێن کە دەڵێ: لە دەرگای ماڵێکیدا.

ئینجا ئاشکرایە کەهەر یەکێك لەمانە، جیهانێکی بەرینی لە پشتەوەیەو، زانیارییەکی فراوان لەگەڵ خۆیدا رادەکێشێتە بەردەمی چیرۆکنووس، کە دەبێ بەهوشیارییەوە لێیان بەئاگابێ و ئەگەرنا، ئەوا دەشێ زۆر قسەی دوایی تری، هەڵەو چەوتییان تێبکەوێ. هەر بۆ نموونە بابڕوانین. ئەو کە دەڵێ: ئێوارەیەکی درەنگ بوو، دەبێ لە زەینی خۆیدا ساغی کردبێتەوە، کە ئاخۆ ئێوارەیەکی درەنگی چۆنچۆنییە؟!.

ئایا دەمی ڕۆژئاوایە، یا ڕۆژئاوابووەو کاتی زەردەپەرە، یا دنیا روو لە تاریکولێڵییە؟. هەروەکو دەبێ لەلای روون بێ کەلەکام وەرزەدایە؟. بەهارە، یا هاوین، یا پایز، یا زستان؟. ئینجا لە سێ حاڵەتەکەی ئێوارە درەنگەکە رووددا؟. چونکە دەشێ دواتر دیاریکردنی سەعاتەکەی بەتووشەوەببێ. ئەو رەنگە بڵێ: سەعات پێنج بوو. لە کاتێکدا لە چیرۆکەکەدا دەریدەخا کە وەرز هاوینەو، سەعات پێنجیش لە هاویندا (لە وڵاتی ئێمەدا)، نابێتە ئێوارەیەکی درەنگ. کەچی لە زستاندا دەبێ.

هەروەها شوێنیش هەر لەو نموونەیەدا، دەبێ هەمان حسابی وردی بۆ بکرێ. پێویستە چیرۆکنووس پێشەکی لە زەینی خۆیدا، زانیارییەکی باشی لەبارەیەوە پێك هێنابێ. یەکەمجار بەپەیوەندیی و بەگونجان لەگەڵ کاتدا، باسمان لێوەکرد. بۆ نموونە: ئایا ئەگەر ئێمە لە حاڵەتی تاریکولێڵییەکەدا بووین، ئەو دەتوانێ بەدوای ئەو دەستەواژەیەدا بنووسێ: (هەر لە دوورەوە، ژمارەی دەرگاکەی خوێندبۆوە)؟!. (بەمەرجێ رووناکییەکی دەسکرد لە ئارادا نەبێ). دووەمجار بەپەیوەندی لەگەڵ خودی شوێن خۆیدا، کەلێرەدا دەرگاکەو دەوروبەرەکەیەتی. واتە سیفەتە تایبەتییەکانی دەرگاکەو دەوروبەری، وەك شوێنێکی دەستنیشانکراوو لە چوارچێوەی شوێندا بەمانا گشتییەکەی.

ئەمە ئەوی راستی بێ نموونەیەکی ساکاربوو، بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ کات و شوێندا. دەنا ئەگەر بۆ باسەکە بچین دەڵێین: کات و شوێن دەفرێکن (بەمانا زاراوەییەکەی)، سەرجەم کەسان و کارەسات و رووداوو بەسەرهاتەکان لەخۆدەگرن. یا وەکی تری بڵێین: کات و شوێن لە هونەری چیرۆکنوسیندا، بەپێی چەند دەستوورێکی تایبەتی، دەبنە چوارچێوەیەك بۆ کەسان و کارەسات و رووداوو بەسەرهاتەکان. بەڵام لێرەدا باهەرزوو ئەوەش بڵێم، کە شێوەکانی رەچاوکردنی ئەم دەستوورانە، بەپێچەوانەی بوونیانەوە لە بواری قانوون و قانوونکاریدا، هێندە بەرفراوان و بەربەرەڵان کە ژمارەیان راست هێندەی ژمارەی، هەموو چیرۆکنووسەکانی لەوەبەرو ئێستا و داهاتووی هەموو دنیایە. کە دەووترێ دەستووری تایبەتی، قەت مەبەست لەبەرگرتن لە سەربەستیی داهێنان و خوڵقاندن نییە. بەڵکوو مەبەست لە دەستووره زانستییەکانی کات و شوێن و، لە چۆنێتیی چوونەبنجوبناوانیانەوەیە. دواجاریش لە چۆنێتی خۆڕزگارکردن لە کەوتنە هەڵەوە تیایاندا، لە هەردوو ڕووی زانستی و هونەرییەوە.

من بەشبەحاڵی خۆم، هێندەی سەرنجم دابێتە هونەرەکە لەلای خۆمان، دەزانم کەلە هەردوو ڕووەوە کۆڵەوارین. لەڕووی زانستییەوە کەمزان و کەمشارەزاین و، بەوە چاوێکمان کەمبینا دەبێ. لەڕووی هونەرییشەوە، کەمتاقیکردنەوەو کەمدەسەڵاتین و، بەوە چاوەکەی تریشمان کەمبینا دەبێ. ئینجا ئەنجام وەها دەکەوێتەوە، کە چۆنێتی مامەڵەکردنمان لەگەڵ کات و شوێندا، کونوکەلەبەری تێدەکەوێ. واتە لەنگەری کەسان و لەگەڵیاندا، کارەسات و بەسەرهات لەناو دەفرەکەدا، کۆك نییەو خواروخێچی تێدایە. لێرەدا بەباشی دەزانم نموونەیەکی تریش بهێنمەوە.. من کە دەڵێم: (ئەم کورسییە دروست کراوە)، پێشەکی لەزەینی خۆمدا دەزانم کەلەوەبەر، واتە پێش دروستکردنی کورسییەکەو پێش ئەم حاڵەتەی کە ئێستا لەبەرچاوە، دارتاش و تەختەو بزمارو..هتد لەکابەدا بوون. هەروەکو دەزانم کە کات و شوێنیش، دەوری خۆیان گێڕاوەو، لە ئەنجامی ئەوان و ئەماندا کورسییەکە دروست کراوەو هاتۆتە بەرهەمو، ئەوەتا ئێستا لەبەردەمی مندایە. ئەمانە وەك وتم و لەوەبەر ئیشارەتم پێدان، زانیارییەکن لە پشتەوەو لە گەنجینەی زەین و بیرەوەشی مندا کەڵەکەکراون کە ئەگەرچی نایانخەمە سەر کاغەزو، لە خودی چیرۆکەکەدا ناچنە ڕیزی درێژەی باسەوە، بەڵام لە ساتبەساتی نووسینی چیرۆکەکەمدا، لەگەڵمدا حازرن و لەکایەدان.

بەم پێیە من لەلای خۆمەوەو بەپێی بۆچوونی خۆم، دەگەمە ئەو ئەنجامەی کە چیرۆکنووس بۆ دەربڕینی تەنیا یەك جۆر زانین لە چیرۆکێکدا، پێویستی بەپەنابردنەبەر سەدان جۆر زانینی دووتوێی، مێشك و بیروهۆش و ناو پێچوپەنای زەینی خۆی دەبێ. موعادەلەکە ئاشکرایە.. با لایەنە هونەرییەکە لەولا بوەستێ و، با باسمان لە زانین و زانیاری بێ. من ئەگەر زاناتر نەبم، چۆن بتوانم زانین و زانیاریی زیاتر رابگەیەنم؟. بۆیە ناچار دەبم بڵێم: هەر لێرەوەیە کە دەووترێ: فڵانە چیرۆك پڕوچڕە لە ماناو مەغزاو، فیسارە چیرۆکیش پووت و بەتاڵە.

بەهەرحاڵ، هەڵسووڕاندنی کات و شوێن و چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، یەکێکە لەکارە هەرە سەختەکان لە هونەری چیرۆکنووسیندا کە چیرۆکنووس دەبێ، رەنجی فەرهاد بۆ تێگەیشتنیان بدا.

## 6-تەکنیك

ئێستا واوتمان زمانی چیرۆکەکەمان کۆکە. واگریمان کەسانیمان ڕێکوپێك هەڵبژاردوە. وا دامان نا کارەسات و ڕووداوو بەسەرهاتیمان چاك هۆنیوەتەوە. وا ڕێکەوتین کە دەفری کات و شوێنی شیاویشمان بۆ سازداوە. بەلام ئایا چیرۆکەکەمان ئیتر بووە بەچیرۆکێکی پەسەندی سەرکەوتوو؟!. هەرگیز نا.. چونکە هێشتا ماومانە.. هێشتا مەرجی تر (واتە نهێنی تر)مان ماون، کە دەبێ زەفەریان پێ ببەین، تابتوانین هەنگاوێکی تر چیرۆکەکەمانیان پێلەسەرکەوتن نزیك بکەینەوە. یەکێکیش لەوانە مەسەلەی تەکنیکەو هەر خێراش دەپرسم: تەکنیك یانی چی؟!. لە وەرامدا بەکوردییەکەی دەڵێم: تەکنیك یانی وەستایی.. ئاهەر راست یانی وەستایی. من نامەوێ پێچوپەنای تێبخەم و بچمە گێژاوی زاراوەو زاراوەکارییەوە. من دەڵێم: تۆ هەروا سەنج بدەرە دەوروپشتی خۆت و بازنەکەشی فراوان و فراوانتربکە، تا سەرانسەری هەموو دنیا دەگریتەوە. تۆ چاوو گوێ و بیروهۆشت بگێرەو وردبەرەوە، بزانە ئەو خەڵکە چۆن لە ژیاندا هەڵدەسووڕێن!. ئینجا تۆ بروانەو بزانە چۆن کاری ئەو ژیانە هەڵدەسووڕێنن!. گومانی تێدانییە وەکوو من دەبینیت، کە زنجیرەیەکی بەرفراوان کاری بەڕێ دەکەن.. کاری گەلێ جۆراوجۆر، کە بەهەموویان ڕەوڕەوەی ژیان دەخەنە گەڕو، ئیدامە بەو گەڕدانە دەدەن. دیارە من لێرەدا بایەخی کارەکانم بەبەراوورد لەگەڵ یەکتردا مەبەست نییە. هەروەکو دەخڵم بەسەر شێوە زنجیرەییەکەشیانەوە نییەو، بۆ ئێرە هەریەکەیانم بەجیا پێدەوێ. وردبوونەوە لەهەر یەکەیان، لەهەرە بێبایەخیانەوە تا هەرەبەبایەخیان بەجیا لەیەکتر. ئەمەیان دەمگەیەنێتە مەبەستەکەم و دەڵێم: کێ هەیە بەوەستایی لە دایك بووبێ؟!. بێگومان وەرام دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە دەڵێ: لە بواری کاردا (بەو مانایەی کە شیعر وتن و چیرۆکنووسین و کەمانچەلێدان، یا دوو فلیقانەکردنی ئەتۆم و پیتاندنی ناو لوولەو دۆزینەوەی دژە مادە، یا دارتاشی و ئاسنگەری و زەویکێلان بەگاجووت، هەموو هەر کارن)، قانوونێکی ساکار لەبارەیەوە هەیە دەڵێ: هیچ وەستایەك لە کارەکەیدا، بەوەستایی لە دایك نابێ. ئینجا ئەگەر قانوونەکە خۆیشی وورد بکەینەوە، دوو ئەنجامی ترمان دەست دەکەوێ. یەکەمیان دەڵێ: هیچ وەستایەك بەبێکۆششکردن نابێ بەوەستای چاك.. چاك بەمانای لێهاتوو. ئەوی راستی بێ من ئەم راووڕێوییەم بۆیە هێنایەوە، تا لە بواری تەکنیکدا (واتە وەستایی لە هونەری چیرۆکنووسیندا) بڵێم: راستە کە بەهرە وەك سیفەتێکی خۆڕسك لە مرۆڤدا، دەورێکی بالا لە هاتنەکایەوەی چیرۆکنووسێك لە کۆڕی هونەرەکەدا دەگێڕێ. بەلام ئاشکرایە کە بەهرە بەتەنیا چیرۆکنووسی چاك دروست ناکا، بەڵکوو ئەو بەهرەیە دەبێ بەسەرێك ئاووهەوای لەبارو تایبەتیی خۆی بۆ هەڵبکەوێ، تا وەك تۆوێکی بنخاك بروێت و، لە خامۆشییەوە بەرەو نەشونماکردن و گەشانەوە ڕێگا بگرێتە بەر.

بەسەرێکیش دەبێ پەروەردەکردنی بچێتە پاڵ تا بێتەبەرو، بەرەکەیشی ببێتە خۆراکێکی سوودبەخش، کەلێرەدا خۆراکی گیانە. بەم پێیە دەتوانین بڵێین: هونەری چیرۆکنووسین لەلای چیرۆکنووسێکی سەرکەوتوو، تەنیا لە سەرەتادا وەك بەهرە خۆی دەنوێنێ، دەنا دوایی سنعات و ئیتر لە ئاکامیدا دەبێ بووترێ: تەکنیك یانی وەستایی.. یانی شارەزایی و پەیبردن بەهەموو پێچوپەناو نهێنییەکانی پیشەو سنعاتە، کە دواجار یانی راهاتن لەسەر نووسین، بەپێی ئەو هەموو شێوە جۆراوجۆرانەی، کەپەیبردنەکە بەپێچوپەناو نهێنییەکان، دەیخەنە بەردەم چیرۆکنووس.

ئینجا ئالێرەدا بەپێویستی دەزانم، سەرنج بۆ مەسەلە هەرەبایەخدارەکە رابکێشم، کە مەسەلەی جیاوازیی نێوان سنعاتکارە ئاسایی و نائاساییەکەیە. گومانی تێدا نییە کەلەم بواری سنعاتکاریەدا، لەهەرە بێبایەخەکەیەوە بیگرە تاهەرە بایەخدارەکەی، ئەوانەی لەم ژیانەدا زۆربەی هەرە زۆر پێکدێنن ئاساییەکانن. لە کاتێکدا نائاساییەکان بەمانای ئەوانەی، کە لێهاتووانە کارەکانیان بەئەنجام دەگەیەنن و داهێنان و خوڵقاندنیان تێدا بەدی دێنن، دەبنە ژمارەیەکی زۆر کەم. خۆ ئاشکراشە کەهەر ئەم ژمارە کەمەن، کە چۆنەکی (النوعیە)، دەبنە سەرقافڵەی کاروانی گۆڕان و بەرەوپێشەوەچوون. ئەمەش دەستوورێکە لە بەرەبەیانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە، وەها هاتووەو تا ئێستاش وەها دەڕوا.

کەوابوو هێندەی مەسەلە پەیوەندی بەهونەری چیرۆکنووسینەوە هەبێ، دەبێ بەلامانەوە سەیر نەبێ کەچ ئێمەو کەچ هەر نەتەوەیەکی تر، ژمارەیەکی زۆر وەستای چیرۆکنووسینمان هەبن، بەلام ژمارەیەکی کەمیان وەستای چاك و لێهاتوو.. وەستای داهێنەرو خوڵقێنەربن.

## 7-وردەکاری

ئاخۆ کێ بووبێ یەکەمجار، زەفەری بەبەکارهێنانی خوێی لە خۆراکدا بردبێ؟!.

ستەمە بتوانرێ کەسەکە دیاری بکرێ. بەلام خۆ ئاسانە بووترێ: هەرکەسێك بووبێ چاکی کردوە، چونکە بەدەستووری کابرای لەمەڕ یەکەمجاری بەکارهێنانی ئاگر (هەر بۆ خۆراك)، هونەرێکی تێکەڵ بەخۆراکە رووتەکە کردوە. بەڵێ.. خوێ و لەگەڵیدا بەهاراتیش، کە هەموو دەزانین لە ڕۆژگارێکی ئەو نزیکانەی مێژووی مرۆڤدا، لەسەری بووە بەچ فەرتەنەیەك، دوو کەرەسەن و راست پەیوەندییان بەدوو زاراوەی هونەرییەوە هەیە، کە بریتین لە (تام)و (چێژ). دەنا خۆ شێرو پڵنگ کە دوو زیندەوەرن لە بابەتی ئێمەی مرۆڤ، خوێ و بەهارات بەگۆشتی ئەو نێچیرانەوە ناکەن کە دەیانخۆن. مەبەستم ئەوەیە بڵێم: مەسەلە پێویستییەکی بایەلۆجی نییە، کەوامان لێدەکا خوێ و بەهارات لەگەڵ خۆراکدا بخۆین. ئەگەر وابوایە، دەبوو لەگەڵ شێرو پڵنگدا، لەسەریان بکەوتینایەتە عەجەب زۆرانبازییەکەوە. بەلام سروشت کاری خۆی باش سازداوە. ئاسایی خوێ و بەهاراتی لە گۆشتی نێچیرەکانیاندا بۆ رەخساندوون و، شەڕوهەراکەی لەسەریان وازلێهێناوە، بۆ ئێمەی مرۆڤی ئاقڵ و ژیر!.

بەهەرحاڵ دەمەوێ بڵێم: یەکێکی تر لە نهێنییەکانی هونەری چیرۆکنووسین وردەکارییە. وردەکاریش یانی خوێ و بەهارات. بەم مانایە تۆ دەتوانیت بەم شێوەیەی لای خوارەوە، چیرۆکێکی سەرکەوتوو بنووسیت: تۆ بڕوانە.. دوای مسۆگەرکردنی ئەو مەرجانەی لەوتارەکانی پێشوودا باسمان کردن (زمان، کەسان، کارەسات و رووداوو بەسەرهات، کات و، شوێن، تەکنیك)، ئینجا دێیت هەندێ خوێ و بەهارات (وردەکاری)شیان تێکەڵ دەکەیت و ئیتر.. خەریك بوو بڵێم: ئیتر پشتی لێدەکەیتەوە. بەلام نا.. جارێ با لێت بپرسم: هەندە بەهاتەکەت چ بابەت

بوونو چۆنت بەسەرداکردن؟!. پاكو پوختو عەترلی بوون،؟ یا پۆخڵو بێرەنگو بۆ؟!. کەمت بەسەرداکردوون، یا زیاد، یا بەقەدەر پێویست؟!.. هتد. وەرامی ئەم پرسیارانەن کە بەئەنجامی چاك یا خراپت دەگەیەنێ.

کەوابوو وردەکاری یانی بەخشینی تامو چێژ بەچیرۆك. یانی ئارایشتکردنی رووخسارو جوانکردنی. یانی پۆشینی بەبەرگێکی ئاڵووالای رەنگاو رەنگی دڵفرێن. مەسەلەش پەیوەندیی بەناوەوەی چیرۆکەکەوە نییە، بەو مانایەی گوایە بڵێین: چۆن دەکرێ بەسەرهاتێکی پڕ لە جەخار، ئارایشت بکرێو بەرگی ئاڵووالای لێبپۆشرێ؟!. نا.. مەسەلە پەیوەندیی بەجوانکاریی نووسینەوە هەیەو، ئەمیش بەمانا هونەرییە فراوانەکەی، نەك بەحسابی کۆکیو رەوانیی ماناو مەغزاکەی. بەڵام ئایا مەبەستمان لەمانا هونەرییە فراوانەکە چییە؟. مەبەستمان لەو وردەکارییانەیە کەوەك چەندین لقوپۆپ، لە تەکنیك (وەستایی) دەبنەوە. واتە ئەگەر تەکنیك بریتی بێ لە رەنگرشتنی چوارچێوە گشتییەکەی بینای چیرۆك، ئەوا وردەکاری بریتی دەبێ لە دیکۆرەکەی. خۆ خانوو بێدیکۆریش هەر خانووەو بەکەڵکی تێدانیشتەجێبوون دێ. یابا نموونەکە بەرفراوانتر بکەین.. ئەندازیارێك (لێرەدا چیرۆکنووسێك) کەم شارەزایەو دیکۆرێکی جوانیشی دەخاتە پاڵ. دیکۆرەکە دەیرازێنێتەوەو، قەشەنگو جوان دەیخاتە بەرچاوو دڵ. بەم پێیە ئەو چیرۆکیان بێدیکۆرەو بێجوانکارییەو، لایەنی کاریگەریی هونەرییەکەی لە دەست داوە. لە کاتێکدا ئەم چیرۆکیان بەپێچەوانەوە. خۆ ئەویشیان وەك خوێندنەوە دەخوێنرێتەوە، بەڵام کەمتر کار لە هەستونەستو بیروهۆش دەکا. لە کاتێکدا ئەمیان، هەم دەخوێنرێتەوەو هەم زۆریش کار لە هەستونەستو بیروهۆش دەکا. بگرە خوێنەر دەخاتە بەرحاڵەتی رامانو سەرسامیو گەشکەدارییەکی ئەوتۆوە، کە ناچاردەبێ بەدەم ساتبەساتی خوێندنەوەیەوە، بەردەوام ئافەرینی چیرۆکنووسەکە بکاو، ئەمەش نوقڵانەی سەرکەوتنە. من راستە کەلەرێگەی شێوەی نووسینەکەمەوە، ناوەرۆکێك بەخوێنەر دەبەخشم.. ماناو مەغزایەکی دەدەمێو پەیامێکی پێڕادەگەیەنم (کەلە وتارەکانی داهاتوومدا ئیتر لەم لایەنەی هەنەری چیرۆکنووسین دەدوێم)، بەڵام خۆ من (منی چیرۆکنووس) وتارو لێکۆڵینەوە نانووسم، بەڵکوو من چیرۆك دەنووسم.

ئێستا بابێمەوە سەر پرسیارەکە: وردەکارییەکە، یا جوانکارییەکە، یا ئەو دیکۆرەی چیرۆکەکەی پێدەرازێتەوە لە کوێدایە؟. بێگومان درێژەپێدان کارێکی بێهوودەیە، چونکە باسەکە پەیوەندیی بەپڕی یا بەبەتاڵیی هەگبەی هەر چیرۆکنووسێکەوە هەیە. بەڵام وەك سەرەقەڵەم هەندێك لەو شتانە ریزدەکەم، کەدەشێ ببنە دیکۆر وەك: (قسەیەکی نەستەق، یەکێکی بەپێکەنین، یەکێکی تری گوچکبڕ، وەسفێکی کاریگەر، زانیارییەکی نەبیستراو، فکرەیەکی تازەباب، فێڵێکی رەوا، پێچوپەناتێخستنێکی لەزەتبەخش، برووسکەدانێك بەبیروهۆش، مووچرکەبەخشینێك بەهەستونەست، هەموو بابەتە جوانکارییەکانی زمان، ئاماژەکردن بۆ رەمزێك، بارکردنی دەستەواژەیەکی خۆکرد..هتد.

## 8-مەغزا

دەبینن؟!.. دەڵێم مەغزاو ناڵێم مانا یا ناوەرۆك یا فیکرو ئایدیۆلۆجیا یا فەلسەفە.. هتد. من بۆ ئاسانکردنی راگەیاندنی ئەوەی لێرەدا مەبەستمە، مەغزام لە هەموو ئەو زاراوانە پێچاکترە، ئەگەرچی ئەوانیشم هەر پێویست دەبن، چونکە هەردەبێ بابدەمەوە سەریان. ئینجا وابەبۆنەی ئەم مەسەلەی مەغزایەوە، جارێکی تر هەنگاوەکان ریزدەکەمەوە دەڵێم: من کاتێ دەستم دایە نووسینی چیرۆکێك، سەیرم کرد وازمان کۆکە، کەسان پڕبەپێستن، کارەساتو رووداوو بەسەرهات کاریگەرن، تەکنیك پتەوە، وردەکاری دڵگیرەو ئیتر دوای ئەمانە چیی تر؟!. تۆ بڵێیت هیچی تر مابێ؟!. ئابەڵێ ماوەو ئەوەشی ماوە، کوردواتەنی شیلەو شەکرەکەیەتیو، خۆم واتەنی مەغزاکەیەتی.. واتە مەغزای ئەو چیرۆکەی ئەو هەموو بیناکارییەی تێداکراوەو، ئەو هەموو کەرەستانەی بۆ بەکارهێنراون. یابا وەکی تری بڵێینو بپرسین:

ئایا تۆیەك کەئەو هەموو ئەرکەت کێشاوەو، لەو هەموو رووبارە خوڕانەت داوەو، سەرکەوتوانە لێیان پەڕیوێتەوە، مەبەستت چی بووەو ویستووتە بەچ ئەنجامێك بگەیتو چ نیشانێك بپێکیت؟!. گومانی تێدا نییە کە تۆ دەبێ شتێکت مەبەست بووبێ بیڵێیت.. شتێك کە وتنی دەبێتە بەخشینێك لە تۆوە بۆ کەسانێك کە دەتخوێننەوە. دیارە بەخشینەکەش (وەك تۆ لە بیرو هۆشو لەزەینی خۆتت گرتوە)، پوختەی بۆچوونو باری سەرنجێکە، سەبارەت بەکاروکردارێك لەو ژیانە پانوبەرینەدا، کە تۆو خوێنەرەکانت تیایدا هەڵدەسووڕێن. بەڵام هێندە هەیە کە تۆ کاتێ هاتوویت لەچیرۆکەکەتدا لەو کاروکردارە دواویت، بەو سیفەتە بووە کە تیایدا پسپۆڕیتو، دوای جۆشدانی لە بۆتەی بیروهۆشی خۆتدا، گەیشتوویتە باری سەرنجو بۆچوونێکی ئەوتۆ، کەلەوت تێپەڕاندوەو پوختەترو باڵاتر لەڕادەی تێگەیشتنی ئەوێکی نوقمی گێژاوو کاروکردارەکە لە رەوتی رۆژانەی ژیانیدا، تێی گەیشتوویتو ئەنجامت بەدەستەوەداوە.

بەم پێیە چیرۆکنووس لەکاتی نووسینی هەر چیرۆکێکیدا، دەبێتە کابرایەکی وێڵی دوای پوختەقسە یا باڵاقسە. پوختەقسەش هەردەم رووەو حیکمەت خۆدەکوتن. وتە کاتێ دەگەنە بەرزترین پلەی رەوایی و لە رەهایی تەواو نزیك دەبنەوە، بەرگی ئەو حیکمەتە دەپۆشن، کە وەك زادەی مێشكو بیری چەندین سەدەی تەمەنی مرۆڤایەتی، دەکەونە سەرزاری نەوە لەدوای نەوەی خەڵکی. سابەم مانایە چیرۆکنووس زۆروکەم، سەر بەحیکمەتییەکەشی هەزارویەك جۆری هەیە. ئینجا هەر ئەم هەزارو یەك جۆرییەشە، کە بواردەدا هەزارو یەك چیرۆکنووس لەیەك کاتدا لەکایەدا هەبن. لەلایەکی ترەوە ئەمە وامان لێدەکا، کەقەت بەبێبایەخ نەڕوانینە هیچ کام لەو چیرۆکنووسانەی، لە بەرهەمەکانیاندا خاوەن حیکمەتن، با حیکمەتەکەشی وا بنوێنێ، کەلەچاو یەکێکی تردا کەمبایەخە. چونکە گرفتەکە لەم لایەنەی هونەری چیرۆکنووسیندا نییە، بەڵکو لەو لایەنەدایە کەکابرا هەر لە بنەڕەتەوە بێحیکمەت بێو، چیرۆکەکەشی هەر لە بنەڕەتەوە، پووچو بەتاڵ بێ لە حیکمەت. ئەو راستە دێت کەرەستەکانی هونەری چیرۆکنووسین، لە بینای چیرۆکەکەیدا بەباشی بەکاردێنێ. بەڵام کاتێ دێینە سەر مەبەست..

سەر پوختەقسەو بالاقسە.. سەر حیکمەت، هیچی تێدا نابینین و ڕووبەڕووی ئەنجامێکی پەشمەکی دەبینەوە. ئەنجامی پەشمەکیش ڕاست بەزایەچوونی هەموو کەرەستەکانی تر دەگەیەنێ. یا کوردواتەنی: ریسەکە دەکاتەوە بەخوری!.

بەمجۆرە مەغزا لە هونەری چیرۆکنووسیندا، بریتییە لەو پوختەقسەیە، یا بالاقسەیە، یا ئەو حیکمەتەی کە چیرۆکنووس دەیەوێ، وەك سەرئەنجامێك بەخوێنەری ڕابگەیەنێ. ئەمەش قەت نابێ ئەو مانایەبدا کە گوایە چیرۆکنووس، ببێتە ئامۆژگاریکەرێك و ڕاستەوخۆ بڵێ: وابکە چاکەو وامەکە خراپە. نەخێر.. ئەو هەرچەندە لە ئەنجامدا هەروا دەکەوێتەوە، کە بەپێی بۆچوون و باری سەرنجی خۆی و، بەپێی ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفەی خۆی (ئیتر سا زادەی بیری خودی خۆی بن یا هی یەکێکی ترو باوەڕی پێهێنابن)، جۆرێك لە داکۆکی و بانگهەڵدان بکا، بەڵام نایخاتە قاڵبی ئامۆژگاریکردنەوە. یا نایگەیەنێتە ڕادەی دروشمکاریی زەق و پڕوپاگەندەی سیاسییانەی ڕووت. چونکە ئەو ئەگەر ڕاستەوخۆ ئەم لایەنەی بۆ ئایدۆلۆجیاو فەلسەفە مەبەست بێ، ئەوا شێوە نووسینی تر هەیە کە دەتوانێ پەنای بەرێتەبەر. ئاشکراشە کە ئەوێکی قەڵەمبەدەستی خاوەن توانای نووسینی چیرۆك وەك کارێکی هونەری، دەتوانێ ئەو قەڵەمە (ئەگەر تەرخانی بکا) بۆ شێوەکەی تریش، بەباری خۆیدا بیخاتەکار.

بەهەرحاڵ کورتەی مەبەستم ئەوەیە، کە چیرۆکنووس باهەموو کەرەستەکانی تری هونەرەکەش بەباشی بەکاربێنێ بەڵام ئەگەر مەغزایەکیان پێبەدەستەوە نەدا (هەر مەغزایەك کەڕادەی بایەخەکەی دوایی دەبێتە ئەرکی سەرشانی ڕەخنەو لێکۆڵینەوە)، مانای وایە کەکاکی چیرۆکنووس، ریسەکەی بۆتەوە بەخوری!.

## 9-بیروباوەڕ (ئایدۆلۆجیا)

لەوتاری پێشوودا وتمان کەهەر چیرۆکنووسێك، مەغزایەکی مەبەست دەبێ و دەیەوێ لە نێوانی چیرۆکەکەیەوە، بەخوێنەری ڕابگەیەنێ. ئینجا گومانی تێدا نییە کە ئەو مەغزایەش، هەردەم وەك زادەی بیروباوەڕ (ئایدۆلۆجیا)ی چیرۆکنووسەکە، خۆی بەدەستەوەدەدا. ئەو کاتێ مەغزاکە لەدڵ دەگرێ لە مێشکی خۆیدا تاووتوێی پێدەکا، وەك کارێکی ئاسایی و لەیەك کاتدا، بەدووباردا مامەڵەی لەگەڵدادەکا:

یەکەم: هەر لەگەڵ لەدڵگرتنیدا، وەك پرۆژەیەك لە بیروباوەڕەکەی خۆیەوەی هەڵدەهێنجێ. دووەمیش: بەدەم دەربڕینییەوە (کاتێ دەیخاتە چوارچێوە هونەرییەکەوە کە چیرۆکەکەیە)، چاکتر گەڵاڵەی دەکاو، لەگەڵ ئەو بیروباوەڕەدا دەیگونجێنێ. خۆ دیاریشە کە ناڵێم: چیرۆکنووس (خوانەخواستە وەك ئەسپی عارەبانە- داوای لێبوردنیش دەکەم بۆ ئەو لەیەکچواندنە)، کرداردەکاو پێچکەش دەخاتە ژێر چیرۆکەکەی و بەڕێوەی دەبا!. هەرگیز نا.. ئەگەر وابوایە، چیرۆکنووسین هەر لە بنەڕەتەوە وەك ئەو هونەرە باڵایەی کەهەیە، نەدەهاتە ئاراوە. یا دەهات و بەڵام لەشێوەی نووسینی وتاری تێنەدەپەڕاند. یا لەمیشی تێدەپەڕاند، بەڵام تەنیا لە کۆمەڵە ئامۆژگری و بانگهەڵدان و ڕێنیشاندانێکی ڕووت بەولاوە نەدەبوو. خۆ قسەی خۆمان بێ، لە و بابەتە چیرۆکەش لەوەبەر زۆر هەبوون و ئێستاش هەن و لە داهاتووشدا هەردەبن. بەڵام هێندە هەیە کە ئەوانە، تەنیا بەناو دەچنە خانەی چیرۆکەوە، دەنا وەك چیرۆك مایەپووچ دەردەچن.

بەهەرحاڵ ئێمە کە باسمان لە بیروباوەڕە، دەبێ بگەڕێینەوە سەری و بپرسین: بیروباوەڕ خۆی چییەو ئینجا لای چیرۆکنووس بەپابەندی لەگەڵ مەغزادەکەدا چی دەگەیەنێ؟. ئاشکرایە من لێرەدا مەبەستم لە بیروباوەڕ، مانا فراوانەکەیەتی نەك مانا تەسکە سنووردارەکەی، کە پابەندی (ئیلتیزام) بەیەکێ لەو ئایدۆلۆجیا جۆراوجۆرانە دەگرێتەوە، کەلە ڕۆژگاری ژیانی چیرۆکنووسەکەدا لەکایەدان. ئەمیان حسابێکی تایبەتیی خۆی هەیەو، وتارێکی تایبەتیی پێدەوێ کە ڕەنگە باسلێکردنی، هەم کەمێ سەختوستەم و بێ و هەم کەمێکیش ئاڵۆز.

ئەی ئایا مانا فراوانەکە کامەیە؟. ئەمیان ئەوەیە کە دەتوانرێ وەك دەستوورێك بوترێ: لە ژیاندا هیچ کەسێك نییە، بیروباوەڕێکی تایبەتیی بەخودی خۆیەوە نەبێ. ئیتر لە شێوە هەرە ساکارەکەیەوە لەلای نەخوێندەوارێکی کاڵفامەوە بیگرە، تا دەگاتە لای خوێندەوارو ڕۆشنبیرو زاناو فەیلەسووف و تەنانەت، نەخوێندەوارێکی دنیادیدەی زۆر تێگەیشتووش. چونکە ئەو خەڵکە، نەك تەنیا ڕۆشنبیرەکان، بەڵکو ڕەشۆکییەکانیشیان، بەدەم بەسەربردنی ساڵانی ژیانیانەوە، دەبینن و دەبیسن و فێردەبن. دواجار قسەدەکەن و ڕادەردەبڕن و هەڵوێست دەنوێنن، با مەسەلەش بریتی بێ لە تەنیا زۆرانبازییەیە کە تووشی قسەکردن و ڕادەربڕین و هەڵوێستنواندنیان دەکاو لەگەڵیاندا، کردارو هەڵسوکەوتی تایبەتیش. بەم جۆرە لە ئەنجامدا دەبێتە خاوەن بیروباوەڕ.. جۆرێك لە بیروباوەڕ کە بەردەوام لە ڕەوتی ژیانیدا ڕەنگ دەداتەوە.

سا ئەگەر دەستوور وەهابێ کە هیچ کەسێك لە چیاندا بێبیروباوەڕ (بەمانا فراوانەکەی) نەبێ، ئەوا چیرۆکنووسیش وەك یەکێك لەو خەڵکە، دەبێ خاوەنی بیروباوەڕێکی تایبەتی بێ بە خودی خۆیەوە.

ئینجا کەوەهابوو، دیارە دەبێ ئەو مەغزایەی لە چیرۆکەکەیدا بەدەستییەوە دەدا، هەم لەو بیروباوەڕەوە هەڵقوڵابێ و هەم لەگەڵیشیدا گونجابێ. خۆ ئەوەش ئاشکرایە کە ئەو چیرۆکنووسە، هونەرەکەی بەدەستەوە دەبێتە ئامرازێك، یابۆی دەبێتە ڕێگایەك و بەهۆیەوە بواری بۆ دەڕەخسێ، ئەو بیروباوەڕەی بەخەڵکی (کە بەڕادەی یەکەم خوێنەرەکانێ) ڕابگەیەنێ. ئینجا ئێوە ئەگەر ئێستا بگەڕێنەوە سەر وتاری یەکەمم (پێشەکی دوو پرسیار)، دەبینن کە مەسەلە لێرەدا بادانەوەیەکی بۆ لای ئەو پرسیارە تێدەکەوێ کە دەڵێ: ئایا چیرۆکنووس بەچی چیرۆك دەنووسێ؟!. بەم پێیە کارواکەوێتەوە کە بڵێین: کاتێ چیرۆکنووسێك لە چیرۆکەکەیدا مەغزایەکت بۆ دەخاتە بەربیروهۆش، بەوە لایەنێکت لە بیروباوەڕی خۆی سەبارەت بەژیان پێڕادەگەیەنێ. بۆچییش پێتی ڕادەگەیەنێ؟!. بێگومان بۆ قایلکردنت بەو لایەنەی بیروباوەڕەکەی خۆی و، بۆ هاندانت کە لایەنگیری بیت و بگرە لەلای خۆتەوە، پەیڕەویشی بکەیت.

سا هەر ئەمە دەری دەخا کە چیرۆکنووسی (بەهەق چیرۆکنووس)، چ بایەخێکی هەیەو چ ڕۆڵێکی لە ژیاندا دەگێڕێ.

سەرچاوە: نوسینەکانم لە بواری ڕەخنەو لێکۆڵینەوەدا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

# بەشێ لە ڕۆمانی هێلانە

—2—

ئاسمان بواری تەنیا سەعاتەوەختێك ڕێبڕینی پێدان و ئیتر لێی هەڵپێچان. سەرەتا بەکڕێوەو پڕووشە دەستی پێکرد. ماوەیەك درێژەی کێشاو ئەمان پێی قایل بوون. جافر زوو زوو دووپاتی دەکردەوە کە بەڵکوو بارینی درۆزنە بێ و مۆڵەتی تاسبەینێ یان بدا. هەر بەیناو بەینێك ڕادەوەستاو دەیڕوانییە ئاسمان. دەیووت:

—مەرد بەو قووتی بدەرەوە. تۆ وەکوو ئێمە نیت. ئێمە تەنیا ئەمشەومان هەیەو تۆ شەوەها. ئەمشەومان پێببەخشەو ئەوەکانی تر، حەزدەکەیت بیکە بەزریانێك ئەوسەری دیارنەبێ!.

ئەم پێی پێدەکەنی. دەیووت:

—دەڵێیت زەلامێك دەدوێنێ کە بەڕاستی، لەوێ دانیشتبێ و دەستی بەقفلێکەوە بێ، خەریکبێ وردە وردە بەری بداتەوە!.

—بەڵکوو وابێ.. کێ چووزانێ؟!..

هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین. بەڵام هێشتا قاقایان کپ نەبووبۆوە کە وەڵامی دانەوە. لە ناکاوێکدا پڕووشەی لێکردن بەهێلکە باڕۆکەیی. ئەو کاتە بەقەد پاڵی کێوێکی چڕستاندا، شەفتوول سەردەکەوتن. قەدپاڵێکی گڵین بوو.. گڵێکی ئاڵی گەش. لەژێر پێیاندا، دەبووە قوڕێکی خەستی لووس. هێشتا وانەبوو توێژاڵی بەفر، بکەوێتە نێوانەوە. زوو زوو هەنگاویان دادەخزاو بێزاری دەکردن. جافر هەستی بەم کرد کە داخزان دوای دەخا. دە دووازدە شەقاوێك ماوە کەوتبووە بەینیانەوە. ڕاوەستا تا گەیشتە ئاستی. وتی:

—هەر ئەم قەدپاڵەیەو سەرووتر بەردەڵانە. هێندەشمان نەماوە.

قەدپاڵیان بڕی و چوونە سەر بەردەڵان. پێڵاویان پاك کردەوەو سووکەڵە بوونەوە. ماوەیەك پێچاو پێچ بەنێوان، زنجیرەیەك تاوێردا سەرکەوتن، کە چین چین سەرەوژوور ریزیان بەستبوو. ئەو وەختە بەفر، توێژاڵێکی لە ژێر پێیاندا پێکهێنابوو. خرمەخرمەکەی لەو چیاو چۆڵە خامۆشەدا، ئاوازێکی کاریگەری بەگوێیاندا دەدا. لەوەبەدوا دەگەیشتنە ئاودڕێك و دەبوو بەوێدا، بگەنە سەر ترۆپك و ئەوسا، شۆڕببنەوە بۆ ناو دۆڵ. هەردووکیان لە ستەمیی بڕینی، تاتی دەم ئاودڕو بەوشکی و بەڕۆژیش باش ئاگاداربوون، چ جایە توێژاڵی بەفری بەسەرەوە بێ و شەویشبێ!. ئینجا وەرە تاتیش ئەمە بێ، کە جافر چەند جارێك بەخزمەتی گەیشت بوو، دەیزانی چەند سەخت و نەگریسە!.

بۆ گوڕبەستنەوە لە تات، لەسەر داوای جافر لایان دایە بن تاشە بەردێکی چەماوە، کە دەتووت بەتایبەتی بۆ حەوانەوەی ئەمان، خۆی کردۆتە چەتر. تەنانەت جافریش داواکەی هەر بەو مانایە دەربڕی. بەڵام چەتر تەنیا بۆ ئەمان نەبوو. بەڵکوو دەعبایەکیش بەر لەمان، بەپێی ئەو مافەی ئەمان و بگرە لەمان لە پێشتریش هەیبووە، خۆی لە بنەوەیدا لە کون نابوو. هەر هێندەی ئەمان پێیان تێنا، ئەو ڕاست بەپێی ئەو مافە لە پێشترەی، بەمرەمڕێکی پڕ لە حیرس و تووڕەییەوە، دەنگی ناڕەزایی بەروودا بەرزکردنەوە. ئەمان سڵیان کردەوەو کشانەوە. جافر دەمانچەکەی دەرهێناو خستییە سەرپێ. ئەم وتی:

—تەقەی لێدەکەیت؟!.

ئەو وتی:

نا نایکەم.. بەڵام نەوەکوو دەعبایەکی دڕبێ!. تۆ کەلابکەوە.. با ئەملاو ئەولا بۆی بوەستین!.

وایان کردو ئەم سەری سوڕما، کە جافر بەچەشنی دەعباکەو توندوتیژتر، دەستی کردە مڕەمڕ. بگرە وتی:

—دەی تۆش وەك من بکە!.

ئەم جگە لە سەرسوڕمانەکە، ئەوەشی خستەبان کە وتی:

—ئەی ئاخر گوناح نییە؟.. بۆچی وازی لێنەهێنین؟!..

بەڵام کە ئەو بەدەنگێکی، تێکەڵ لە پەستی و گاڵتە پێهاتنەوە وتی:

—کوڕە تۆ دەڵێیت چی سوبحان!.. گوناحی چی؟!..

ئینجا وەك دەستی پێکرد. بوونە دوو دڕندەو بگرە سێ و چواری لە دەعباکە کەللەشەقتر، چونکە جافر بەسێ جۆر دەیگۆڕی. ئیتر دەعبای بەسزمانیان دەرفرتاندە دەرەوەو ژێر چەتریان لێداگیر کرد. تەنانەت ئەو گەرماییەش، کە بەوزەی ناو لەشی خۆی، بەجێگاکەی بەخشی بوو. کە پاڵیان دایەوە بێئەوەی بیەڵن ترووسکەی ئاگریان ببینرێ و یەکی جگەرەیەکیان ئاگردا، ئەم وتییەوە:

—گوناح بوو.. لانەمان لێتێکدا. ئاخۆ ئەگەر زمانی ببوایە، ئێستا چیی پێدەووتین؟!.

جافری هاوڕێی تەمەن، کە لە منداڵییەوە دەیزانی مۆخەکەی ئەم چیی تێدایەو جافری پێشمەرگەی بەکێویبوو، وەڵامی جۆراوجۆری پێبوو بیداتەوە. بەڵام سەرەتا بەبارە ساکارەکەدا وتی:

—خەمت نەبێ.. ئەگەرچی ئێمەش خەڵکی ڕەسەنی ئەم کەژو کێوانەین، بەڵام ئەو خەڵکی ڕەسەن ڕەسەنێتی. ئەو سەد شوێنی تری وەکوو ئێرە پێدەزانێ و پەکی ناکەوێ. ئێرە نا ئەوێ. ئەوێ نا ئەوێیەکی تر.

—جا کێ دەڵێ ئەوێکان هەموو نەگیراون؟!.

—هێجگار وا؟!.. باشە قەیناکا.. لەم نزیکانە، لە پەنایەکدا، چاوەڕێ دەکا تا ئێمە دەڕۆین.

—چۆن بزانێ ئێمە دەڕۆین؟!.

—دەزانێ.. خاوەنی ئەقڵی خۆیەتی و تێدەگا، کە ئێمە دوو ئادەمیی ڕێبوارین و نامێنینەوە.

—ئێمە وەك خۆی نەبووینە دەعبای بەمڕەمڕە؟!.. بەچیدابزانێ؟!..

—دەزانێ کاکە.. دەزانێ.. بەبۆن.. ئەو وەکوو تۆ بێئەقڵ نییە!.

جافر قسەکەی بەپێکەنینەوە کرد. بەڵام لە ناواخندا، کردییە پێشەکییەك بۆ جۆرێکی تر لە وەڵام. ئەمیش لە ئاوازی دەربڕینی وشەی (بێئەقڵ)ەکەدا، هەستی پێکردو ورتەی نەکرد. ئەو بەدەنگێکی پڕ لە سۆزەوە وتی:

—سوبحان.. هێشتا لە سەرەتادایت. هەنگاوی یەکەمی پێشمەرگایەتیتە. من بەبیستنی بڕیاری بەپێشمەرگەبوونت، شاگەشکەبووم. حەمۆلیش وەك من. هەردووکمان لە خۆشییاندا ئەوەندەمان هێناو برد، کە بەختەوەریی بەدواداهاتن بەر کاممان بکەوێ، ناچار بەشێرو خەت دوو قۆڵی لە بەینی خۆماندا بڕاندمانەوە. ئینجا با لە



ئێستاوە پێشت بکەومو بیئاخنمە مێشکتەوە. من نازانم کامەران‌و ئەوان چییان بۆ باس کردویت. ڕەنگە زۆر شتیان بۆ ڕوون کردبیتەوە. بەڵام لەو باوەڕەدا نیم، ئەوانێك کەلە دوورەوە تەنیا دەخوێندنەوەو دەبیسن، توانیبێتیان زەفەریان بەبەرچاوخستنی تەنانەت، تارماییەکی ئەم ساتی حاڵیحازرییە بردبێ!. کەسێکیان توانیبێتی بیهێنیتە بەرچاوو بڵێ: سوبحان.. سوبحانی تازە پێشمەرگەی تازەترین شێوەی پارتیزانی.. تۆ دوو سبەی شەو، سبەی شەو، ئەمشەو کە یەکەم شەقاو دەنێیتە ناو ئەو دنیا تازەیەتەوە، یەکەم گرفت زۆرانبازی دەبێ، لەگەڵ زیندەوەرێکی خەڵکی ڕەسەنی وڵاتەکەت لەسەر کونی بن تاشەبەردێکی چەترین، چ جایە لەشکری لە بننەهاتووی دێوو درنجانی وڵاتێکی تر دەگا، کە لە دووری دوورەوە.. لە بیابانێکی کاکیبەکاکییەوە، دێن‌و پەلامارت دەدەن. هێلانەی شێوێنراوت، شێوێنراوترو گوندی خاپوورکراوت، خاپوورترو وڵاتی داگیرکراوت، داگیراوتر دەکەن. ئا.. لەو باوەڕەدا نیم توانیبێتیان. بەڵام ئێستا خۆت ئەوەتا لە یەکەم هەنگاودایت.. یەکەم هەنگاوو یەکەم تاقیکردنەوەو سەرکەوتوو نەبوویت. ڕووبەڕووی زۆرانبازییەك لەگەڵ چەقەڵێك، ڕێوییەك، کەمتیارێکدا بوویتەوەو دەستت تێی نەچوو.. وتت: گوناحە!. سوبحان.. من پێشت دەکەومو لە ئێستاوە دەیخەمە قولی مشتتەوە.. ئەو ئەرکەی بەرەزامەندیی خۆت هاتوویت بەجێی بێنیت، گوناحەی تێناکەوێ. تێیبکەوێ مەیسەر نابێ. ئێرە جێگەی بەزەیی‌و دڵنەرمی‌و چاوخەفاندن نییە. ئێرە دڵی بەردین، مێشکی بەردین، پووزو بازووی بەردینی پێدەوێ. تۆ لەم ساتەوە دەبێ ببیتە تاشەبەردێك.. وەك هەر تاشەبەردێکی ناو ئەم چیاو دۆڵانە. تۆ بەرامبەر دوژمنێك دەجەنگیت، کە ئەگەر وانەبیت بەرگەی فوویەکی ناگریت. نەك تەنیا ئەو، بەرگەی شەوو ڕۆژێك سەختیی ژیانی ناو ئەم چیاو چۆڵە ناگریت. تۆ بڕوانە.. یەکەم شەقاوتەو ئاسمان چ غەزەبێکت بەسەردا دەبارێنێ!. تووشی چ مرەمرێکی کردیت!. ئەمە لە چاو ئەوەدا کە دادێ پەشمەکە. من نامەوێ بتتۆقێنم.. من بەری بیناییت لێڕوون دەکەمەوە.. بەری بیروهۆشیش. ئەگەر وابزانیت مەسەلە تەنیا، شەڕە تفەنگ‌و تاقوتۆقە هەڵەیت. ئەوەیان ئاسانترین کارمانە. بەڵام قورسەکە بەر لەوەو دوای ئەوەیە. قورسەکە ئەوەتا لە یەکەم هەنگاودا، نموونەیەکت لێبینی. لە ڕۆژانی داهاتوودا، زۆری تریشی لێدەبینیت.. زۆرێکی لەو بابەتەی کە دەبێ وەك ئەم تاشەبەردە، سەخت‌و ڕەق‌و پتەوو توند داچەقیبیت، هەتا بتوانیت بەرگە بگریت.. بمێنیت‌و بمێنیتەوەو بەردەوام بیت.. وەك ئەم تاشە بەردە.. ئا ئەمە!.

لەگەڵ دوایین رستەکانیدا، لەپی دەستی شڵپە شڵپ پێدا دەکێشا. لە کاتێکدا ئەم قسانە بەجۆرێك خامۆشی کردبوون، کە دەتووت کەوتۆتە بنی بیرێکەوە، بەڵام کە ئەو دوای چەند ساتێك بێدەنگی وتی:

–لێم حاڵی بوویت وتم چی؟!.

ئەوسا بەقسە هات‌و بەنیمچە تووڕەبوونێکەوە وتی:

–یانی تۆ وات پێباشە، چۆن هاتووم وەها بگەڕێمەوە؟!. تۆ وا ئامۆژگاری دەکەیت؟!.. تەنیاش لەبەر ئەوەی وشەی گوناحەکەم بەسەر دەمداهات؟!.

جافر شڵەژا. چاوەڕێی ئەو وەڵامە توندەی نەدەکرد. نەیدەزانی چی بڵێ.

دەعباکە بواری بیرکردنەوەی بۆ ڕەخساند. وەك شوێنێکی تـری لـەو دەوروبەرە نەدۆزیبێتەوەو بایدابێتەوە سەر ئەملا، بەدزە دزەلێیان نزیك دەبـۆوە. تارماییـەك و کـەنارەو کـەنار، بەسـەر بەفرەکـەدا بـەدووچاری بریسکەدارەوە دەخشا. جافر پێشتر بەدیی کرد. وتی:

—نەمووت؟!.. واهاتەوە!.

ئەم لە مەبەستەکەی تێگەیشت. وتی:

—کێ؟.. گوناحەکە؟!.

ئەویش وەڵامی ڕێکخست بوو. وتی:

—سوبحان.. تکات لێدەکەم خراپم لێتێمەگە. ئەگەر لـەناو دڵـی مـن و حەمۆلدا دەبوویت و دەتزانی چەندمان هاتنت پێخۆشە، قەت ئەو قسەیەت بەدەمدا نەدەهات. گەڕانەوەی چیو ئامۆژگاریی چی؟!. من تـەنیا ویستم پێشـەکی لـە چـەند ڕاستییەك ئاگـادرت بکـەم، کـە سـبەی دوو سـبەیەك بەلووتتدا دەتەقنەوە. چاکە.. هەرچیم وت بیانسڕەوە.. با وازی لێبێنین تا خۆت، بەکردار شارەزایان دەبیت. واتێدەگەم بکەوینەوە ڕێ باشە. ئەوەتا ئەویش هەر دێت و دەچێ. با لەوە زیاتر لەوبەر بەفرە چاوەڕێ نەکا.

—گوناحە.. وانا؟!. قسەکەی تۆش هەر ئەو کفرە دەگەیەنێ کە من کردم!.

جافر پێکەنی و بەبێ وەڵامدانەوە، کەوتە سەرپێ و تفەنگی کردەوە شانی.

ئەم پێش ڕاستبوونەوەی ووتی:

—تۆ بڵێیت کولیچە بخوا؟!.

—بۆچی؟!.

—هەندێ کولیچەم پێیە.. سێ چوارێکی بۆ دادەنێم.

—کرێی ژوورەکەیەتی؟!. داینێ.. بەڵکوو!. ئەی خۆ گۆشت قووتومان پێیە؟!.

—نا نا.. ئەوەندە بەرمەکی نیم.

* * *

ئەو کاتـەی بـن تاشـەبەردەکەیان جێهێشـت، بـەفر ڕەشـایی بـەدەرەوە نەهێشتبوو. بەبارستایی دوو بستیشی تێکردبوو. قاچیان تا نزیك ئـەژنۆ ڕۆ دەچوو. جافر پێش ئەوەی بگەنە ئاستی تاتەکە وتی:

—ئەگـەر بـەگژیدا بچین، پشتمان دەشـکێنێ!. مـن دەیناسـم و دەزانم چ ماڵێکە!. بەوشکی غەزەبێکە بۆ خۆی، جا وەرە بـەفریش بەسـەرییەوە تـا ئەژنۆ بێ!. نەکەین باشە!.

—ئەی؟!.

—خۆمـانی لێلادەدەیـن. دوور بـڕۆ سـەلامەت بگـە. پێچەبـەدەورەی لێدەکەین. تۆ بەدوامدا وەرەو لێم دامەبڕێ، ئیتر خەمت نەبێ.

فێڵەکەی هەرچەندە سەعات و نیوێك کاتی خایاند، بەڵام سەری گرت. تات کەوتە پشتیانەوەو ئاودڕ لووت بەلووتەوە. جافر سوورێکی بەدەوری خۆیـدا خـوارد. لەبـەر ئـەو تەڵخـە ڕووناکییـەی، سـپێتی بەفرەکـە دەیـدا بەدەوروبەریان، بۆ پـەناو پاسارێك گـەڕا پشووییەکی تێدا بـدەن و نـەبوو. رووی پرسیاری لەم کردو وتی:

—لە چیدایت؟.. خۆ!..

ئەم نەیهێشت تەواوی بکا، وتی:

—هێشتا گوڕم زۆر تێدایە..

—ئاودڕێکی زۆر سەختە..

—گوێ مەدەرێ.. بکەوە ڕێ.

—ئاگات لە جێپێتبێ.. من بست بەبستی شارەزام. هـەنگاو بەهـەنگاو بەدوامدا سەرکەوە. وریای خزینی بەفری ژێر قاچیشت بە.

دوای چەند شەقاوێك، جافر ڕاوەستاو وتی:

—تفەنگەکەتم بدەرێ، با باری شانت سوکتر بێ.

ئەم پێی ناخۆش بوو، وتی:

—جا باری شانی تۆ قورستر دەبێ!.. نایدەم.. بڕۆ.

* * *

کە گەیشتنە سـەر لووتکە، ماندوێتی برستی لەبـەر بڕی بوون. لایان دایە نێوان دوو تاشەبەردەوە، کە سەریان بەیەکەوە نابوو. وشکاییان لـە ژێریاندا بەدی نەکرد. بەڵام بۆ جگەرەکێشانەکە بەکەڵك بوون. ئەم لەسـەر جانتاکەی دانیشت. جافر لەسەر گاشەبەردێك کە بەفرەکەی لەسەر ماڵی و وشکی کردەوە. بەدەم جگەرەکێشانەوە جافر وتی:

—ئەگەرچی نامەردیی لەگەڵدا کردین، بەڵام لوتفیشی هەیە.

ئەم وایزانی مەبەستی کەسێکە، وتی:

—کێ؟!.

—ئەم بەفرە نەگریسە.. نەدەبوو بیخاتە وەختێکی تر؟!.

—نەیخست و وا نامەردییەکەیم زانی. ئەی لوتفەکەی کامەیە؟!.

—ئەوەیە کە لێمانی نەکردە زریان. بیکردایە دەردی دەداینێ.

—جا ئـەوە پـەیوەندیی بـە بـاو ڕەشـەباوە هەیـە. دەبـێ سوپاسـی ئـەوان بکەین.

هەردووکیان پێکەنین. جافر وەك پێشتر بیری لێکردبێتەوە، وتی:

—وا تێدەگەم چاکتر وایە، بەرنامەمان بگۆڕین.

ئەم لە مەبەستی حاڵیی نەبوو، وتی:

—چۆن؟.

—ئەم بـەفرە بـەم تەووژمـە بـەردەوامبێ و بـاو ڕەشـەباش تـۆ واتـەنی، لوتفیان نەمێنێ و لێمانی بکەنە زریـان، حاڵمـان شڕ دەبێ و دەکەوینـە بـەر مەترسییەوە.

—ئەی چار؟.. نیازی چیت هەیە؟.

—لادەدەینە (توونێل). بـەدوو سـەعاتێك دەیگـەینێ. لـەوێ دەمێنینـەوە تا بزانین چۆن دەبێ.

—توونێل چییە؟!.

—یەکێکە لە حەشارگەکانمان.. ئەشکەوتێکەو حەمـە ساڵح ئـەو نـاوەی لێناوە. با بیگەینێ ئەوسا دەبینیت چییەو چۆنە!.

—قسە قسەی تۆیە. بەپێویستی دەزانیت لادەین؟.

—زۆر.. ترسم هەیـە لێمانی بکاتـە زریـان. کە ئەوێمان هـەبێ و لەسـەر ڕێماندا بێ، بۆچی لانەدەین؟.

بـەو نیازە کەوتنـەوە ڕێ. جافر لە پێشەوەو ئـەم بـەدوایدا. ئـاودیوی ترۆپك بوون و قەدپالـەو قەدپاڵ، ڕێگایـان بەرەو (توونێل) گرتەبەر. بـەفر بـەردەوام دەبـاری. بەپرووشـە بووایـە یـا بـەکلوو، هێمـن و لەسـەرخۆ لـە بەرزاییـەوە دەهـاتن و بەئەسپایی وەك پەپوولـە دەنیشـتنەوە. لـە خرمـەو خشەی ڕۆچوونی قاچی ئەمان بەناو بەفرەکەدا بەولاوە، هیچ دەنگێکـی تـر نەدەبیسترا. دەوروبەریان خامۆش خامۆش بوو.

جافر وەك بزنەکێوییەك هەنگاوی هەڵدەهێنا. شارەزای بست بەبستی خاکی ژێر بەفرەکە بوو. ئەمیش بەپێی ئامۆژگاری ئەو، پێی لە جێیی پێی

ئەو دادەنا. بەڵام هەرکات چەند هەنگاوێکی زیاد لە ئاسایی دەکەوتە نێوانیانەوە، ئەو ڕادەوستا تا ئەم دەیگەیشتێ و ئینجا دەکەوتە ڕێ. لەدوا ڕاوەستانیدا، بەچەشنی جارانی تری نەکرد. کە ئەم گەیشتە ئاستی، سەری بۆ بەرەژوور هەڵبڕی و وتی:

—توونێل ئەوەتا بەژوور سەرمانەوە. سەرکەوتن بۆی کەمێ زەحمەتە. لێرەوە ئیتر دەبێ دەستت بەدەستمەوە بێ.

دەست بەدەستەوە سەرکەوتن. وەك ئەوە بوو بەدیوارێکدا هەڵزنێن. جافری شارەزا بەئاسانی هەڵدەزنا. ئەم جارجار دەخزاو ئەو دەیگرتەوە. تا لەدوا هەنگاودا، بەکێشیکردە سەر گچکە تەختانییەك و وتی:

—گەیشتین.. ئێستا ئێمە لەبەر دەرگای (توونێل)داین.. حەشارگەی ژمارە دووی مەفرەزە پارتیزانەکان. دەرگاکەی دەبینیت؟!.

ئەم ورد هەڵبڕوانی و هیچی هەڵنەکڕاند. وتی:

—دەرگا؟.. دەرگای چی؟!.. من نەدەرگا دەبینم نەئەشکەوت!.

ئەو ڕۆچووە ناو بنەدەوەنێکی چڕی داپۆشراوەوە بەبەفرو بزربوو. وتی:

—ڕاوەستە تا دەرگا دەکەمەوە.

زۆری نەبرد گەڕایەوەو بەدوای خۆیدا پەلکێشی کرد. ئا.. ئێستا لەناو تاریکستانێکدایە، بەڵام هەست بەدەلاقەیەك لە بەرامبەریدا دەکا. جافر بەوێدا پەلکێشی دەکاتە ناو تاریکستانێکی چڕترەوە کە وشکانییە. دیسان دەڵێ:

—لە جێی خۆت بوەستەو مەجووڵێ.

تێدەگا ئەو دەچێتەوە دەرەوە. گوێی لە خشەخشێکە. لەوە دەچێ بەدەرگاکەوە خەریکێ و وەهای دابخاتەوە شوێنبزر ببێ. ئەوەتا واهاتەوە تەنیشت ئەم. وا ڕووناکیی لایت بەدەستییەوە دەبینێ. لایتێکی قەڵەمیی بچوکە. ڕووناکییەکەی ئاراستە دەکاو دەڵێ:

—جوان خۆت بتەکێنە، باژوورەوەمان لێتەڕ نەبێ!.

—ژوورەوە؟!.. ئەی ئێرە کوێیە؟!.

—ئێرە کلیدۆرە.. ئەولاتر هۆڵە.. بەدەستە ڕاستماندا ژوورەوەیە. پەلەت نەبێ. ئێستا هەموو بەشەکانی ئوتێلە سیاحییەکەمان دەبینیت. ئەی چۆن!..

خۆ گاڵتە نییە!.

ئەو پێشی کەوت و ئەم بەدوایدا. بەلایتەکە تەنیا بەر پێیانی ڕووناك دەکردەوە. ئەم وای زەن دەکرد کە بەشێوە ڕاڕەوێکدا ڕادەبوورن. بەڕازیش دەری بڕی، وتی:

—ئەمەش ڕاڕەوە؟!.

—ئا.. ڕاڕەوە.. بابچینە ژووری خەوتن و چراکە داگیرسێنین، باشتر دەبینیت.

—چرا؟!.

—ئا.. چرا.

بەدەستەڕاستدا وەرچەرخان. جافر بەلایتەکەی، شوێنی چرا فانۆسەکەی دۆزییەوە. دایگیرساند و وتی:

—ئەمە ژووری خەوتنە.

ئەوسا ئەم بەوردی کەوتە چاوگێڕان. ئێرە لای ڕاستی ئەشکەوتەکەیە. هەر بەڕاستی کراوەتە ژوورێك و لە هیچ پێویستییەکی سەرەکیی کەم نییە. تەیمانێکی چڕ تەنراو بەلقە دەوەن و ئاخنراو بەپووش و پەڵاش، لەلای



دەرگاوە بۆ بنەوەی ئەشکەوت بەدرێژی و لە زەوییەوە تا بنمیچ بەبەرزی، بۆی کراوەتە دیوار. سەرانسەری بەباتانیی کۆنە داداپۆشراوە. لە بنەوە دەرگایەکی تەیمانبەندی بۆ کراوە. سێ دیوارەکەی تری پێکەوە، یەك دیواری کەوانەیی پێکدێنن و بەوە ژوورەکە، شێوەی نیوەبازنەیی وەردەگرێ. بەرزترین شوێنی بنمیچ کە نزیك دەرگای دەرەوەیە، لە سێ مەتر بەولاوە نییە. نزمترین کە دەکەوێتە بنەوە، لە مەترو نیو کەمتر نییە. بەدرێژایی دیوارە کەوانییەکە، بەپێی کون و کەلەبەرە ئەسڵییەکانی، چەندین تاقی تێدا ڕێکخراون. هەر تاقەو بۆ جۆرە پێویستییەکی ژیانی ڕۆژانە، لە ئازووقەو قاپوقاچاغ و تەدارەکی چاڵێنان تەرخانە. بەبناری دیوارەکەدا لەمسەر تا ئەوسەری، بەبەرزایی دوو بست لە زەوییەوە، تەختێکی لە شێوەی قەرەوێڵەیەکی درێژدا، بەلقەدارو تەیمانچنی لێدرووست کراوە. گرمۆڵەیەك نوێنی لە چادرەوە پێچراوی لەسەرە..

—ئەوەی دەیبینیت، بەرهەمی ئەقڵی هاوڕێمان حەمە ساڵحە.

ئەم سەرسامە. هەر وردەبێتەوە.. "ئا.. لە ئەقڵی حەمە ساڵح دەوەشێتەوە. هەمیشە بەسەلیقەو دەستڕەنگین بووە". جافر دەچێتە دەرەوەی ژوورو دێتەوە. باوەشێك دارو چیلکەو چەوێڵی پێیە. دایدەنێتە تەنیشت ئاگردانێك کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدایە. چیلکەو چەوێڵی جوان هەڵدەچنێ. ئەم هەر سەرسامە!. ئەو دەچێ لە بنەوە دەست دەداتە قاپێك و دەیهێنێ. نەوتە. هەندێکی بەسەر چیلکەو چەوێڵەکەدا دەڕێژێ. بەدەم شقارتە لێدانییەوە دەڵێ:

—دەتبینم حەپەساویت؟!.

—بێگومان.

—بۆچی؟.

-ئەوە پرسیاری پێدەوێ؟. ئاشکرایە!.

-ئا ڕاست دەکەیت.. یەك تۆز سەبرم لێبگرە.

ئـاگر کڵپـەی سـەندوە. بـەجێی دێڵـێ و بەرەوبنـەوە دەچێتـەوە. ڕادەوەستێ و ئاوڕێك دەداتەوە. دەخنێتەوە:

-هیچ دەبینیت؟.

-نەء.

پشتی لەمـەو بەشتێکەوە خەریکـە. ئـا.. چەپەرێکـەو شـەتەك دراوە. دەیکاتەوەو لایدەدا. دەلاقەیەك لە شێوەی دەمی توونێلێکدا دەردەکەوێ. وەك ئـامێرێکی هەواکێشـی تێدا چەسـپ کرابـێ، دەکەوێتـە ڕاکێشـانی دووکەڵی ناو ژوورەکە. بەهەڵمژین هەڵیدەمژێ. جافر پێدەکەنێ:

-چۆنە؟.

-سەیرە!.. ئەوە چییە؟!.

-هەواکێشـێکی خواکـرد. بـەڵام زیرەکییـەکی تـری حەمـە سـاڵحی لەگەڵدایە. سوبحان.. خۆ خۆت باشـی دەناسـیت. بلیمەتێکـە بـۆ خـۆی. دەڵێیت ئەو پیاوە لە بنەڕەتەوە، بۆ ئەمجۆرە پێشمەرگایەتییە خوڵقاوە. زەفەر بەرێوشوێنی وەها دەبا، سەرت سوڕدەمێنێ چۆنچۆنییە!. پێویست ناکا من بەدرێژی بۆتی باس بکەم. دوایی خۆت لە نزیکەوە دەیبینیت و دەزانیت. بەڵام تۆ سەرنج بدەرە تەنیا ئەم نموونەیە: ئەوا هەواکێشێکی سروشتیمان هەیە، هەوای پیس دەباو فڕێی دەدا کە کەس نازانێ بۆ کوێ!. چاکە.. خـۆ دەبێ هـەوای پـاکی بێتـەجێ.. وانـا؟. ڕاستە ووردە کونوکەلەبـەر زۆرن بـۆ هاتنـە ژوورەوەی. بـەڵام بەتاقیکردنـەوە دەرکـەوت بەش ناکا. هەستمان دەکرد تووشی تەنگە نەفەسی و گێژی و سەریەشە دەبین. ئەو بیری بۆ چیی بچێ باشە؟!. کە ئەو هەواکێشەمان بۆ دەرەوە هـەبێ، دەبـێ بـۆ ژووریشـەوەمان هـەبێ، بەمـەرجێ هەسـتی پێنـەکرێ و بەتایبەتیش ڕووناکی چراو ئـاگری شـەوانی لێـوە بـەدیی نـەکرێ. جگـە لەوەی کە ئاوی بەفرو بارانیشی پێدا نەیەتە ژوورەوە.

ئەو بـەدەم قسەکردنەوە کشـاوەتەوە لای ئاگرەکـە. ئـاگر نێڵـەنێڵێتی. بـەنیازی زیـاتر خۆشـکردنی، دەسـکارییەکی دەکـا. هەڵدەسـێ و دەچێتـە ئاستی بەرزترین ڕادەی بنمیچ و ڕادەوەستێ. بەکونوکەلەبـەرەکانی دیواردا هەڵدەزنێ. دەستی دەگاتە بنمیچ و دەڵێ:

-وەرە تۆش سەرکەوە.. وەرە دەستت بێنە!.

سـەردەکەوێ و دەستی دەداتێ. ئەو تـەکانێك بەملاو یـەکێك بـەولاداو دوو تۆپەوانە لە دوو گوڵبێنە دەردێنێ:

-ها؟!.

-ئا.. وایە..

هەوا بەتەووژم و تەنانەت بەسووکە وژەیەکیشەوە، شالاو بۆ ناو ژوور دێنێ. دادەبەزن. جافر دەچێتەوە بەلای ئاگرەکەوە. دیسان خۆشی دەکا:

-وەرە دانیشـە.. تـۆ هـەقی هیچـت نـەبێ.. جـارێ میوانیـت. ئێسـتا خواردنێکی شاهەنشت بۆ ئامادە دەکەم.

ئەم بەرامبەر ئاگرەکە دانیشتووە. چەندە لەشی گەرم دادێ، هێنـدەش بـەبیروهۆش زیت دەبێتـەوە. ڕوونـتر وردەکارییـەکان دەبینـێ. جـافر لـە گرمۆڵەکە نەویوەو دەیکاتەوە. دۆشەك و بەتانی و سەرین..

-شێیان هەیە.. زۆر نا کەم.

وشککردنەوەیان بەم دەسپێرێ. بـەدەوری ئاگرەکـەدا هـەڵیان دەخـا. نەرمە هـەڵمێکیان لێبـەرز دەبێتـەوە. جـافریش هاتۆتـە بەرئاگرەکـە. کۆڵـە پشتەکەی هێناوەتە بەردەمی. خواردنە قوتوەکانی لێدەردێنێ. یەکە یەکە سـەیریان دەکـا. نووسـینەکانیان دەخوێنێتـەوە. هەڵدەسـێ و دەیانبـا دەیانخاتـە تاقێکەوە. لـە تـاقێکی تـردا دوو قوتوو دێنـێ. مەنجەڵۆکەیـەك و کـەوچکێکیش. دادەنیشێتەوە نووسینەکانی ئەوانیش دەخوێنێتـەوە. بـۆ مێژووی بڕکردنیان دەگەڕێ. دەیدۆزێتەوەو دەڵێ:

-بەبەریانـەوە مـاوە.. ئامۆژگـاریی حەمـە سـاڵحە.. کۆنـەکان بخـۆن و تازەکان بخەنە جێیان. لە بیریشتان نەچێ.. لە مێژووەکەی دڵیا بن کە کۆن نەبووبێ.

هـەڵیان دەپچـڕێ و دەیانکاتـە مەنجەڵۆکەکـەوە. دەیخاتـە سـەر ئـاگرو دەکوڵێ. ژەمە شاهانەکەیە. فاسۆلیا و قیمەی گۆشتی گا:

-لە ماڵی باوکیشتا شتی وات نەخواردووە؟!.

-نەء.. بەڵام تۆ پێمبڵێ..

-چی؟!.

-ئەوە.. ئەو تونێلە هەواکێشە.. چییەو بۆ کوێ دەچێ؟!.

-دەڵێی مێشکتی خەریك کردوە؟!.

-زۆر.

-بۆچی؟.

-بەلامەوە سەیرەو حەزدەکەم بزانم!.

-مادام ئەوەندە حـەز دەکەیت پێتی دەڵێم. بەڵام پێشت دەکـەوم کـە نەکەیت باوەڕ بکەیت!. ئەوە ئەگەر هەر بڕۆیت و هەر بڕۆیت، دەتگەیەنێتە شـارێکی ژێـر زەمینـی کـە خەڵکەکـەی لـە ئێمـە نـاچن.. دەووتـرێ لـە ڕۆژگارێکی زۆر کۆندا.. زۆر کۆن.. لـە ئەسـتێرەیەکی دوورەوە هـاتوون و لەوێدا جێگیربوون.

-بەقسەی کێ؟!.

-بەقسەی.. بەقسەی.. ئەی چیم پێووتیت؟!.

دەدەنـە قاقـای پێکـەنین. دەنگـی وژەیـەکی تیـژ لـە دوو گوڵبێنەکـەوە، بێندەگیان دەکا. تەووژمێکی توندی هەوایە، لە ئاگرەکە دەدا. کڵپەکەی ڕووەو تونێلەکە لار دەکاتەوەو بەدوایدا گڤەولوورەیەکی بەردەوام دەبیسن..

-زریانە.. ئاخری کردی..

-چاکمان کرد لامان دا.. وانا؟.

-بێگومان.. بڕۆیشتینایە دەکەوتینە داویەوە.

گەرمیان بۆتەوە. حەواونەتەوە. تێریان خواردوە. نوێن شێی نەماوەو ڕاخراوە. کاتی خەوتنە.

* * *

جـافر ئـاگری دامرانـدەوە. تۆپەوانـەی ئاخنییـەوە نـاو یـەکێك لـە گوڵبێنـەکان. چـوو دەرگـای تونێلیشـی شـەتەك دایـەوە. ئەوسـا چـرای کزکردو ڕاکشا بنوێ.

ئەم لێیپرسی:

-دەرگای تونێلەکە بۆچی؟!.

-نەوەکوو یەکێ لە خەڵکی ئەو شارە بێت بەمدیودا!.

-قەت هاتوە؟.



—نەء.. بەڵام دەڵێم..

—ئەی بۆ ئێمە نەچین؟.

—حەمە ساڵح ئامۆژگاریی کردووین کە نەچین. ئەو خۆی جارێکیان چوو. دوای نزیکەی دوو سەعات کە هاتەوە، هەموو گیانی ئاودامان سپی بووبوو.. سپی سپی وەك چوڕی شیر. لێمان پرسی: چیت دێ؟. وتی: هیچ.. هەر ڕۆیشتمو هەر سپێتی بوو.. هەتا چاو هەتەر بکا هەر سپێتی بوو. ئیتر داوای کرد کە کەس نەخەڵەتابێ بچێ.

—دەبا منو تۆش سەرێکی پێدا بکەین، بزانین چییە؟.

—من لە قسەی حەمە ساڵح دەرناچم.. تۆش کەیفی خۆتە!.

هەردووکیان پێکەنین. جافر جگەرەکەی دەستی کوژاندەوە. جەستەی توند وەك مەلۆتکە پێچایەوە. بەدەم سەرنانەوەوە وتی:

—بنوو.. نەچیت!.

ئەو نووست. پرخەیەکی هێمنی لە سووکە فیکەیەك، لە شێوەی ئاوازێکی خەمناکدا لە دەمیەوە دەردەهات، کە ئەمی بەچاوێك دەکردە خەوو بەچاوێك بەئاگای دەهێنایەوە. بەدەمییەوە خەیاڵ بردییەوە. سەرەتا تیژێك گەڕایەوە بۆ دواوە.. بۆ ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەوو تیژ پێداهاتەوە. "بەیانی لە کوێ بووم.. نیوەڕۆ لە کوێو ئێستا لە کوێ؟!.". بەئەسپایی سەرنجێکی سەراپاگیریی گێڕا. بینایی لەسەر ڕووخساری جافر گیرساندەوە. ڕووی لەمە. جامانەکەی کردوە بەلەچکی. چاوی نووقاوەو خەوتوە. پرخە بەئاوازەکەی هەر دێ. بەڵام نەرمە بزەیەکی بەسەر لێوەوەیە. بینایی لەو لادەدا. دەڕوانێتە دەرگای تونێلەکە. چاوی لەسەر ڕاگیردەکا. لەرەلەرێکی پێوە دەبینێ. لەرەلەری بێژنگێك و بەرامبەر تیشکێك ببزوێنرێ. لەرەلەرو تیشکەکە ڕوو لە خێرایی و درەوشانەوەن. دەرگا لەسەرخۆ دەکرێتەوە. تارماییەکی ئاودامان سپی.. سپی وەك چوڕی شیر، لەناو تیشکەکەدا تیشك دەداتەوە. ڕووەو ئەم ڕاوەستاوە.

پەنجەیەکی تیشکدار بەسۆزەوە، بۆ ئەم هەڵدەتەکێنێ. دەڵێ: وەرە.. وەرە!. بەدەم هەڵسانەوە ڕووخساری جافری دەکەوێتەوە بەر دیدە. نەرمە بزەکەی هەر بەسەر لێوەوەیە. بەلایدا ڕەت دەبێو دەڕوا. تیشکی ناو تیشکەکە کەمەنکێشی دەکا. جەستەی لێدەکاتە پەپوولە پاییزەیەك و لەگەڵ خۆیدا دەیباو. ماوەیەك و لێی جودا دەبێتەوە. ئەم خۆی ئێستا بەناو تونێلە سپییەکەدا، کە بۆتە چراخانێك هەڵدەفڕێ. بەسەر پلیکانەیەکی هەزار بەهەزاردا، بۆ قووڵاییەکی زۆر قووڵ دادەفڕێتە خوارەوە. شارێکی لێدەردەکەوێ و دەیگاتێ. شارێکە لەزیو. لەژێر ئاسمانێکی زیویندا و بەبەر خۆرێکی زیوینەوە. پەپوولە ئاسا دەنیشێتەوە. شارو خەڵکەکەشی زیوپۆشنو تەنانەت زیوپێستیشن. هەموو سەرقاڵی یەك جۆر ئیشن. ئەم هەوڵ دەدا بزانێ چییەو بۆی ڕوون نابێتەوە. وا مەزەنە دەکا کە خەریکی دروستکردنی کەشتییەکی ئاسمانی بن. یا لە بنەڕەتەوە لەناو کەشتییەکی لەو بابەتەدا بنو بۆ فڕینی ئامادەبکەن. کە یەکەیەکەش تێیان دەڕوانێ، وەك تیشکێکی گەشی دەورەدراو، بەتیشکێکی گەشی تر دێنە بەرچاوی. وازەن دەکا کە یەکبەیەکان دەناسێ. دیونیو بەزەینی ناموێنن. ڕۆژێك لە ڕۆژان، لە شوێنێ لە شوێنان دیونی و زۆر جاریش نەك کەم!. چەند ورددەبێتەوەو سەنج دەدا، دڵنیاتر دەبێ.. "دیومن.. دیومن.. دیومن.. ئەو دەموچاوانە.. ئەو سەروسیمایانە.. ئەو بەژنو باڵایانەم دیون. زیوپۆشیو زیوپێستییەکە لێمی دەشێوێنن، دەنا دەیانناسمەوە!".

هەوڵ دەدا بیاندوێنێو زمانی بۆ نایەتەگۆ. تەقەلا دەدا دەستی بەر لەشیان بکەوێو سەرنجیان ڕابکێشێو دەستی بۆ نابزوێنرێ. ئەوانیش وەك بەلایانەوە ئەم هەر نەبێ، بێهەستو هۆش بەلایدا ڕادەبوون. لە دڵدا لێیان پەست دەبێ. بەسپڵەو بێوەفایان دەزانێ. توورە دەبێو دەیەوێ پشتیان تێبکا. جێیان بێڵێو چۆن هاتووە وەهاش بگەڕێتەوە. بەڵام نەء..




ئەها ئەوە یەکێکیانە هاتوە، شانبەشانی هەنگاو دەنێ و بەدزەتیلەیەك سەیری دەکا!. بگرە سووکە زەردەیەکیشی بەسەر لێوەوەیە. هەرچەندە زیوپۆشی و زیوپێستییەکەی لەوانی تر خەستترە، بەڵام لە هەموویان باشتری دەناسێتەوە.. وا مەزەنە دەکا کە زۆر باشترو ئاسانتر دەیناسێتەوە. تەنانەت بڕیار دەدا لێی نزیك ببێتەوەو بپرسێت. کەچی دەترسێ.. وەك هەر جارێك کە لە شار گەڕابێتەوە.. خۆی بەماڵدا کردبێ و ڕێکەوت وای سازاندبێ کەس لەو دەوروبەرە نەبووبێ.. شاڵاو بەرێ و مارپێچ تێیئاڵێ. ئێستاش باوەشی پێدا دەکاو تێیدەئاڵێ. کەچی چەندە هەنگاو دەنێ و دەنێ و دەنێ، ماوە لە نێوانیاندا کەم نابێتەوەو نابێتەوە!. جارێك و دەو بیست.. هەنگاوێك و دەو بیست.. ماوە وەك خۆیەتی!. تا لە ناکاوێکدا، وەك ئەو لەم زوپیر ببێ، لا دەداو دووردەکەوێتەوە. هەر لەو ساتەشدا دەبینێ کە پەلی بەپەلی دوو گچکە تارمایی زیوینەوەیە. تێدەگا کە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی شانبەشانی یەکەوە بوون، ئەوان هەردووکیانی لەتەکەوە بوون و ئەم نەیدەبینین. ئەوە ئاگری تێبەر دەدا. ڕادەپسکێ بەدوایاندا ڕابکاو قاچی لە دووی ناچن.. هەنگاوی بۆ نانرێن!. ئەوان ئەوەتا بەبەرچاوییەوە، ساتبەسات دوورو دوورتر دەکەونەوە. دەڕۆن و لە ناخدا هەست دەکا، کە ڕۆیشتن ئیتر نایانبینێتەوە.. ئیتر بڕاییبڕ بەدیداریان شاد نابێتەوە. ئەو هەستە دیقی پێدەکا.. سەری دەئاوسێنێ.. سینەی دەتەقێنێ.. خەریکە لە داخاندا لێکدەبێتەوە. بەڵام بێکەڵکە. تارماییە گەورەکە.. دوو گچکەکە.. ئەوەکانی ترو شارە زیوینەکەش بەهەرچییەکەوە تێیدان، چۆنی لێدەرکەوتن وەهاش بزر دەبنەوە. دەڵێیت هێزێکی زەمبەلەکی هێناونییە پێشەوەو بەرەودوایان دەباتەوە!. ئێستا پاشەوپاش بەتوونێلەکەدا.. توونێلی سپی سپی وەك چۆڕی شیر.. ڕووناك ڕووناك وەك چراخان دەشکێتەوە. پەپوولە پاییزەکەیەو شەماڵی تیشکی ئەفسوون واوە.. بۆ ناو ژوورەکەی ناو ئەشکەوتی توونێل.. بۆ لای جافری خەوتووی بێخەمی دێنێتەوە!..

—سوبحان.. سوبحان.. ئەوە چییە؟.. خەریکی چیت؟!.

کە جافر بانگی لێکردو بەئاگای هێنا، وەك داهۆڵێك لەبەردەم دەرگای توونێلەکەدا ڕاوەستا بوو. وەرچەرخاو بۆ ماوەیەك، بەواقوڕماوی لە جافری ڕوانی. دەتووت هێشتا باوەڕ بەچاوی خۆی ناکا. ئەوسا لەسەرخۆ گەڕایەوە سەر جێگاکەی و وتی:

—هیچ!.

—ئەی بۆ لەوێدا بوویت؟.. ویستت بچیت؟!.

—ئا.. چووم و هاتیشمەوە.

—بەڕاست؟!.

—بەڕاست.

—چیت دی؟!.

—شارێکی زیوین.

—توو شەرەف!.. دە پێمبڵێ: کێی لێبوو؟.. کێت دی؟!.

—غوربەت و نارو چنار.. دایکم و باوکم.. خزمان.. خەڵکی حاجی سوبحان هەموو.

جافر هەڵسابووە سەرباری دانیشتن. پرسیارەکانی دەخستنە قاڵبی سەرسوڕمانەوە. وەڵامەکانیشی بەبایەخپێدانەوە وەردەگرتن و خۆی بۆ گوێقوڵاغ دەکردن. لەگەڵیاندا زەردەخەنەیەکیشی نیشاندبووە سەرلێوی. بەڵام بەبیستنی دوا وەڵام، چووەوە ناو قاوغەکەی. بۆ ماوەیەك کڕوکاس بوو. ئەوسا هەڵساو چوو چراکەی خۆش کرد. دوو جگەرەی داگیرساند. یەکێکیانی بۆ ئەم ڕەت کردو دووەمیانی نا بەلێوییەوە. دانیشتەوە سەر جێگاکەی. دوو سێ نەفەسی قووڵی لە جگەرەکەیدا. ئینجا بەدەنگێکی غەمباری پڕ لە سۆزەوە وتی:

—سوبحان.. براکەم.. هاوڕێم.. هەمووومان هاودەردین.. بەدەست یەك مەینەتییەوە دەناڵێنین. من ناڵێم دەتوانین لە داخ و خەفەت بشۆرێینەوە. ئەوە کارێکی ستەمە. ئەوەی بەسەر ئێمە هاتووە، فەرامۆشکردن و لەبیرچوونەوەی بۆ نییە. جەخارێکەو لەگەڵ تەمەنماندایە. بەڵام چاکتر وایە.. هەق وایەو وایپێویست دەکا، بیگۆڕین بە ڕق.. بە کینە.. بەگیانی بەرگری و بەگژداچوون.. بەتەقینەوە بەڕووی دوژمنداو بەهەوڵی تووناکردنی.. سوبحان.. بۆ ئێمەیەکی جەرگ و دڵ پارەکراو.. بۆ تۆ، من، حەمۆل، حەمە ساڵح و بۆ هەزارانی وەك ئێمەو سەدەها هەزاری تری هەریەکە بەجۆرێك داخکراو، ئەوە تاقە ڕێگایە. سوبحان.. دەزانم ناتوانین داخ و خەفەت بەلاوە بنێین. بەڵام با بەولایەدا ببەین.. بابیڕێژینە ئەو ڕووبارەوە. تێم دەگەیت دەڵێم چی؟!.

ئەم بێئەوەی بۆی بڕوانێ، وتی:

—تێدەگەم.. ئەوەتا بۆی هاتووم.. بابنووین.

تەنیا هێندەو ئیتر جامانەکەی کرد بەلەچك. ڕاشکاو توند خۆی پێچایەوە. پێش ئەوەی چاوی خەوتن لێك بنێ، وتی:

—ناچمەوە.. ترست نەبێ.. بنوو.




ڕۆمانی "هێلانە"، حسێن عارف، چاپی یەکەمی 1999، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، ل (287- 298).

نمونەیەك لە شانۆنامەكانی

# پێكەنین بەپێی یاسا

(دیمەنی یەکەم)

"لە ناوەڕاستی سەر شانۆدا تابووتێك لە بابەتی زۆر كۆن و لەوانەی شیاوی یەكێك لە پادشاكانی زەمانی دێرین بێ دانراوە. زانـاو دوو یـاریدەدەری بەدیاریەوە ڕاوەستاون. لەگەڵ لادانی پەردەدا زانا دێتە پێش دەمی شانۆو ڕووی قسە لە دانیشتووان دەكا).

**زانا:** گەورەكانم.. پێش هەموو شتێك دەمەوێ خۆم و ئەو دوو زاتەتان پێ بناسێنم. من خۆم وەك مێژوو ناسم، زانایەكی پشكنینی شوێنەواری كۆنیشم كە ئەوی ڕاستی بێ، پیشەی مێژووناسیەكە خستمیە سەر ئەم ڕێگایەو ئیتر ئەوە زیاد لە بیست ساڵە، من چنگ و پەلم لە گڵ و خۆڵی كەلاوەو دارو پەردووی شوێنەوارە كۆنەكاندایە. لەو وەختەوە وێڵم بەدوای گۆزە شكاوێكدا، یا پارچە مسێكی ژەنگ گرتوو، یا پەیكەرێكی سەرو گوێلاك شكاو، یا هەر شتێكی تردا كە جۆری كردارو ڕەفتارو چالاكیی باووباپیران بخاتە ڕوو. بەهەرحاڵ زۆر شتم دۆزیەوەو لە ڕێگەی ئەو شتانەوە، شارەزاییەكی زۆرم دەربارەی ماكی مێژوو پەیدا كرد.. زۆر زۆر زیاتر لەوەی كە لەوەبەر وەك مێژووناسێكی ئاكادیمی دەمزانی.

بەڵام گەورەكانم.. ئەوەی كە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لە ژێر دارو پەردووی كەلاوە كۆنێكداو لە قووڵایی بیست پێدا دۆزیمەوەو دوای مشت و مڕێكی زۆر لەگەڵ ئەم دوو زاتەدا لێرەدا ئەوانیشتان پێدەناسێنم و دەڵێم: دوو یاریدەدەری كارامەو لێهاتوومن و ئەوانیش لە دەمێكەوە كەوتوونەتە دوای خۆشەویستیی ئەم ئیشەوە– ئا.. دوای مشت و مڕێكی زۆر بڕیارم دا ئێوە داوەت بكەم بۆ ناو ئەم هۆڵەو ئەوەی لە ئێمە چوو بووە كۆڵی شێرو سەرمان بۆ لێدەرنەكرا، یا با بڵێین تیایدا نەگەیشتینە ئەنجام، بەئێوەی ڕابگەیەنین، بەو نیازەی یاریدەمان بدەن و لەگەڵمانا....

**یاریدەدەر -1- :** (قسە بەزانا دەبڕێ) من ئێستەش هەر سوورم لەسەر ڕای خۆم و دەڵێم نە ء.

**یاریدەدەر -2- :** منیش.. ئا منیش هەر لە سەر ئەو ڕایەم.

**زانا:** ڕاوەستن.. سەبربگرن.. با قسەكەمیان بۆ تەواو بكەم.

**یاریدەدەر -1- :** دوكتۆر.. ئاخر هەر لە بنەڕەتەوە پێویستی نەدەكرد تۆ ئەو عەزێتی هاتنە بخەیتە بەر ئەم بەڕێزانە.

**زانا:** بەڵام...

**یاریدەدەر -2- :** دوكتۆر.. تۆ خۆت دەزانیت ئێمە چەندە ڕێزی تۆو قسەی تۆ و بیروڕای تۆمان دەگرت و دەزانیت تا ئێستاش بەرامبەرت هەروەهاین. بەڵام بۆ ئەمەیان..

**زانا:** ئێ ئەی بۆ ئەمەشیان ڕێك نەكەوتین.. كە...

**یاریدەدەر -2- :** با ڕێككەوتین.. بەڵام من..

**یاریدەدەر -1- :** بەڵام هەردووكمان دوای بڕیارەكە زۆرمان بیر لە مەسەلەكە كردەوەو وامان بەچاك زانی كە تۆ...

**سەیركەر -1- :** (لەناو هۆڵەكەوە) ئەرێ ئێمە هاتووین گوێ لە مەتەڵ بگرین و بەتەمسیل مەتەڵمان نیشان بدرێ یان چی؟!. ئەوە ئێوە لەچی دەدوێن؟!.

**سەیركەر -2- :** ئەی دەم خۆش.. ئەشەدو بیلا ڕاست دەكا.. خۆ منیش لەلای خۆمەوە لەوەدابووم ئەو پرسیارەتان لێ بكەم.

**سەیركەر -3- :** دوكتۆر گیان.. لە قسەی ئەم دوو برادەرە زوێر مەبە. لەوە دەچێ نەتناسن. من دەتناسم و زۆرت ڕێز لێدەنێم. مەبەستم شەخسی خۆت نییە. یەكەمجارە شەخسی خۆت دەبینم. مەبەستم نووسینەكان و كۆششی بەردەوامتە لە كۆڕی ئیشەكەتدا. بەڵام تكایە تێمان بگەیەنە مەسەلە چییە؟!.

**سەیركەر -2- :** ئائا.. ئا ئەمەیان گرنگە.

**سەیركەر -1- :** زۆر ڕاستە.. تێماندەگەیەنن یا بڕۆین؟!.

**زانا:** (ڕەق ڕاوەستاوە. دەستی ناوەتە بەر پشتین. بێدەنگ گوێ لە قسەكان دەگرێ و دەخنێتەوە)

**سەیركەر -4- :** دەڵێی پێمان ڕادەبوێرێ!.

**سەیركەر -5- :** ئەرێ وەڵڵا پێمان ڕادەبوێرێ. گوایە ئێمە گاڵتەچیی ئەوین؟!. من بەش بەحاڵی خۆم ڕازی نابم دەڕۆم.

وا بۆتانی باس دەكەم و لە كورتی دەیبڕمەوە.

**سەیركەران:** (دادەنیشنەوە)

**زانا:** گەورەكانم.. ئەوەی لە قووڵایی بیست پێداو لە كەلاوەیەكدا دۆزیمەوە، گۆڕێك بوو كە توندو تۆڵ بەمەرمەڕ هەڵبەسترابوو. بۆ ماوەی دوو ڕۆژی ڕەبەق لەگەڵ ئەم دوو زاتەدا بەدیوی دەرەوەیدا لێی وردبووینەوەو بیرمان لێكردەوە، بێ ئەوەی هیچ شتێكی ئەوتۆی پێوە ببینین سەرنجمان ڕابكێشێ، تەنیا هێندە نەبێ كە بەدارو پەردووەكەی دەورو پشتیدا بۆمان دەركەوت گۆڕەكە لەناو ژوورێكی ژێر زەمینی بێ دەرگادا بووە. ئەوسا بڕیارم دا گۆڕەكە هەڵبدەمەوە. لە ناویدا گۆڕێكی هەڵبەستراوی توندو تۆڵتر بوو. كە چاك لەویشیان وردبوومەوە، نووسینێكم بەرچاو كەوت كە لە سەر هەموو لایەكانی دووپات كرابووەوە. خوێندنەوەی بۆ من وەك ئاوخواردنەوە وەها بوو. تەنیا نوسرابوو "ئاگاداربە". ئاگادار بووم. بەردە مەرمەڕم لەسەرخۆ لێلادان. ئەم تابووتی حازرییەم لێدەركەوت. (دەچێ بەلایەوە). ئەم تابووتە تابووتێكی ئاسایی نییە. خۆ وەنەبێ من باوەڕم بەقسەی پڕوپووچی لە بابەتی لەعنەتی فیرعەونییەكان هەبێ. بەڵام نازانم بۆچی شتێك لە ناخەوە.. بانگەوازێك لە ناخی ناخەوە پێم دەڵێ كە سەرهەڵدانەوەی ئەم تابووتە، ئەگەرچی بەژمارە ژماردوومەو (124) جار لەسەری نوسراوە -نەكەی سەرم هەڵبدەیتەوە– بەڵام سەرهەڵدانەوەی وەك دەوترێ زەمین ژێروزەبەر بكا. من نازانم ئاخۆ بەرەو هەڵسانی جەجاڵ یا بەرەو هاتنی مەهدی دەیكا!. من تەنیا هێندەی دەزانم كە ژێروزەبەری دەكا.

**سەیركەر -1- :** ئێ جا چیت لە ئێمە دەوێ؟.. ئێمەت بۆچی بانگ كردوە بۆ ئێرە؟!.

**زانا:** سوپاست دەكەم.. بۆ بڕیار لەسەردان. ئایا سەری تابووتەكە هەڵبدەینەوە یان نا؟!.

**یاریدەدەر -1- :** نە ء.

**یاریدەدەر -2- :** نەخێر.

**زانا:** گوێتان لێیە.. ئەوان دەڵێن نە ء و من دەڵێم ئا.. ئەی ئێوە دەڵێن چی؟!. لە بیریشتان نەچێ.. من گەرەنتی نادەم!. من تەنیا كۆششێكەو بەئەقڵی خۆمی دەكەم.

**سەیركەر -1- :** ئا...

**سەیركەر -2, 3, 4, 5- :** ئا.. بەڵێ.. ئا... ئا؟!

**سەیركەران:** (لەگەڵ ژمارەیەكی تریشدا) ئا.. ئا...

**زانا:** (دەچێ بەلای تابووتەكەوە).

**یاریدەدەرەكان:** (بەناچاری دەچن بۆ یاریدەدانی)

**سێقۆلی:** (سەری تابووت لادەدەن)

**پادشا:** (لەناو تابووتەکەوە بەدەستووری مردوویەک و زیندوو بێتەوە، سەربەرز دەکاتەوە. جلو بەرگی پادشایی یەکێ لە مەملەکەتە کۆنەکانی لە بەردایە. دەڕوانێتە ئەم لاو ئەولای خۆی. زاناو یاریدەدەرەکانی بەدی دەکا.

**زانا:** یاریدەدەرانی: —(سڵ دەکەنەوە. دەکشێنە دواوە)

**پادشا:** (هەڵدەستێتە سەرپێ. جارێکی تر دەڕوانێتە دەوروپشتی. لە تابووتەکە دێتە دەرەوە. ڕووەو ئەوان ڕادەوەستێ و سەرنجیان دەداتێ. لە ناکاو بەدەنگی بەرز بانگ دەکا) شارات...

**زانا/** یاریدەدەرانی: —(سڵ دەکەنەوە. زیاتر دەکشێنەوە)

**پادشا:** (ڕوو بۆ لای چەپی شانۆ وەردەگێڕێ) شارات.. شارات لە کوێیت؟

**یاریدەدەران:** (هەڵدێن. سەر شانۆ جێدێڵن).

**پادشا:** کوڕە شارات.. بۆ وەرام نادەیتەوە؟

**زانا:** (ئەویش هەڵدێ و سەر شانۆ جێدێڵێ)

**تابووت:** (ڕادەکێشرێتە پشتەوەی سەر شانۆ)

**شارات:** (کلیلداری کۆشکی پادشایە. لەلای چەپەوە بەهەڵەداوان دێتە سەر شانۆ) بەڵێ.. بەڵێ پادشای خۆشی و شادمانی.. بەڵێ فەرموو سەرم لە ڕێتە.

**پادشا:** (بەدەم پێکەنینێکی دروستکراوەوە) کوڕەکەم. سەمەرەترین شت بۆ هەر پادشایەک ئەوەیە فەرمانی بەجێ نەهێنرێ. تۆ خۆت دەزانیت کە پادشاو فەرمان کردنیان وتووەو فەرمانیشی دەبێ بەجێ بهێنرێ. دەنا پادشای چییە؟!.

**شارات:** (بەڕوو یەکی گەشەوە) ببورە پادشای بەختیاری و شادمانی. ببوورە.. فەرمایشتت لەسەر سەرەو بەجێیە. بەڵام تکایە لوتف بفەرموو بۆمی باس بکە.. چی ڕووی داوە؟!.

**پادشا:** کوڕەکەم.. من کە ئەو یاسا نەمرەم دانا، دەمزانی ئەگەرچی لە ئەنجامدا هەر دەچەسپێ، بەڵام ماوەیەکی پێدەوێ تا ڕەعیەتەکەم لە خۆیدا دەتوێنێتەوە.. کەچی.. کەچی کوڕەکەم..

**شارات:** بەڵێ.. بەڵێ پادشام.. فەرمایشتت بەجێیە.

**پادشا:** کەچی بڕوانە.. (بەدەست ئیشارەت بۆ پشتەوەی خۆی دەکا).. بڕوانە ئەو چارە ترش و تاڵانە.. ئەو سەروسیما دێوو درنجانە.. بەلامەوە زۆر سەیرەو بگرە زۆر ستەمە کە نموونەی ئەوانەی لە بن دەستمەوە هەبن. گوایە تۆ بەلاتەوە سەیر نییە؟!. شتی وادەبێ؟!.

**شارات:** (هەڵدەڕوانێ) بەڵام پادشام...

**پادشا:** (ئاسایی و وەک فەرمانێک) بیان سووتێنە..

**شارات:** پادشام...

**پادشا:** بەزەماوەندێکی تایبەتی.. زەماوەندێکی تایبەتی ی حەوت شەور حەوت ڕۆژە.

**شارات:** پاشای خۆشی و شادمانی ی سەر ڕووی زەمین.. بم بەخشە.. شوێن ئیشارەتی پەنجەی پیرۆزت قوبلەگامە. بەڵام من هیچی تێدا نابینم.

**پادشا:** (ئاوڕ دەداتەوە بۆ دواوە. دەحەپەسێ. ئینجا تووڕە دەبێ). پیلانگێڕن.. من لە جەم و جووڵی پیلانگێڕان غافڵ نیم، من دەزانم چیم بەدی هێناوەو دەشزانم گریان پەرستان دەیانەوێ چی بکەن.

(ڕووی قسە دەکاتە شارات) شارات.. ئومێدێکی زۆر گەورەم بەتۆ هەبوو.. کەچی کوا؟!.

**شارات:** گەورەم.. پادشای شادی و پێکەنین.. من..

**پادشا:** (قاقایەکی پێکەنین و بەدوایدا) بدەرەوە لە تەپڵی شادی.. جاڕدە.. سەرلەنوێ جاڕ دەرەوە. من لە دڵسۆزیت.. لە باوەڕی پتەوت بەیاسا نەمرەکەم دڵنیام. دەنا ئەوەی تۆزێک لەمەوبەر بەچاوی خۆم و لە بن دەستمەوە دیم، دەبوو وای لێبکردمایە گاڵ دەم پێستت بکرێتە تەپلەکەی ئەمجارە. سا ڕاکە سەرلەنوێ جاڕدە، پێش ئەوەی گاڵدەم..

(بەدەم قاقایەکی ترەوە سەر شانۆ جێدێڵێ)

**شارات:** (شڵەژان و خەنینی لا تێکەڵ بەیەک دەبن، هاوار دەکا) کارشا.. هۆ کارشا..

**کارشا:** (دێتە سەر شانۆ) بەڵێ گەورەم...

**شارات:** جاڕدە.. خێرادە..

**کارشا:** ئەی جارم نەدا؟!.

**شارات:** سەلەنوێ جاڕدە.. گاڵدە جاڕ دەنەوە.

**کارشا:** بەڵام...

**شارات:** درێژەی مەدەرێ.. فەرمایشتی پادشای شادی و پێکەنینە.. زووکە گاڵدە..

(سەر شانۆ جێ دێڵێ)

**کارشا:** (هاوار دەکا) ئاندی.. هۆ ئاندی..

ئاندی: (دێتە سەر شانۆ.. تەپڵێکی بە بەرۆکەوەیە) بەڵێ گەورەم...

**کارشا:** ئامادەبن.. جاڕدەدەینەوە.

**ئاندی:** (بانگ دەکا) ماڕیۆ.. کەنداش..

**ماڕیۆ/** کەنداش: —(دێنە سەر شانۆ. دوو یاساولن) بەڵێ..

**ئاندی:** ئامادەبن.. جاڕ دەدەینەوە.

**کارشا:** (دەچێتە پێش دەمی شانۆ)

**ئاندی:** (دەچێتە تەنیشتی یەوەو خۆی ئامادەی تەپڵ لێدان دەکا).

**ماڕیۆ/** کەنداش: —(لە پشتیانەوە لەلای ڕاست و چەپیانە.وە دەوەستن).

**کارشا:** (نوسراوێک لەبەر پشتێنەکەی دەردێنێ و دەیگرێ بە دەستەوە)

**ئاندی:** (بۆ ماوەیەک دەدا لە تەپڵەکەی)

**کارشا:** (نوسراوەکە دەخوێنێتەوە) بەناوی پادشای بەخشندەی پێکەنین و شادمانیی لە بن نەهاتووەوە. ئەی خەڵکی گەرمیان و کوێستانی ئەم پەڕ تا ئەوپەڕی وڵات. گوێ قوڵاغ بن بۆ فەرمانی پیرۆزی پادشای سەرداروسەروەرتان.

لەم ساتە بەدواوە، گریان.. مرومۆچی.. ڕووگرژکردن.. ئاخ و ئۆف هەڵکێشان.. کڕووزانەوە.. خەفەت خواردن. تەنانەت بیرکردنەوە لە خەفەت خواردن، چ بەئاشکراو چ بەنهێنی، چ لە بەخەبەریداو چ لە خەودا قەدەغەیە. لەم ساتە بەدواوە، دەبێ لەسەر ئیش.. لە حەوانەوەدا.. لەسەر شەقام.. لە کۆڵاندا.. لەناو بازاڕدا.. لە دەشت و لەسەر شاخ و لەناو دارستاندا.. لە کونی ژوورەوەدا.. تەنانەت لەناو جێگەو لەژێر لیفەشدا، تا خەو دەتانباتەوە هەر پێبکەنن.. هەر بخنێنەوە.. هەر دەمتان بەزەردەخەنەوە بێ.

ئەی خەڵکی گەرمیان و کوێستانی ئەم سەرو ئەوسەری وڵات.. باش لە فەرمانی پیرۆزی پادشای سەرداروسەروەرتان ئاگادار بن. لە باری پانی، دەرکەوتنی دوو دان بەلای ڕاستداو دوو بەلای چەپدا. لە باری شاقوولی، دەرکەوتنی نیوەی خوارەوەی چوار دانی سەرەوەو نیوەی سەرەوەی چوار دانی خوارەوە، نیشانەی پێکەنین دەبێ. لەوە زیاتر پەسەندەو کەمتر سەرپێچی کردنە لە فەرمانی پیرۆزی پادشا.

سەرپێچی کردنیش، پیلانگێڕان و ناپاکی یەو سزاکەی بەبێ تەنیا تۆزقاڵێک بەزەیی، ڕیشەکێش کردن و سووتاندنی لاشەو بەبادانی خۆڵەمێشەکەی دەبێ بەدەم زەماوەندێکی حەوت شەوو حەوت ڕۆژەی پڕ لە شادی و پێکەنینەوە. ئیتر هەر کەسە ئۆباڵی خۆی بەئەستۆی خۆی.

(سەر شانۆ جێ دێڵێ)

**ئاندی:** (لەگەڵیدا سەر شانۆ جێ دێڵێ)

**کەنداش/** ماڕیۆ: —(کەمێ دەکشێنە دواوەو لەم پەڕو لەوپەڕی شانۆوە ڕادەوەستن)

**ڕێبــــوار -1-** : (بــەدەم قاقـــای پێکەنینــــەوە ڕادەبووڕێ).

**ڕێبوار -2-** : (دوای ساتەوەختێك وەك ئەو)

**ڕێبوار -3-** : (بێ پێکەنین ڕادەبووڕێ)

**مارپۆ:** (هاواری لێدەکا) کوڕە بوەستە.

**ڕێبوار -3-** : (ڕادەوەستێ)

**مارپۆ:** بۆ پێ ناکەنیت؟!.

**ڕێبوار -3-** : بۆ پێبکەنم؟!.

**مــــارپۆ:** (پـــەلاماری دەدا) بــۆ پێبکـــەنیت؟!.. ئائا؟!.. دەڵێ بۆ پێ بکەنم؟!.

**کـــەنداش:** (دەچێتــە بــن دەســتی‌یەوە. شـــانی دەگرێ). فریای خۆت بکەوە.. پێبکەنە.

**ڕێبوار -3-** :سەیرە!.. چی قەوماوە؟!.

**مـارپۆ:** (کەنداش کەلا دەخا) ئای!.. خۆ دەڵــێ چی قەوماوە؟!.

**کـەنداش:** (دەچێتــەوە بـن دەسـتی ئــەو لایــەوە) نەگبەت.. فەرمانی پادشایە.. زووکە.. پێبکەنە.

**ڕێبـــــوار -3-** : (دەداتــە قاقـــای پێکـــەنینێکی تێکەڵ لە ترس و سام)

**مارپۆ:** (دەستی لێ بەدەدا)

**ڕێبـــــوار -3-** : (بــەدەم پێکەنینەکەیـــەوە بــۆی دەردەچی)

**مـارپۆ:** (بەدەم گلەیی و هەڕەشـەوە) کـەنداش.. ڕاستە ئێمە لە منداڵی‌یەوە برادەری یەکترین. بەڵام بۆ جـاری داهـاتوو وریـای خـۆت بـە. لـەم جـارە بەدواوە گلەیی خۆت لە سەرخۆت دەبێ.

**کــــەنداش:** مــارپۆ.. گوناهمـــان دەگـــا.. مـــن دڵنیابووم کە نەی بیستبوو.

**مـارپۆ:** گوناه گونـاهی خۆیـەتی. بـۆ تەقـەلای نەداوە بیبیستێ.

**کەنداش:** دەگونجێ ڕێکەوتی کەسی نـەکردبێ پێبڕابگەیەنێ.

**مارپۆ:** دەبوو تەقەلابدا ڕێکەوت بکا.

**کـەنداش:** کە هیچ کەسێکی تووش نـەهاتبێ چۆن تەقەلا بدا!. خۆ غەیب زان نی‌یە!.

**مــــارپۆ:** کــەنداش.. تکایـــە.. مـــن ئامـــادەنیم یەکێکی تر سەرپێچی لەوفەرمانە پیرۆزەی پادشا بکاو من لەسەری ڕیشەکێش بکرێم وەکی تریش، خۆت باش دەزانیت پیاو خـراپ چـەند زۆرن. کـێ دەڵــێ ئــەو کابرایـــە بـــۆ تاقیکردنـــەوەی ئێمـــە نەنێچرابوو؟ .. تا.. کێ دەڵێ؟!.

**کەنداش:** (خامۆش دەبێ)

**مـــارپۆ:** هۆشــت بــە خۆتــوە بــێ. مــن لەوســەری هاتوومەتەوە. ئەوەی کردت دووبارەی کەرەوە.

**کەنداش:** بەڵام ئاخر..

**مارپۆ:** وتم دووبارەی مەکەرەوە. چونکە..

**پیرێژن:** (بەدەم کرووزانەوەوە دێتە سەر شانۆ)

**مارپۆ:** (هاواری لێدەکا) پیرێژن بوەستە.

**پیرێژن:** (ڕادەوەسێ)

**مارپۆ:** بۆ پێ ناکەنیت؟!.

**پیرێژن:** (دەداتە پڕمەی گریان)

**مــــارپۆ:** پیرێژنــە سەرئاســـنینە.. ســـەرمان بـــە فەتارەت مەدە.. دەی پێبکەنە.

**پیرێژن:** (زیات ربە کوڵ دەگری) (دەڕوانێتە ئەم لاوئەولا. دەچێتە بن دەستییەوە)

دایپیرەگیان هەرچیت لێقەوماوە لە بیری خۆتی بەرەوە.. تەنیا بۆ ئەم ساتەوەختە لە بـیری خۆتی بەرەوەو پێبکەنە. تکایە پێبکەنە.

**مارپۆ:** (بەرقەوە) کەنداش..

**کەنداش:** دانت دەربخە.. بەلای ڕاستدا دووان.. بەلای..

**مـــــــارپۆ:** (شمشـــێری لێدەردێنـــێ) ناپـــاك کەلاکەوە...

**کەنداش:** (دەحەپەسێ)

**مـــــارپۆ:** گیـــان لـــە چنگـــم دەرناکـــەیت.. هـەردووکتان.. گیـان لـە چنگـم دەرناکـەن.. پێشم کەون.

**کەنداش:** مارپۆ.. بەزەییت لە دڵدا بێ. بۆ مـن نا.. بۆ ئەم پیرێژنە.

**مـارپۆ:** زوو پێـم وتیـت کـە ئۆبـاڵی خـۆت لـە ئەستۆی خۆت دەبێ.

**کــــــەنداش:** (بـــۆ پـــیرێژن) داپــــیرە گیــــان.. هەرکەسێکت مـردوە، ڕەحمـەتی خـودا و پادشـای ســـەردار و ســـــەروەرمانی لێبـــێ. بــــەڵام تکایــــە پێبکەنە.. تکایە..

**پیرێژن:** فەرمانی پادشایە کە پێبکەنم؟!.. ئای کوڕە شیرینەکانم... دەزانن کێـم مـردووە؟!. شـۆڕە سوارێکم کە لە تەمەنی ئێوەدا بوو. دەشزانن چۆن و بەچی مرد؟!. من هەتا تۆزێ لەمەوبەر نەمدەزانی. وا ئێستا زانیم. لە دەمی ئێـوەوە زانیـم. مـن تـەنیا هێندەم پێوترا کە پادشا فـەرمانی کوشـتنی داوە. کـەچی وا ئـەوەتا ئێـوە بۆمـی ڕوون دەکەنــەوە کـە بۆچـی و چـۆن کــوژراوە. بــەڵام یــازووخ کــوڕە شیرینەکانم.. یـازوخ بـۆ ئێـوەی لاوی خوێنگـەرم.. یازووخ.. کوڕەکەم لە تەمەنی ئێوەدا بوو.

**کەنداش:** (سەردادەخاو خۆی دەخواتەوە)

**مــارپۆ:** (پـەلاماری پـیرێژن دەدا) پیرێژنـە سـەر ئاسنینە.. بەم قسە پڕوپووچانەت نام خەڵەتێنیت. من پادشای سـەردارو سەروەری خۆمـم خۆشدەوێ و سەرم لە ڕێی فەرمایشتیدا بەخت دەکەم.

**پــــیرێژن:** گونـــاحیت کـــوڕە شـــیرینەکەم.. گوناحیت...

**مـــارپۆ:** لـەوە زیـاتر چەنـە مـەدە.. پێشـم کـەوە بەرەو وەرگرتنی سزای هەقیانەتی خۆت.

**کەنداش:** (بە پاڕانەوەوە) مارپۆ.. بەزەییت لە دڵدا بێ.

**مـــارپۆ:** (پـیرێژن دەداتـە پێـش خـۆی) تـۆش ئۆبـاڵی خـۆت کەوتۆتـە ئەسـتۆی خـۆت. هـەقی گلـەییت بەسـەرمەوە نـەماوە. خـۆت دەبینیتـەوە. (پیرێژن دەداتە پێش خۆی. سەر شانۆ جێدێڵن)

**کـەنداش:** (سـەربە سـەرملدا شـۆڕدەکاتەوە. لـە جێی خۆی دەچەقێ)

**( تاریکی )**

**( دیمەنی دووەم )**

(شـوێن نـاو گۆڕسـتانێکە. هـەردوویاریدەدەری زانا خۆیـان تێدا حەشاردراوەو لـە حاڵـەتی تـرس و سامدان)

**یاریدەدەر-1-:** وتم دوکتۆر مەکە.. وتم دوکتۆر دەسـتم دامێنـت لـە کـەلی شـەیتان وەرە خـوارەوە و سـەری ئـەم تابووتـە لەعنەتییـە هەڵمـەدەرەوە، بـە قسەی نەکردم.

**یــاریدەدەر-2-:** کوڕە بگرە من ڕاسـت و ڕاسـت پێـم وت کـە بـاوەڕی تـەواوم بـەو نووسـینەی سـەر تابووتەکــــە هەیـــــە. وتم دوکتـــــۆر، لەعنـــــەتی فیرعەونــەکان کــەم کەســـی نەکوشـــت. ئـــەمیش لەعنەتێکە لەو بابەتەو با لە خۆمانی نەوروژێنین.

**یــــاریدەدەر -1-** :یـا تـۆ بڵــێ: ئـەویان تــەنیا نوســـرابوو (لەعنـــەت لـــەو کەســـەی تــابووتم هەڵدەداتەوە). لە کـاتێکدا ئـەمیان بـە دەمـی خـۆی هــــاواری دەکـــرد: "نەکـــەی ســـەری تـــابووتم هەڵبدەیتەوە". ئەگەر ڕاستت دەوێ ئەو بێ غەش و غایلـە پیـاوەتیی خـۆی لەگـەڵدا کردبووین. بـەڵام ئێمە.. داخ ئێمە خۆمان...

**یـاریدەدەر -2-** : ئێمە خۆمان گـەوجێك بووین ئاومان لێڵ نەدەکرد.

**یــاریدەدەر -1-** : ئێســتا چــی بکــەین!.. چــار چی‌یە؟!.

**یــاریدەدەر -2-** : چــار؟!.. چــار ئەوەیــە هــەتا ماوین هەر کاڵەك بەئەژنۆ بشکێنین!.

**یــاریدەدەر -1-** : هــەتا مــاوین؟. بـۆ لــە تـۆ وایــە هەتاکەی دەمێنین؟!.

**یــاریدەدەر -2-** : دەزانم.. یــەك دوو ســەعات.. یەك دوو ڕۆژی تر.. لەوە بەولاوە نی‌یە. بۆیە منیش

وای تێدەگەم کە لە کاڵەک شکاندمان بەئەژنۆ زیاتر بۆ نەماوەتەوە.

**یاریدەدەر –1–** : بەڵام نابێ.. نابێ وابێ.. دەبێ چارەسەرەک بدۆزینەوەو بە هەر کلۆجێک بێ خۆمان ڕزگار بکەین.

**یاریدەدەر –2–** : چارەسەرو ڕزگاربوون؟!.. (بەتەوسەوە) وەڵا ئەوە مەگەر تەنیا لە دەست جەنابی دوکتۆر بێت!.

**یاریدەدەر –1–** : دوکتۆر؟!.. بەڵام کوا دوکتۆر؟!. کێ دەزانێ لە کوێیەو چی بەسەرهاتووە؟.

**یاریدەدەر –2–** : من دەزانم.. جەنابی دوکتۆر ئێستا کراوە بەتۆپێکو یاساوڵەکانی پادشا هەروا بۆ سەیرو سەفای پادشا تۆپ تۆپێنی پێدەکەن.

**زانا:** (لەسەر شانو بێ ئەوەی یاریدەدەرانی ببینێ، بەترسەوە دێتە سەر شانۆ لە یەکتری ئاشکرا دەبن)

**یاریدەدەر –1–** : (بەپەرۆشەوە) دوکتۆر..

**یاریدەدەر –2–** : دوکتۆر.. فریامان کەوە.. چار.. چارمان چییە؟!.

**زانا:** (ماندووە. بێ وەرامدانەوە دادەنیشتێتە سەر زەوی)

**یاریدەدەر –1–** : دوکتۆر.. تۆ جارێ بۆمان باس بکە.. چیت لێبەسەرهات.. ئەم ماوەیە لە کوێ بوویتو چیت دی؟!.

**یاریدەدەر –2–** : چۆن زانیت ئێمە لێرەین؟!

**زانا:** نەمدەزانی ئێوە لێرەن.. لە کوێوە بزانم؟.

**یاریدەدەر –2–** : ئەی چۆن هاتیت بۆ ئێرە؟!

**زانا:** ئێوە چۆن هاتن؟.

**یاریدەدەر –2–** : وتمان گۆڕستان بۆ خۆحەشاردان لە هەموو شوێنێکی تر سەلامەتترە.

**زانا:** تەواو. منیش وەک ئێوەی بۆ چووم.

**یاریدەدەر –2–** : (بەگومانەوە سەیرێکی یاریدەدەر –1– دەکا) تەنیا هێندە؟!

**زانا:** (ئاسایی) ئا..

**یاریدەدەر –1–** : (قسەکەی یاریدەدەر –2– پشت گوێ دەخا).

دوکتۆر.. تکایە بۆمانی بگێڕەوە.. چیت بەسەرهات. بمان بەخشە.. ئێمە خۆمان پێڕانەگیرا کە ئێمە هەڵاتین، جەنابی پادشای ناپادشا چی کرد؟!.

**زانا:** ئەوەیان پێ نازانم. چونکە منیش دوای ئێوە بەچەند ساتێک هەڵاتم. منیش خۆمم پێڕانەگیراو هەڵاتم. ئەوەیان هیچ. ئێوە چیتان دی منیش هەر ئەوەم دی. بەڵام دوایی.. دوایی...

**یاریدەدەر –1–** : دوایی چیت دی؟!.

**زانا:** ڕیشەکێش کردن.

**یاریدەدەر –2–** : ڕیشەکێش کردن؟!. ڕیشەکێش کردن چییە؟!.

**زانا:** (دەیەوێ باسی بکاو بۆی ناکرێ) ڕیشەکێش کردن.. یانی.. زەلامێک.. یانی من یا تۆ دێنن.. هێن.. ئاوا.. ملی... ئیتر.. نازانم.. وازم لێبێنن.

**یاریدەدەر –1–** : یانی ملی هەڵدەکێشن.. وەک چۆلەکە ملی هەڵدەکێشن؟!.

**زانا:** (سەر بۆ سەلماندنی قسەکە ڕادەوەشێنێ)

**یاریدەدەر –2–** : یانی تۆ بەچاوی خۆت دیت؟!

**زانا:** (ئەمجاریش وەک جاری پێشوو سەر ڕادەوەشێنێ.)

**یاریدەدەر –2–** : واتە هەر هێندەی بەر دەستیان بکەوین ڕیشەکێشمان دەکەن؟!.

**زانا:** بێگومان.

**یاریدەدەر –2–** : ئەی دەفەرموو جەنابی دوکتۆر بەفریامان بکەوەو ڕزگارمان بکە.. دەفەرموو. وەک ئەوا تووشت کردووین ڕزگاریشمان بکە!.

**زانا:** (بەبێ دەسەڵاتی‌یەوە سەیرێکی دەکا) سەبرم لێبگرن.. باپشوویەک بدەم ئەوسا بیرێکی لێدەکەمەوە.

**یاریدەدەر –2–** : پشوویەک بدەیتو ئینجا بیرێکی لێبکەیتەوە؟!... (بۆ یاریدەدەر –1–). گوێت لێیە؟!..

ئێمە ها ئێستا ها ساتێکی تر دەگیرێینو ڕیشەکێش دەکرێینو کەچی ئەو...

پاسەوانی گۆڕستان/ دوولاو: (لە سووچی بنەوەی لای ڕاستی شانۆوە بەبەرگی کۆنەوە دەردەکەون)

**زانا:**/ یاریدەدەرانی: (خۆیان دەشارنەوە)

**پاسەوان**/ دوولاو: (دێنە پێش دەمی شانۆ)

**پاسەوان:** (لەسەر بەردێک دادەنیشێ) تا ئێستا ئەوە چلو چوار!.

**لاو –1–** : چلو چوارەمین بەنەسیبی ئێمە بوو. ئەگەر وا بڕوا هەشتاو هەشتەمین من دەبم.

**لاو –2–** : یاخود من.

**پاسەوان:** نە ء کوڕە شیرینەکانم.. نە ء.. من دەبمو ئاواتەخوازیشم من بم. وا مەرگی یەکەمتانم بینیو خۆم دەزانم چ چنگو نیوکێک جەرگو دڵم پارە پارە دەکا. تکاتان لێ دەکەم.. لێتان دەپاڕێمەوە. ئێوە وەک کاکتانو من مەکەن. بەپێی فەرمایشتەکە کردار بکەنو خۆتان لە ڕیشەکێش کردن ڕزگار بکەن.

**لاو –1–** : (بۆ باوکی بەچۆکدا دێ) بابە.. چۆن داوای شتی وەهامان لێدەکەیت؟!. تۆ خۆت فێرت کردووین کە ئەگەر سەرێشمانی تێدا بچێ، قەت مل بۆ زۆرو جەور نەدەین.

کاکیشمان هەر بەپێی ئەو ئامۆژگاری‌یەی کردو من دڵنیام کە لێی پەشیمان نی‌یەو ئەگەر زیندووی بکەیتەوەو بیخەیتەوە بەر هەمان تاقیکردنەوەوە، ئەو هەڵوێستەی خۆی دووپات دەکاتەوە.

**پاسەوان:** کوڕەکەم.. لێم مەگرە.. منی لە ئامۆژگاری‌یەکەم پەشیمان نیم. بەڵام ڕەنگە...

**لاو –2–** : ڕەنگە چی؟!.. زۆرو جەورەو پادشایەکی نەگریسی زۆردار دەیکاو بەوێنەیەکیش کە مەگەر هەر ئەهریمەن زەفەری پێ بەرێ!.

**لاو –1–** : ئەهریمەن؟!.. ئەهریمەن کەی شتی وەهای بەبیردا هاتوە؟!.. ئەوەتەی ئەهریمەن ئەهریمەنەو ئەوە ئەو نەخشە بۆ شەڕخوایی دەکێشێو مرۆڤیان پێ موبتەلا دەکا، قەتو قەت نەبیستراوە زەفەری بەم شێوەیەی زۆر و جەور بردبێ.

**لاو –2–** : بەڕاستی جێی سەسوڕمانە!.. لە کوێی هێنا، لە کوێوە؟!.. چۆن بیری بۆ ئەم بابەتە زوڵمو زۆر کردن کە بێ وێنەیە چوو؟!.. گریان.. مرۆمۆچی.. کرووزانە.. تەنانەت بیرکردنەوە لە خەفەت خواردن، قەدەغەیە!.

هەر پێ‌بکەنن.. لەژێر لێفەشداو خەو دەتابنباتەوە پێ‌بکەنن.

بابە.. ئاگات لێیە.. ئێستا ئێمە دەبێ بدەینە قاقای پێکەنین بەڕیشەکێش کردنی کاکم بدەینە قاقای پێکەنین دەتوانیت؟!.

**لاو –1–** : لە باری پانی دەرکەوتنی دوو دان بەلای ڕاست دوو بەلای چەپدا!.. دەتوانیت؟.

**لاو –2–** : لە باری شاقوولی، دەرکەوتنی نیوەی خوار چوار دانی سەرەوەو نیوەی سەرەوەی چوار دانی خوارەوە دەتوانیت؟!.

**لاو –1–** : لەوە زیاتر پەسندەو کەمتر سەرپێچی کرد فەرمانی پیرۆزی پادشا.. دەتوانیت؟.

**لاو –2–** : بابە.. تکایە.. دەتوانیت؟.

پاسەوان: (ڕادەپەڕێتە سەرپێ) نە ء.. هەرگیز نە ء.. هەرگیز نە ء.

**لاو -1-/ لاو -2-** : (کــەمێك لێی دەكشــێنە دواوەو بەرەو ڕووی دەوەستن)

**پاســەوان:** (خــۆی دەخواتــەوەو بەحیدەتــەوە) لەعنــەت بــێ.. لەعنــەتی ئــاهوورات لێ بــێ هــەی جانــەوەری خوێــن شــەرخوای بــێ وێنــە. هــەی لــە کوێــوە ئەهریمــەن چەپــەڵتر. تــۆ لــە هــاتیتو لــە چ قوڕنەیــەکی دۆزەخــرا بەســترابوویتەوەو بــەرەڵا کرایــت؟!. کــێ بــوو بــەرەڵای کردیــت ووەك ئەژدیهایەکی قوورەتی بەری دایتە گیانی ئێمە؟!... کێ بو؟!.

**لاو -1-** : بابــە.. هێــور بــەرەوە.. تکایــە هێــور بەرەوە.

**پاسەوان:** (بەتەوسەوە)

پادشــای خۆشــیو شــادمانی!.. کــەمو زیــادی نییە!.. چلو چوار. لە ماوەی دوو سەعاتی دوای بڕیاری بەخشینی خۆشیو شادمانی، چلو چوار سەر لە لــەش جیا کرانــەوە.. چلو چوارەمینیش جگــەر گۆشــەیەکی خــۆم بــێ!. لەعنــەتت لێ بــێ.. لەعنەتت لێ بێ هەی پادشای ڕیشەکێش کردن.

**لاو -2-** : بابــە.. بابــە گیــان.. لەســەرخۆ بــە.. تکایە لە سەرخۆبە.

**پاســەوان:** (هێمــن دەبێتــەوە. لــە جــێی خــۆی دادەنیشتێتەوەو خامۆش دەبێ).

**لاو -1-/ لاو -2-** : (لەم شانو لەو شانییەوە ڕادەوەستنو لە چاوەڕوانیدا دەمێنێتەوە).

**زانا/ یاریدەدەرانی:** (خشپەیەکیان دێ)

**لاو -1-/ لاو -2-** : (لێیان بەئاگا دێن)

**پاسەوان:** (وریا دەبێتەوەو ڕادەپەڕێتە سەرپێ)

**لاو -1-/ لاو -2-** : (شمشێر دەردێننو یەکەم بۆ لای ڕاستو دووەم بۆ لای چەپی شانۆو بەرەو قووڵایی دەچن. زاناو یاریدەدەرانی بەدی دەکەنو دەیانهێنن).

**پاســــــــەوان:** (پیایــــــاندا هــــــەڵدەڕوانی. بەسەرسامییەوە)

ئێوە چینو کێن؟!.

**زانا/ یــاریدەدەرانی:** (وەرامیــان بــۆ نادرێتــەوە. بەبەرگی ئاسایی خۆیانەوەن)

**لاو -1-** : جاسووسی پادشان.

**لاو -2-** : بەئاشکرا دیارە. بڕوانە چۆن ترسی مردن زارەترەکی کردوون.

**لاو -1-** : ڕیشــەکێش کردنتــان بەفــەرمانی پادشای خۆشیو کامەرانی بەلاوە چۆنە؟!.

**لاو -2-** : زۆر خۆشەو جێی خۆیەتی. ونا؟!.

**لاو -1-** : بابە.. بڕوانە.. ئەم سەرپێچی کەرە نەگریسانە پێ ناکەنن!.

فەرمایشتت بەچییە؟!.

**لاو -2-** : جــا ئــەوە فەرمایشــتی بابمــانی بۆچییــە؟!.. ســەرپێچی کــەرن لــە فەرمایشــتی پادشاو واتە پیلانگێڕنو بڕایەوە. دەبێ بێ چەندو چۆن ڕیشەکێش بکرێن. وانییە بابە؟!.

**پاســەوان:** (ســەریان بــۆ هــەڵدەبڕێو تــێیــان دەڕوانێ). ئێوە کێن؟!.

**زانا:** (بەپەشۆکاوییەوە)

ئێمە.. من زانای شوێنەواری کۆنم.. یانی من.. گوایە من..

**پاسەوان:** ئەی ئەوانە؟!.

**زانا:** ئەوانە.. ئەوانەش یاریدەدەرمن.

**پاسەوان:** واتە تۆ بوویت؟!.

**زانا:** (مل کەچ دەوەستێو وەرام ناداتەوە).

**پاسەوان:** بۆچی وەهات کرد؟!.

**زانا:** (هەر وەرام ناداتەوە).

**پاسەوان:** (بەکەم تەرخەمییەوە) دانیشن.

**لاو -1-** : بابە... بابە تکایە..

**پاسەوان:** (وەك فەرماندەیەك) دانیشن.

**زانا/** یاریدەدەر: (دادەنیشن).

**پاســەوان:** (وەك حیکایــەتێك بگێڕێتــەوە) گــوێ بگــرن. دەگێڕینــەوە کــە لــە زەمــانی زوودا دوو کارەسات قەوماوەو ئادەمیزادی ئەم سەر زەمینەی هێناوەتە ژەنگو ژار.

یەکەمیان تۆفانێك دووەمیان گورگێك. تۆقانەکە هەرچییــەکی هاتۆتـــە ســـەر ڕێ ڕای مـــاڵیوەو دووەمیــان هەرچییــەکی تــوش هــاتووە کەلەپاچــەی کــردووە!. بــەلام وائێســتا کارەســاتی ســێیەم ڕوو دەدا.. کارەساتی سێیەم نەتۆفانەو نــە دەکــرۆژێ. ئــەمیان گیــانو دڵو دەروونو هەســتو نەســت دەکــرۆژێو ئیــتر ئــادەمیزادو ئــاژەڵو ڕووەكو داروبەردی بێگیان هەموو چۆن یەك دەبن. پادشای خۆشیو شادمانی هیچ جیاوازییــەك لــە نێوانــدا ناهێڵێ. ئەوەشــی ســەرپێچی لــەم فەرمانــەی دەکــا، ڕیشــەکێش دەکــرێو لــە ماوەیــەکی زۆر کورتـــدا، پادشا دەبێتــە ســەردارو ســەروەری وردو درشــتی هـــەموو شـــتێكو هـــەموو شـــتەکان بـــەگیانداری بێگیانــەوە دەبنــە پەپوولــەی دەوری چــرای ئــەو. ئەمەت پێخۆشە؟!.

**زانا:** هەرگیز نە ء... هەرگیز نە ء..

**یــــاریدەدەر -1-/ یــاریدەدەر -2-** : هـــەرگیز پێمان خۆش نییە قوربان. پێمان خۆش نییە.

**لاو -1-** : بابــە.. گوایــە تــۆ بــاوەڕت وایــە کــە ئەمانە جاسووسی پادشا نین؟!.

**پاسەوان:** نەکوڕەکەم.. نە ء.

**لاو -2-** : بابە.. بەچیدا دەزانیت؟!.

**پاسەوان:** دەزانم کوڕم.. دڵنیا بن.. ئەمانیش لە ترسی ڕیشە کێش کــردن هــەڵاتوون. گومانتــان لــە دڵــــدا نــــــەمێنێ. (ڕووی دەم دەکاتـــــە زانــــــاو یاریدەدەرانی)

بەهــەرحاڵ، وا ئێســتا چارەنووســتان لەگــەڵ چارەنووسماندایــە. بەدەســتی خۆتــان چاڵتــان بــۆ خۆتــان هەڵکــەندو خۆتــان خســتە بــەر مەترســیی یاساکەی پادشای خۆشیو شادمانییەوە. ئێستا فــەرموون بدوێــن. چــی دەکــەنو نیــازی چیتــان هەیە؟!.

**زانــا:** (هاتۆتــەوە ســەرخۆی بەخەفتبارییــەوە) خەتای ئێمە بوو.. بمان بەخشن.

**یـــاریدەدەر -1-/ یـــاریدەدەر -2-** : (پێکــەوە) خەتای تۆ نەك ئێمە.

**زانا:** (بەتووڕەبوونەوە) ئەی بۆ لەگەڵمدا هاتن

**یـــاریدەدەر -1-/ یـــــاریدەدەر -2-** : بــەزۆر هێناتین.. هەڵتفریواندین.

**زانا:** وانییە.. ئێوە...

**پاسەوان:** (قسەیان پێدەبڕێ) تکایە.. تکاتــان لێدەکەم. وەختی ئەم ڕازو گلەییە نییە، چونکە بێ سوودە. هەڵی بگرن بۆ وەختــی خــۆی. ئێستا لەوە بدوێن کە دەبێ چی بکەنو چۆن ئــەم گرفتــە سەختە چارەسەر بکەن. بۆ خۆشتانو بۆ ئێمــەش وەها چاکتر نییە؟.

**زانــــا:** یــاریدەدەرانی: (دەڕواننــە یــەکتر. ڕوو دەکەنــەوە پاســەوان. ســەری ڕەزامــەندیی بــۆ دەلەقێنن)

**پاســەوان:** (ڕووی دەم لــە زانــا دەکــا) چاکــە.. فەرموو.. چی بە باش دەزانیت؟.

**زانــا:** (هەڵدەستێتە ســەرپێ. دەکەوێتــە هــاتو چۆکردنو بیردەکاتەوە)

**پاسەوان/ لاو -1،2-**

**یـــــاریدەدەر -1،2-** : (چــاوەڕوانی وەرامــــی لێدەکەن)

**پاسەوان:** (کە هەر وەرامی لێنابیسێ، ڕووی قسە دەکاتە یاریدەدەرانی) ئەی ئێوە.. ئێوە دەڵێن چی؟!

**یاریدەدەر -1،2-** : (دەڕواننە یــەکتر. دەکەونــە هاتو چۆکردنو بیر دەکەنەوە)

**پاسەوان:** (هــەر لــە ســەر بــاری دانیشــتنەکەی خۆیەتی)



**لاو -1،2-** : (هەر لەم شانو لەو شانییەوە ڕاوەستاون)

**پاسەوان:** (لەسەرخۆ هەڵدەستێتە سەرپێ) تکایە گوێم لێبگرن.. گوێم لێبگرن من پێتان بڵێم دەبێ چی بکەن.

**زانا/ یاریدەدەرانی:** (وریا دەبنەوە)

**پاسەوان:** کوڕەکانم.. تاقە چارەسەر لەبەر دەمتاندا ئاخنینەوەی پادشایە بۆ ناو تابووتەکەی.

**زانا/ یاریدەدەرانی:** (لێی دێنەوە پێشەوە)

**پاسەوان:** چەندیش دەستو برد بکەن باشترە.. بۆ خۆشتانو بۆ ئەو هەزاران سەرەی بەرێوەن بەریشەکێش کردن لە لەشیان جیابکرێنەوە باشترە.

**زانا:** (بەپەشۆکاوییەوە) بەڵام.. بەڵام چۆن؟!.

**پاسەوان:** (بەتەوسەوە) چۆن سەریت هەڵدایەوە؟!.

**زانا:** ئاسان بوو.. سەرقاپێكو بەیاریدەی ئەم زاتانە. (دەس بۆ یاریدەدەرانی درێژ دەکا) دەستمان دایەو لامان دا.

**یاریدەدەر -1،2-** : (پێکەوە) ئەو کارە نەگریسەت بەزۆر بەئێمە کرد.

**زانا:** (بەتووڕەییەوە)

بەزۆر نەبوو.

**پاسەوان:** (بەتەوسەوە)

هەمدیس؟!. وتمان وەختی نییە (بۆ زانا)

کتو مت بەچەشنی لادانەکە.. سەرقاپەکە بنێرەوە جێی خۆی.

**زانا:** (هەر بەپەشۆکاوییەوە)

ئەی ئاخر.. ئاخر..

**پاسەوان:** (هەر لەسەرخۆ)

بڵێ.. بڵێ بزانم.. ئەی ئاخر چی؟!.

**زانا:** (خۆی هێور دەکاتەوە)

**یەکەم:** چۆن دەستمان بگاتەوە تابووتەکە.

دووەم: چۆن ئەو جانەوەرە جەربەزەیە بەگیر بێنینو بیخەینەوە ناو تابووتەکە.

**پاسەوان:** (نەرمە پێکەنینێك)

**گوێ بگرە:** بۆ یەکەم: ئێمە خۆمان دەستت دەگەیەنین بەتابووتەکە. بۆ دووەمیش: دوایی من تێتاندەگەیەنم چۆن.

**زانا:** ئەگەر وەها بێ ئاسانە. بەڵام چۆنی بەجێ بێنینو کەی؟!.

**پاسەوان:** بۆ چۆنێتییەکەی ئێستا دەچینەوە ماڵەوە لەسەری ڕێك دەکەوین. بەڵام کەی بەجێ بهێنرێ، ئەوا من بەپێویستی دەزانم کە هەر ئەمشەو بێو بەوە دەتوانین چەند سەد ملێك لە ریشەکێش کردنی سبەینێ ڕزگار بکەین.

**زانا:** (بۆ یاریدەدەران)

دەڵێن چی؟.

**یاریدەدەران:** ئامادەین.

**(تاریکی)**

## دیمەنی سێیەم

(سەر شانۆ ڕووناك دەکرێتەوە. پادشا بۆ تابووتەکەی لە سوژدەدایە، تابووت سەری هەڵدراوەتەوە).

**دەنگ:** (دەنگی هێزی سەروەری پادشایە) وریابە.. من تەواو لێت ڕازی نیم. هێشتا ئاسوودەت نەکردووم.

**پادشا:** (هەڵدەستێتە سەرپێ. بەرێزلێنانەوە) بم بەخشە سەروەرم.. کەمو کووڕیم چییە؟!.

**دەنگ:** یاساکەم. من لەناو هەزاران پادشاو میرو پادشاو میرو سەرداردا، تۆم هەڵبژاردو پشتم بەست. تۆم بەو خاوەن دەستو مەچەکە پۆڵایینە دانا کە ئەو یاسایەم بەسەر ڕەعیەتەکەمدا بۆ بسەپێنیت.. بەڵام کوا؟!.

**پادشا:** گەورەم.. چۆنت نەخشە بۆ کێشامو چۆنت وت وەهام کرد.

**دەنگ:** هێشتا هەن سەرپێچی لێدەکەن.

**پادشا:** دەیان پلیشێنمەوە.. دەیانهارم.. بەرەچەڵەکیانا دەچمە خوارەوە.

**دەنگ:** کوا.. کەی؟!.

**پادشا:** هەر ئێستا.. مۆڵەتم بدە.. تکایە مۆڵەتێکی ترم بدەرێ.

**دەنگ:** دوا مۆڵەت؟.

**پادشا:** دوا مۆڵەت.

**دەنگ:** (بەدەم کزبوونەوە)

وریابە.. ئەمە دوا مۆڵەت دەبێ.. دوا مۆڵەت.. دوا مۆڵەت..

**پادشا:** (دەنەرێنێ)

**شارات:** کوڕە شارات..

**زانا:** (دێتە سەر شانۆ)

**پادشا:** (پشتی لێیەتی)

**زانا:** (بەتەوسەوە)

ئەمرکە پادشای خۆشیو شادمانی

**پادشا:** (بەسەرسامی‌یەوە وەردەگەڕێ. بەبینینیان رادەچەڵەکێ و دەکشێتە دواوە)

**زانا:** جەناب ئیتر کۆتاییتە.

**پادشا:** شارات.. هۆ.. شارات...

**زانا:** عەزێت مەکێشە.. هەموو شاراتەکانت بەگۆڕەکانی خۆیان شادو شوکوربوونەوەو لە نەڕەنەڕو شاتەشاتت رزگاریان بووەوە.

**پادشا:** (بێدەنگی)

**زانا:** هەروەها جەنابیشت دەبێ بەم تابووتە لەعنەتی‌یە ناشادو ناشوکور ببێتەوە.

**پادشا:** (بەتەوسەوە)

من؟!...

**زانا:** ئاتۆ.. ئا بەڵێ تۆو بۆ هەتا هەتایە.

**پادشا:** (بەهێواشی پێدەکەنێ)

**زانا:** دەتبینم پێدەکەنیت.

**پادشا:** (دەداتە قاقای پێکەنین).

**زانا:** وا دیارە زۆر لە خۆت دڵنیایت؟!

**پادشا:** (هەر بەدەم کوڵی پێکەنینەوە)

وتت....

**زانا:** ئا بەڵێ..

**پادشا:** بۆ هەتا هەتایە..

**زانا:** بەڵێ.. بۆ هەتا هەتایە.

**پادشا:** (پێکەنینی خاو دەبێتەوە)

کوا بزانم!..

**زانا:** جەناب ڕەنگە تۆ بەقسە پڕ فرت و فێڵەکانی سەر تابووتەکەت پشت ئەستوور بیت!.

**پادشا:** (بێ پێکەنین)

بێگومان.. ئەی نابینیت لە ئەنجامیاندا چیم بەسەر هێناویت؟!.

**زانا:** ئێستا ئیتر دادت نادەن!.. چوومە بنج و بناوانی هەموویانەوە.

**پادشا:** هەموو، هەموو؟!..

**زانا:** هەموو، هەموو.

**پادشا:** ئەوەشی کە دەڵێ...

**زانا:** (قسەی پێدەبڕێ)

گیاندار یەکجار دەمرێ... ئا بەڵێ ئەوەشیان.

**پادشا:** (دەشڵەژێ)

یەعنی...

**زانا:** یەعنی ئەویش دادت نادا.. چومە بنج و بناوانی ئەویشەوە. بۆیە چاوەڕوانی ئەوە مەکە بەمراندنی ئاسایی بتمرێنمەوە.

**پادشا:** (بەسەرسامی‌یەوە)

یەعنی...

**زانا:** یەعنی...

(پەنجە بۆ تابووتەکە ڕادەکێشێ)

**پادشا:** (شێتگیر دەبێ). پشت دەکاتە تابووتەکەو باڵ بڵاودەکاتەوە)

نا.. نا.. نابێ.. ناشێ.. ناتوانیت..

**زانا:** (ئیشارەت بۆ لای ڕاست یا لای چەپی شانۆ دەکا)

وەرن...

**یاریدەران:** (دێنە سەر شانۆ)

**سێقۆڵی:** (لێی دەچنە پێش)

**پادشا:** (زیاتر دەکشێتە دواوە)

نا.. نا.. ناتوانن.. نایەڵم.. نایەڵم..

زانا: وتم کۆتاییەو بۆ هەتا هەتایە.

**پادشا:** (بەپاڕانەوەوە)

مەکەن.. تکایە.. مەکەن.. تکایە.

**زانا/** یاریدەدەران: (زیاتر لێی دەچنە پێش)

**پادشا:** (بەهەڕەشەوە)

دەتانهاڕم.. دەتان پلیشێنمەوە.. ریشەکێشتان دەکەم.. لاشەکانتان دەسووتێنم و خۆڵەمێشەکەیان بەبا دەدەم...

**زانا/** یاریدەدەران: (زیاتر لێی دەچنە پێش و دەست دەدەنە یەخەی و هەردو باڵی دەگرن)

**پادشا:** (دەپاڕێتەوە)

تکایە.. دەستم دامێنتان.. بەزەیی.. تۆزێ بەزەیی.. نا.. مەکەن.. نا.. بێ دەسەلاتم.. بێ دەرەتانم.. مەکەن.

**یاریدەدەران:** (بەپاڵەپەستۆ لە تابووتەکەی دوور دەخەنەوە).

**زانا:** (دەچێ بەلای تابووتەکەوەو دەس دەگرێ بەسەر قاپەکەیەوە)

**پادشا:** (خۆی ڕادەپسکێنێ. بەهەڕەشەوە) سەرتان پان دەکەمەوە.. بەرەچەڵەکتاندا دەچمە خوارەوە. دنیاتان بەسەردا وێران دەکەم.. بگرە هەموو دنیا بەسەریەکداو بەسەر خۆشمدا وێران دەکەم. دوای من نابێ کەس بمێنێ.. نابێ هیچ شتێك بمێنێ.. نابێ دنیا بمێنێ..

**زانا:** (بەڕقەوە سەرقاپی تابووتەکە بەتوندی دادەداتەوە)

**پادشا:** (ئاسایی لە دەس یاریدەدەران بەر دەبێ. وەك تارمایی‌یەك پاشەوپاش سەر شانۆ جی‌دێڵێ) نابێ دنیا بمێنێ.. نابێ.. نابێ.. نابێ..

**زانا:** (دێتە پێش دەمی شانۆ)

بەڕێزان.. بم بەخشن.. خۆ بۆتان دەرکەوت کە من چەندە مێژووناس و زانای پشکنینی شوێنەواری کۆنم، هێندەش ئەکتەرێکی چاکم و وەك بینیتان دەتوانم باش تێکەڵ بەیەکتریان بکەم. من بەش بەحاڵی خۆم لەم ڕووەوە لە خۆم دڵنیام. بەڵام هێندەی مەسەلە، پەیوەندی بەئێوەوە هەبێ، ئاواتەخوازی ئەوە دەبم کە دڵی کەستانم نەیەشاندبێ و خوانەخواستە هیچ نووکە دەرزی‌یەکم نەکردبێ بەبنی نینۆکی کەستاندا. باوەڕم پێبکەن من کابرایەکی زۆر دڵ سافم و ڕقم لە کەس نی‌یەو حەزیش ناکەم کەس ڕقی لێم بێ.. بەڵام تەنیا هێندە هەیە کە بەزگماکی رقێکی قەبەو ئەستوورم لە زوڵم و زۆرو چەوساندنەوە لە باووباپیرانەوە بۆ بەجێ ماوەو هەر بەم پێودانگەشەوە بەلامەوە گەلێ ئاسایی‌یە کە زوڵمکەرو زۆردارو چەوسێنەران رقیان لێم بێ و کۆ لەوە نەکەنەوە کە کام دەردو سزاو ئەندێشە توندو تیژو سەخت و لە رادەبەدەرە پێمی بنۆشن.

بەهەرحاڵ من گیانی کابرام ئاخنییەوە ناو تابووتەکەی و هەڵەکەی خۆمم سڕی‌یەوە. ئیتر ئێوەش خۆتان و خوای خۆتان.

**(تاریکی)**




گۆڤاری کاروان (12)، ئەیلوولی 1983، گۆڤاری ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری لاوان

# نامۆبوون لە چیرۆکەکانی حوسێن عارفدا

ڕەفیق سابیر

(چەند شەرمە بەزمانی زانایەك باسی شتێك بکەم لە کاتێکدا دەتوانم بەزمانی ئەزموونی تاکەکەسی باسی بکەم)

*نیتشێ*

**سەرەتا**

سەفەری ئەفسووناوی حوسێن عارف بەجیهانی چیرۆکنووسیندا، سەفەرێکی پڕ لە داهێنانو موغامەرەی هونەری، پڕ لە وردبوونەوەیە لە دەورووبەرو پشکنینی جیهانی ناوەوەی مرۆڤە.

حوسێن لە سەرەتای حەفتاکانەوە، بەجیدی بابەتی نوێو تەکنیکی نوێ دادەهێنێت، بەوزەیەکی داهێنەرانەوە بەشداربیەکی گەورەی پێشخستنی چیرۆکی کوردی دەکات.

لەهەر قۆناغێکی ئەم سەفەرەدا ئێمە بەلایەنێك یان چەند لایەنێکی جیهانی چرو جەنجاڵی چیرۆکنووسینی حوسێنو کەسانی چیرۆکەکانی ئاشنا دەبین، سەفەری حوسێن لە واقیعو باوەڕو کۆمەڵەوە دەستپێدەکات، بەرەو مرۆڤو گومانو دنیای ناوەوەی مرۆڤ دەکشێت. لەدوا ئەنجامدا، مرۆڤ بەلایەنە بەهێزو لاوازەکانییەوە، بەئەندێشەو خەونو ئایدیاڵو ئاواتەکانییەوە، بەنامۆبوونی بەخۆیو کۆمەڵو واقیع دەبێتە ئامانج نیان، لە هەمان کاتدا خولیایی پشکنین لەلای حوسێن، لە پرۆسەی بەردەوامبوونیاندا، شێوە تایبەتییەکانی دەربڕینی خۆیانو فۆڕمی هونەریی خۆیان دادەهێنن.

پێش ئەوەی مەسەلەی بەخۆنامۆبوونی مرۆڤ لە چیرۆکەکانی حوسێندا باس بکەم، بەپێویستی دەزانم بەکورتی باسێکی نامۆبوون، وەك چەمکێکی فەلسەفیو سۆسیۆلۆژیو وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بکەم.

نامۆیی، یان نامۆبوون Alienation مەبەست لەو حاڵەتەیە کە مرۆڤ نامۆیانە لەگەڵ خۆیدا ژیان بەسەر دەبات، یان ئەو بەخودی خۆی نامۆ دەبێتو ناتوانێت لەگەڵ کۆمەڵو دەوروبەردا، بەجۆرێکی ئاسایی ژیانی سروشتی خۆی، وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی درێژە پێبدات. مرۆڤی نامۆبوو، وەك ئێریك فرۆم دەڵێت، پەیوەندیی لەگەڵ خودی خۆیداو بەهەمان شێوە پەیوەندیی لەگەڵ هەر کەسێکی دیکەدا لە دەست دەدات.[1]

نامۆبوون، یان بەخۆ نامۆبوون وەك دیاردەیەکی باوی کۆمەڵایەتیو، وەك ئەنجامێکی سەرهەڵدانو گەشەکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری، کە حاڵەتو شێوەی بسیکۆلۆژی وەردەگرێ، باس و لێدوانی زۆری لێکراوە، هۆکارە جۆر بەجۆرە ئابووریو کۆمەڵایەتییو کولتوورییەکانی روونکراونەتەوە، لێرەدا، پەیوەندی لەگەڵ باسەکەی ئێمەدا، ڕەنگە باسکردنی حاڵەتو شێوەی بسیکۆلۆژیی نامۆبوون، کە لە مرۆڤی بەخۆنامۆدا دەردەکەون، لە باسکردنی هۆکارەکانی دیاردەکە گرینگتر بن، چونکە هۆکارەکان هەرچییەك بن، ئەوا حاڵەتو ئەنجامە پسیکۆلۆژییەکانی، ئەگەرچی ڕەنگی کولتووریی خۆیان دەگرن، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر لە یەکتری دەچن، لێرەدا، بەباشی دەزانم زۆر بەکورتی تەنیا بۆ چوار ڕای جیاواز (هێگل، فوێرباخ، مارکسو فرۆم) دەربارەی هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە ئاماژە بکەم، بەو هیوایەی دواتر باسی حاڵەتو ئەنجامە پسیکۆلۆژییەکانی نامۆبوونو، باسی شێوەو حاڵەتەکانی بەخۆنامۆبوونی قارەمانی چیرۆکەکانی حوسێن بکەم.

هێگڵ 1770–1831 پێیوایە نامۆبوون واتە بەخۆنامۆبوون. کاتێك مرۆڤ ناتوانێت خۆی لەو جیهانە کۆمەڵایەتییەدا ببینێتەوە کە تێیدا دەژیت، ئەوا بەخۆی نامۆ دەبێت. هێگڵ، لە (فینۆ مینۆ لۆگی ڕۆح)دا، بەخۆنامۆبوون بەساتێك، یان شێوەیەك لە بزاڤی ڕۆح دەزانێت.

پرۆسەی نامۆبوون، بەلای مارکسەوە کۆمەڵێك ئەنجامی پسیکۆلۆژی لێکەوتۆتەوە، لەوانە: کرێکار بەکارەکەی خۆی نامۆ بووە، تاکەکەس لە ئاست ئەنجامی چالاکی خۆی لە نامۆیدا دەژیت، مرۆڤ بەخۆیو بەبەهای خۆی نامۆیەو لە ئەنجامدا لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتە کێشەو ناکۆکییەوە. کاتێکیش مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا ناکۆك دەبێت، ئەوا لە هەمان کاتدا لەگەڵ مرۆڤی دیکەشدا دەکەوێتە ناکۆکیەوە [4] هەر بەم پێیە کاتێك موڵکایەتیی تایبەتی شێوەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری نامێنن، چەوسانەوەی مرۆڤیش نامێنێت بەمەیش هۆکارە بابەتییەکانی پرۆسەی نامۆبوون لەناو دەچن، چونکە خود (زات) کە لە ڕێگەی بەرهەمهێنانەوە بابەتییەتی خۆی دەسەلمێنێت، ئەوا لەم حاڵەتەدایە بابەتی بوونەکە بۆ خودە بەرهەمهێنەرەکە دەگەڕێتەوەو دەبێتە موڵکی ئەم، موڵکی کەسێکی دی.

فرۆم 1900–1980 ئەو تێزەی مارکس گەشەپێدەداتو تەنیا لە سنووری کاردا نایهێڵێتەوە، بەڵکو ناوەرۆکێکی نوێی پسیکۆلۆژی پێدەداتو، بەپەیوەندی لەگەڵ گەشەکردنی هۆشیاریی خۆیی مرۆڤو، ستروکتوورو کارەکتێری کۆمەڵایەتیو خاسییەتی کۆمەڵگای نەخۆش دیاردەکە باسدەکا.

پێشکەوتنی مرۆڤایەتی مرۆڤی بەرەو ئەوە بردووە کە هۆشیاریی خۆیی (خۆناسین)و زانیاری دەربارەی خۆیو شتەکان زیاتر بێت. بۆیە مرۆڤ تەنیا بەوە داناکەوێت کە پێداویستییە بیۆلۆژییەکانی خۆی (خواردن، خواردنەوە، سێکس) دابین بکات، بەڵکو دوای دابینکردنی ئەم پێداویستییانە مرۆڤ، وەك بەشێك لە سروشتی خۆی، و وەك ئەنجامێکی خۆناسینو هۆشیاریی خۆیی، بەدوای شتی نوێدا دەگەڕێتو پێداویستی نوێی بۆ پەیدا دەبن. ئەم پێداویستیانە، بۆ هەر کەسێك کە لەم

ئاستەی هوشیاریی و گەشەکردندا بێت، بنچینەییں و هێندەی پێداویستییە بیۆلۆژییەکان گرینگن. بۆیە پێویستە کۆمەڵگا خۆی لەگەڵ مرۆڤ، وەک ئینیدیڤید،و لەگەڵ پێداویستییەکانیدا بگونجێنێت.

پێداویستییەکانیش لەلای فرۆم ئەمانەن: ئا– دۆستایەتیی و دامەزراندنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی.

بێ– پێداویستیی مرۆڤ تا خوڵقێنەرو داهێنەرێکی چالاک بێت. پێ– پێداویستیی هەستکردن بەکۆمەڵ و ئارامی. تێ– کەسایەتی (ئیدێنتیتێت)، وەک بەرهەمی خۆناسین و هوشیاریی خۆیی مرۆڤ. جێ– خۆڕاهێنان Orientationێکی ماقوڵ و ئینتێلێکتوێلانە لەگەڵ واقیع و جیهان.[5]

هەر کۆمەڵگایەک نەتوانێ ئەم پێداویستییە نوێیانە دابین بکات، ئەوا ژیانی ڕۆحی مرۆڤ بەشێوەی جۆر بەجۆر دەشێوێنێت و تێکدەدات و مرۆڤ بەرەو بەخۆنامۆبوون دەبات، بۆیە ئەم کۆمەڵگایە، وەک فرۆم دەڵێت، کۆمەڵگایەکی نەخۆشە.

لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا مرۆڤ بەهۆی ئەو وزە کۆمەڵایەتیانەوە نامۆ دەبێت کە چارەنووسی کۆمەڵگاو مەرجەکانی ژیانی هەریەک لەوانەی تیایدا دەژین بریار دەدەن. بێپشتیوانی و بێدەسەلاتی ئێمە، لەڕووی ئەو هێزانەی حوکمڕانیان دەکەن، بەڕوونی لەکاتی کارەساتەکانی وەک دێپرێشیونی ئابووری و شەڕدا خۆیان دەردەخەن[6].

ئەم بۆچوونەی فرۆم، مەودایەکی فراوانتر بەهۆکارەکانی بەخۆنامۆبوون دەدات، چونکە دیاردەکەتەنیا لە سنووری کۆمەڵگای پیشەسازیی سەرمایەدارییدا ناهێڵێتەوە، بەڵکو لەهەمان کاتدا، بەپەیوەندی لەگەڵ ستركتووری كۆمەڵ و ڕۆڵی هێزە کۆمەڵایەتییەکان لەم پرۆسەیەدا، مەودایەکی جیهانیی پێدەدات. واتە دیاردەکە، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا بەرهەمی کۆمەڵگای سەرمایەداریی پیشەسازییە بەڵام، وەک زۆربەی دیاردەکانی دیکەی کۆمەڵی سەرمایەداری، مەودایەکی جیهانیی بەخۆگرتووە. هەر بەم پێیەش دەشێت لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی دیکە حاڵەتی تایبەتی وەربگرێت.

بەخۆنامۆبوون پرۆسەی نامۆبوون وا لە مرۆڤ دەکات کە پەیوەندیی لەگەڵ خودی خۆیدا لە دەست بدات. مرۆڤی نامۆ لە دۆخێکدا دەژیت کە (من) گۆڕدراوە بەشت Thing، مەبەست لە گۆڕانی (من) بەشت ئەوەیە کە (من) پەیوەندییەکی داهێنەرانەی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ کەسانی دی و جیهانی دەرەوەیدا نامێنێت. بەم پێیە (من) دەبێتە شتێکی پاسیڤ و جیهانی دەرەوە کاری تێدەکات، کەچی لای مرۆڤی ئاسایی (من) چالاکانە بەرخورد دەکات تا بەردەوام کار لە دەورووبەروو جیهانی دەرەوەی خۆی بکات. فرۆم دووپاتی دەکاتەوە کە گۆڕینی مرۆڤ بۆ کەلوپەل و کاڵا واتا مردنی (من) لە مرۆڤدا.. واتا مردنی هەموو هەستەکانی (من) لە مرۆڤدا، چونکە کەلوپەل یان شمەک، (من)ی نییە.

نامۆبوون، یان بەخۆ نامۆبوون تەنیا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی و ئابووری نییە، بەڵکو لە هەمان کاتدا پرۆسەیەکی پسیۆلۆژیشە، چونکە حاڵەت و شوێنەکانی نامۆبوون، وەک دیاردەیەکی سوبێکتیڤی، لای مرۆڤ دەنگدەدەنەوە.

(م. سیمان)، بەپەیوەندی لەگەڵ حاڵەتی پسیکۆلۆژی مرۆڤی تاک، پێناسەی نامۆبوون دەکات. لە تێزێکی خۆیدا دەربارەی نامۆبوون (1961) پێنج کاتێگۆریی جیاوازی نامۆبوون، وەک حاڵەتێکی سوبێکتیڤی و بەخۆنامۆبوونی مرۆڤ، باسدەکات: بێدەسەلاتی، بێمانایی، بێپێودانگیی Normlessnes، گۆشەگیری و نامۆبوون لە ئاست خۆدا[7].

ئەم کاتێگۆریانە، کە ناوەڕۆکێکی پسیکۆلۆژییان هەیە نەک سۆسیۆلۆژی، ژان و ئەندێشەی مرۆڤی نامۆو حاڵەتە پسیکۆلۆژییەکانی بەخۆنامۆبوون و پەیوەندیی مرۆڤی تاک بەکۆمەڵ و شتەکانەوە پشاندەدەن، ڕەنگە ئەمەشیان، وەک تێزەکەی فرۆم، بۆ باسەکەی ئێمە گرینگ بێت.

(2)

دەکرێت ڕەوتی چیرۆکنووسین و سەفەری حوسێن عارف بەجیهانی چیرۆکنووسیندا، بکەین بەسێ قۆناخی سەرەکییەوە:

قۆناخی یەکەم– لە کۆتایی پەنجاکانەوە تا کۆتایی شەستەکان.

قۆناخی دووەم– لە سەرەتای حەفتاکانەوە تا ناوەڕاستی حەفتاکان.

قۆناخی سێیەم– لە ساڵی 1976 بەدواوە تا ساڵای نەوەد.

دیارە ئەم دابەشکردنە زیاتر مەسەلەیەکی میتۆدۆلۆژییە، هەروا مەبەست لە بابەتی سەرەکی و لایەنی زاڵی هونەریی چیرۆکەکانە لەو قۆناخەدا.

دەنا ناتواندرێ خەتێکی دابڕ بەنێوان ئەم قۆناخانەدا بکێشرێت، بەتایبەتی لە نێوان قۆناخی دووەم و سێیەمدا، کە زیاتر لە دوو بەشی قۆناخێك دەچن، تاله دوو قۆناخی سەربەخۆ..

قۆناخی یەکەم:

(لە کۆڕی خەباتا) ناوی یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی حوسێن عارفە، کە لە ساڵی 1959دا بلاوکراوەتەوە. لێرەدا حوسێن سەرقاڵی مەسەلە ئایدیۆلۆژی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ڕۆژانە بووە. یان بەشێکی چالاک بووە لەو کەش و هەوا ئەدەبییە– سیاسییەی کە لە کۆتایی پەنجاکاندا ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی لە باشووری کوردستان و، بگرە ئەدەب و ڕۆشنبیریی عیراقی تەنیبوو.

لەو سەردەمەدا، بەهۆی ئەو ورووژانە سیاسییەی کودێتای تەمووزی 1958 لە عێراق و کوردستاندا نابوویەوە، ئەدەبی کوردی کەتبووەوە ژێر لافاوی ئەدەبی سیاسی و دروشم و هوتافانەوە، ئەدەب ئەو کاتە، لای نزیکەی تەواوی نووسەرانی کورد، ئەدەبی ناوەڕۆک بوو، یان ئامرازێ بوو، کە بۆ مەبەست و ئامانجی سیاسیی و کۆمەڵایەتی دەخرایە گەڕ. زۆربەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمە، یان ئەدەبی ڕیالیزمی فۆتۆگرافیین، کە بەچاوی کامێرا (بەڵام زۆرجار کامیرایەکی لایەنگر) وێنەی دیوی دەرەوەی گیرگرفت و ژیانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤ و ڕووداوەکانیان کێشاوە، یان ئەدەبی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و بەئایدیۆلۆژیاکردنی ئەدەبن. بۆیە هەندێك تێکستی کەمیان لێدەرچێت، لەوانە هەندێ چیرۆکی حوسێن، ئەوانی دی تێکستێکن کە زیاتر گرفتاری مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەو ڕۆژانەن و، لە هەڵوێستی سیاسیی، نەک هونەریی و مەعریفیی، نووسەرەکانیانەوە سەرچاوەیان گرتووە، یان بۆ ختووکەدانی زەوقی هوونەریی باوو مەیلی سیاسیی باو نووسراون، بۆیە زۆربەیان تێکستی کاڵ و کرچ و نرخێکی ستاتیکیی و مەعریفیی ئەوتۆیان نییە.

ئەگەرچی لەو سەردەمەداو تا کۆتایی شەستەکان، حوسێن زیاتر سەرقاڵی کاری سیاسی بووە، بەڵام سەرەتاکانی حوسێن، وەک دەنگێکی

ئەدەبیی تایبەتو بەجیا هەڵەوتوو، بەرهەمی ئەو قۆناخەن. لەم قۆناخەدا حوسێن بابەتەکانی لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە وەردەگرێت.

قارەمانی چیرۆکەکانی کەسانی ئاسایی کۆمەڵن، کە ئێمە کەمتر سەرنجمان بۆ لایان دەچێت. بەزمانێکی شەفافو سادەو بەشێوە تەکنیکێکی کلاسیکیی مۆباسانی چیرۆکەکانی دادەڕێژێت.

(چایەکی شیرین، میمکە هۆڵێ، لە ڕۆژێکی سەختدا، دوژمنەکەی مام قیتەڵو شالاوی دڵ..)، کە سەرەتای ئادگاری چیرۆکنووسانەی حوسێن دەردەخەن لەم نمونانەن.

لەکۆتایی شەستەکانەوە حوسێن دەستبەرداری کاری سیاسیی -حزبی دەبێتو بەتەواوی خۆی بۆ کاری ئەدەبیو داهێنان تەرخان دەکات. ئەو بە تێڕوانینێکی نوێ بۆ کاری هونەریو، بەوزەیەکی داهێنەرانەی نوێو بەتەکنیکێکی هونەریی تایبەتەوە دەیەوێت سەرەتایەکی نوێ بۆ خۆیو بۆ چیرۆکی کوردی دابنێت، لاموایە چیرۆکی (خوویەکی پوچ 1969) سەرەتای ئەم تەقەلا نوێیە بێت.

### قۆناخی دووەم:

لە سەرەتای حەفتاکاندا حوسێن ڕوو لە تاقیکردنەوەیەکی نوێی ئەدەبی دەکات، مەسەلەی داهێنانی تەکنیکی نوێی هونەریو نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردی، دەبنە ناوەندی بیرکردنەوەو خولیا ئەدەبیەکان، سەرەتای ئەم تەقەلا هونەرییەش، دیسان لە واقیعەوە دەستپێدەکات.

بەڵام کام واقیع؟

لەو سەردەمەدا، کارەساتەکانی شەڕی دەساڵەی باشووری کوردستان (1961– 1970) بەشێکی گەورەی بیرکردنەوەو بەرهەمەکانی حوسێن دەگرن. ئەو لە ڕێگەی کۆمەڵێك چیرۆکەوە وێنەیەکی ووردی بارودۆخی سەختی ئەو ڕۆژانەو وێنەی ژیانی مرۆڤی سادەو ئاسایی کورد، لە سایەی شەڕدا، دەکێشێت.

حوسێن دەیەوێت پێمان بڵێت کە مرۆڤ لە سایەی شەڕدا، لە بڕیارو ڕەفتارەکانیدا، ئازاد نییە. لەوەیش زیاتر تەنانەت چارەنووسی بەڕێکەوتو ڕەوتی ڕووداوەکانەو بەستراوەتەوە، هەر ئەم ڕێکەوتەیە لە چیرۆکی (نانو کەوەری خوێناوی)دا حەمەی کوڵهەڵگر، کە مرۆڤێکی ئاساییو سادەیە، بەئاگری شەڕ دەسوتێنێت، بێ ئەوەی خۆی شتێك لە هۆکارەکانی شەڕەکە تێ بگات. یان خازەو براکەی لە چیرۆکی (خازەش مرد) بەبۆردمان جوانەمەرگ دەبن. یان لە (چاڵی جەرگی پیرێژن)دا، دەیان دایك بەهەمان ڕێکەوت لە کوشتارە بەکۆمەڵەکەی ساڵی 1963ی سلێمانی جەرگسوتاو دەکرێن، هەر هەمان ڕێکەوتو تراژیدیا لە چیرۆکی (ڕووی کردەوە شاخ) (هەشت) یەکێك لە کەسانی چیرۆکەکە ناچار دەکات، بۆ خۆپاراستن لە دەستدرێژیو سووکایەتی سەربازی داگیرکەر، ڕووبکاتەوە شاخ.

حوسێن، لە نیوەی یەکەمی حەفتاکاندا، لە ڕێگەی کۆمەڵێك چیرۆکەوە ئەندێشەو تراژیدیای مرۆڤی کورد بەپەیوەندی لەگەڵ شەڕدا باسدەکات. ئەم چیرۆکانە بەشێوەیەکی چڕو تەکنیکی تایبەتی نووسراون، دەڵێی هێشتا شپرزەییو ژانی ڕۆژە سەختەکانی شەڕو بۆردمانو قڵیشانەوەیان پێوە ماوە.

تەکنیکی چیرۆکەکان نوێو جیاوازن. نووسەر خۆی لە باسکردنی وردو فرەلایەنی شتەکان بەدوور دەگرێتو، زیاتر بایەخ بەجەوهەر دەدات. بەکارهێنانی ڕستەی کورتو ڕاستەوخۆ، دوورکەوتنەوە لە وەسفی شوێنو شێوەو ڕواڵەتی کەسەکانو بەکارهێنانی دیالۆگی چڕو کورت بەرچاوترین خاسییەتی تەکنیکی ئەم چیرۆکانەن.

ئێمە لە ڕێگەی دیالۆگو مۆنۆلۆژ، جارجار بەهۆی بیرکردنەوەی کەسانی چیرۆکەکانەوە، نەك لە ڕێگەی گێڕانەوەو وەسفو وێنەکێشانەوە، ئاشنای کەسانی چیرۆکەکان دەبین، دەزانین ئەمان چ کارەن، خەڵکی شارن یالادێ، هەژارن یا دەوڵەمەند، خوێندەوارن یا نەخوێندەوار، هەر لەم ڕێگەیەوە ئاشنای خەونو خەمو ئامانجو ئاواتەکانیان دەبین.

حوسێن لەم چیرۆکانەیدا دەیەوێت بەکەمترین پەیڤ زۆرترین لایەنی کەسانی چیرۆکەکانی باس بکات، گوزەرانو هەندێك لایەنی ژیانی سایکۆلۆژیی مرۆڤەکانی سەردەمی شەڕو تێکشکانی جەستەییو ڕۆحییان دەربخات. ئەو بەپێچەوانەی هەندێك نووسەری ترەوە، لایەنی تراژیدیانەی شەڕو ئاکامە فیزیکیو ڕۆحییەکانی سەرنجی ڕاکێشاون، نەك ئەو نەبەردیانەی کە مرۆڤو پێشمەرگەکان لەسەردەمی شەڕدا بەرامبەر بەدوژمن دەینوێنن. لەو چیرۆکانەوە دەردەکەوێت کە نووسەر دەیەوێت سەرقاڵی مرۆڤو چارەنووسی مرۆڤ بێت، خەمو شادیو تراژیدیاکانی ژیانی مرۆڤی سەردەمی شەڕی مەبەستە، نەك هەڵنانی کرداری پاڵەوانانەی مرۆڤەکانی ئەو ڕۆژە سەختانە. بۆیە ئەم خۆی لە ئەدەبی بەرگریو لەو جۆرە نوسینە پاڵەوانبازییە دوور خستۆتەوە کە بەناوی ئەدەبی بەرگرییو شۆڕشگێڕییەوە هێنرانە بەرهەم.

کەسانی چیرۆکەکانی حوسێن نەعەنتەرن نە ڕۆستەم، نە تانکیشکێنو سەنگەرگرن نەئاگر خۆر، ئەوان کەسانی ئاسایی کۆمەڵن کە شەڕ بەدڕاندانەترین شێوە دەیانهاڕێت. ئەوان پێش هەر شتێك مرۆڤن، بۆیە خەمدەخۆنو دەگرین، پێدەکەنن، دەترسێن، خەوندەبینن‌و شەیدای ژیانی ئاشتیو ئارامین، بەڵام لە کاتو شوێنی خۆیدا دەشێت نەترسیش بن، سوکایەتی قبووڵ نەکەن، بۆ پاراستنی کەرامەتی خۆیان (ڕووبکەنە شاخ)، یان لەوپەڕی کەمتەرخەمییاندا بەرامبەر بەژیان کەچی لە ئاستی ستەمدا بەدەنگ بێن.

لە چیرۆکی (خوویەکی پووچ)دا ئەگەرچی قارەمانی چیرۆکەکە گاڵتەی بەژیانو بوون دێتو پێی وایە کە (مرۆڤ لە ژیاندا ئاسنی سارد دەکوتێو دوای کڵاوی بابردوو کەوتووە)[9] کەچی ئەم کەمتەرخەمیو بێباوەڕییەی بەژیان وای لێناکەن کە بەرامبەر بەسستەمو بەتەنگەوە هاتنی مرۆڤ لەکاتی تەنگانەدا کەمتەرخەمبێت، بۆیە کاتێك حەمەی شاگرد چایچی، کە (زەحمەتکێشێکی ئازارچەشتووی ئەم ژیانە نالەبارەیە) بەناڕەوا لە چایخانە بەرشەقو زللە دەدرێت، ئەم (لە ئاستی ئەم ستەمکارییەدا خۆی پێڕاناگیرێتو سەربادانی کەمتەرخەمیو زەردەخەنەی گاڵتە پێهاتنەکەی لەبیر دەچێتەوە)و پشتگیری حەمە دەکات.

ئەم قۆناخە سەرەتایەکە بۆ سەفەرێکی نوێی پڕ لە داهێنان، یان بەشێکە لە قۆناخێکی کە لە ساڵی 1976 بەدواوە دەست پێدەکات.

### قۆناخی سێیەم:

بەڕای من ئەم قۆناخەیان گرنگترینو کاریگەرترین سەردەمە لە ڕەوتی چیرۆکنووسینی حوسێن عارفدا، چونکە بابەتی چیرۆکەکانی گۆڕانێکی قوڵتریان بەسەر دادێت. حوسێن، بە ئەزموونێکی زێدەتری چیرۆکنووسینو

بیرێکی فەلسەفی ڕوونترەوە درێژە بەگەشتە سەختەکەی دەدات. ڕوو لە جیهانی ناوەوەی مرۆڤ و نامۆبوونی مرۆڤ دەکاتو سەرقاڵی لایەنی سایکۆلۆژیی و ڕۆحیی خەمە ئینسانییو فەلسەفییەکانی مرۆڤ دەبێت.

هەر بەم پێیەش تەکنیكو لایەنی هونەری چیرۆکەکان دەگۆڕدرێن. لە دیالۆگەوە بۆ مۆنۆلۆگو خەونو فلاشباكو تەوژمی هۆشو بەدوای یەکداهاتنی بیرەکان (تداعی– Assosiation)، لە باسکردنی کورتو خێرای حاڵەتو وەزعی بەرچاوی کەسەکانەوە بۆ شۆڕبوونەوە بەرەو ناخیانو دەخستنی بیرکردنەوەو خەیاڵو جیهانی ڕۆحییان. گیروگرفتە ڕۆحی فەلسەفییەکان مرۆڤی سەردەمو مەسەلەی بوونو نەبوون جێگای کارەساتەکانی شەڕو مەسەلە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان دەگرنەوە، مرۆڤ جێگای ئایدیۆلۆژیا، گومان جێگەی باوەڕ، تەنیایی جێگای تێکەڵبوونی خەڵك، خەونو ئایدیاڵی بەرز جێگای واقیع دەگرنەوە. هەر بەم پێیە مرۆڤ، بەتایبەتی مرۆڤی ڕووناکبیر، وەك تاكو ئێندیڤید، وەك بوونەوەرێکی جەنجاڵو جیهانێکی پڕ لە خەونو ئەندێشەو حەسرەتو ئاوات، دواجار وەك کەسێکی بەخۆنامۆی ناو کۆمەڵگای ستەم دەبنە بابەتی سەرەکی چیرۆکەکانی.

سەرەتای ئەم گەشتە بەردەوامە لە چیرۆکەکانی (خۆڵو بارانو پاییز، مەرگی نابینێ و سمۆرە)ەوە دەستپێدەکات، بە (گەلەگورگ)دا ڕەتدەبێتو لە (ئەندێشەی مرۆڤێك)دا دەگاتە قۆناخێکی دووتر. ئەم گەشتە نوێیە تەنیا گەشتێکی هونەریی ڕووت نییە، بەڵکو گەشتێکی مەعریفیو فەلسەفیشە، کە لە پرۆسەی خۆیداو، بەپشتبەستن بەزانینو ڕۆشنبیریو ئەزموونەکانی ژیانو چیرۆکنووسیی، گەشە دەکاتو بەرەو پێگەیشتن دەڕوات. لە پرۆسەی گەشەکردنەکەدا حوسێن پەنا بۆ چیرۆکی درێژو ڕۆمان، وەك مەیدانێکی فراوانی دەربڕین، دەبات.

قارەمانی چیرۆکی (سمۆرە– فابریوەری 1977) هیوای ئەوەیە کە (زۆرترین ژمارە لە نهێنییەکانی بوون دەرك پێبکاتو لە کارو ڕەفتارەکانیدا ئاگاداریان بێت)، [10] کەچی دوانزە ساڵێك دواتر سەبری، قارەمانی ڕۆمانی (ئەندێشەی مرۆڤێك)، بەهۆی تێڕوانینی فەلسەفییانەی بۆ ژیانو گیروگرفتی زانینو ناسینی کۆمەڵو مرۆڤەوە ئازار دەژچێژێتو دەرکپێکردنی (گرفتی نهێنییەکانی ژیانو بوونو نەبوونی لێ بۆتە ئەندێشەیەکی شێرپەنجەییو پێوەی دەتلێتەوە.) [11] ئەگەر لە قۆناخەکانی پێشوودا نووسەر زیاتر باسی مرۆڤە ئاساییەکانی کۆمەڵی کردبێت، ئەوا لەمەودوا ڕوو لە مرۆڤە هۆشیارو ڕووناکبیرو ئایدیالیستەکان دەکات، ئەوانەی لە دۆزەخی هۆشیاریدا دەژینو پرنسیپو فەلسەفەی خۆیان بۆ ژیان هەیە. قارەمانی ئەم چیرۆکانە، بەتایبەتی لە (گەلەگورگ)و (ئەندێشەی مرۆڤێك)دا بەهۆی هۆشیاریو پرنسیپو ئایدیاڵو ڕەوشتو ڕەفتاری جیاوازیانەوە، ناتوانن خۆیان لەگەڵ (مێگەل)و کۆمەڵدا بگونجێنن، بۆیە هەمیشە تەنیانو لەژانو ئەندێشەو ئازارێکی فەلسەفیو کۆمەڵایەتیدا دەژین، بەزمانێك دەدوێن کە بەکۆمەڵو سەردەم نامۆیە. ئەوان، کەشتێك بەمێگەلو ڕەوشتی باوی کۆمەڵەوە نایانبەستێتەوە، بەناچاری ڕوو لە گۆشەگیریو تەنیایی دەکەن. بەرەوناخی خۆیان دەگەڕێنەوەو بەردەوام لەگەڵ خۆیاندا دەپەیڤن.

دیالۆگی ئەوان پەیڤینێکی مەعریفیو فەلسەفیو ئەخلاقییە، دیالۆگە لەگەڵ ڕۆحێکی تەنیای پڕ لە ژانو ئەندێشەو خەونو هیوای بەرزی ئینسانی، بەکورتی ئەوان کەسانێکن هوشیار، بەڵام بەخۆیانو بەدەوروبەرو کۆمەڵ نامۆن.

(3)

دیاردەی نامۆبوونو بەخۆنامۆبوون لە چیرۆکەکانی حوسێن عارفدا، بەرهەمی باروودۆخێکی ئابووری/ کۆمەڵایەتیو سیاسیو کولتووریی کۆمەڵگای کوردستانە، کە شێوەو حاڵەتە پسیکۆلۆژییە تایبەتییەکانی خۆیان وەرگرتووە، ئەم پرۆسەیە، لە واقیعێکی کۆمەڵایەتییدا سەرهەڵدەدات کە کۆمەڵگا نەك هەر پێداویستییە ڕۆحییەکانی مرۆڤ دابین ناکات، بەڵکو لە ڕێگەی جۆرەها ستەمی کۆمەڵایەتی، سیاسیو ئایینییەوە مرۆڤەکان گەمارۆ دەداتو کەسایەتییان تێکدەشکێنێت. نەبوونی دیموکراتی، دەوڵەتی تۆتالیتێری، دۆزەخی شەڕی داسەپاوی دەوڵەتی عێراق بەسەر کوردستاندا، تیرۆرو دەسەڵاتی داگیرکەری بێگانە بەسەر کۆمەڵدا، سەرەڕای دابونەریتیی دواکەوتووانەی کۆمەڵایەتیو فشاریی خێڵەکییانە.. تێکڕای ئەم دیاردانە سترکتوورو میکانیزمی کۆمەڵگای ستەمیان لە کوردستاندا پێکهێناوە. ئەم کۆمەڵگایە، کە دەکرێت، فرۆم گوتەنی، بەکۆمەڵگای نەخۆشیش ناوبەرێت. هەموو کەرەسەو بابەتەکانی بەخۆنامۆبوونی ڕەخساندووەو، وەك کارخانەیەکی گەورەی تێکشکانو بەخۆ نامۆبوونی مرۆڤی لێهاتووە.

پرۆسەی بەخۆ نامۆبوون، لە چیرۆکەکانی حوسێندا، بەجۆرێکی سروشتییانەو، لە پرۆسەی زەمەنی خۆیدا، ڕەوتی پێگەیشتنی خۆی وەردەگرێت. سەرەتا تێگەیشتنی دیاردە نێگەیفو پرنسیپەکانی کۆمەڵ، قارەمانەکە بەرەو تەنیاییو گۆشەگیری دەبات، لەوێشەوە بەرەو حاڵەتە پسیکۆلۆژییەکانی دیکەی نامۆبوونڕاپێچی دەکات، وەك حاڵەتەکانی کەمتەرخەمی، بەدگومانی، بێدەسەڵاتی، ژانو ئەندێشەی فەلسەفیو کۆمەڵایەتی، پاسیڤبوونو بایەخنەدان بەشتەکانو دیاردەکان، کە تێکڕایان بەخۆ نامۆبوونو ئەزمەیەکی قووڵی فیکرییو کۆمەڵایەتیو ڕۆحی بۆ قارەکانەکان دروستدەکەن، بەکورتی بەخۆنامۆبوونە قارەمانەکان لە گۆشەگیرییەوە تا ڕۆخی شێتبوون دەبات، وەك دواتر باسی دەکەین.

هەڵبژاردن لە نێوان دوو جۆر گورگدا

گەلەگورگ، 1982، کەلاموایە تا ئەو کاتە درێژترین چیرۆکی بڵاوکراوەی حوسێنە، باسی مرۆڤێکی ڕووناکبیر دەکات، بارام، کە دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵییە، ئەو کەسێکە بەکۆمەڵ نامۆیە، بەڕادەیەك لە کۆمەڵو دەوروبەر بێزارە کە بڕیار دەدات، وەك تاکەکەس، خۆی لە کۆمەڵ دابڕێت، تا بەئارامیو گۆشەگیرانەو بەدوور لە (گورگە دووپێیەکان) ژیانی خۆی بەسەر بەرێت.

لە جێگایەکی دوور لە ئاوەدانی خانوویەك دروستدەکاتو، لەگەڵ ئایشێ ژنیو دوو منداڵەکەیدا گۆشەگیرانە درێژە بەژیانی خۆی دەدات. هەروا بڕیار دەدات (مەملەکەتەکە)ی بکاتە بەهەشتێکی بچکۆلانەو نەهێڵێت هیچ کام لە گورگە دووپێیەکان پێ بنێنە ناوی، تا نەهێڵێت لە ڕێگەی ئەوانەوە (میکرۆبی کوشتو بڕو دزیو درۆزنیو فرتو فێڵو زۆرو جەور لە مەملەکەتەکەیدا گەرا بکەن)[12]، چونکە بارام، وەك خۆی دەڵێت، لەتاو ئەم جۆرە کارو کردەوانەیان هەڵاتووەو بەخۆیو ماڵو منداڵییەوە گۆشەگیر بووە.

بەڵام دوای هەشت مانگێك گۆشەگیریو ژیانی دوور لە ئاوەدانی، لە چلەی زستانێکی پڕ لە زریانی چەند ڕۆژە، شەوێك گەلەگورکێکی برسی دەورەی ماڵەکەی بارام دەدەنو تەنانەت دەیانەوێت لە دەرگاو پەنجەرەو کولانەی سەربانەوە خۆیان بگەیەننە ناو ژووری ماڵەکەی.

کێشەی سەختو سامناکی بارامو ژنەکەی لەگەڵ گەلەگورکەگەدا تا دەرکەوتنی سپێدەی بەیان درێژەی دەبێت. بەڵام ئەم شەوە ئەوەندە درێژو سامناكو تۆقێنەر دەبێت، کە بارام دێنێتە سەر ئەو باوەڕەی (مەملەکەتەکە)ی بەجێبێڵێتو لە نێوان مەترسیی گورگی دووپێو گورگی چوارپێدا، بەناچاری ژیانی ناو گورگی دوو پێ هەڵبژێرێت.

لەم چیرۆکەدا حوسێن باس لە فەلسەفەی تاکەکەس دەکات وەك شێوە ڕێبازێك بۆ چارەسەری ئەزمەی نێوان مرۆڤی تاكو کۆمەڵ.

هەروا وێنەی زستانێکی سەختی پڕ لە زریانو شەوێکی سامناکی بەگەلەگورگ گەمارۆدراوو، وێنەی ترسو غایەلەی بارامو ئایش، لەڕووی شالاوی گەلەگورگدا، دەکێشێت، هێندە بەوردی وەسفی سات بەساتی حاڵەتی دەروونییو ڕەفتارەکانیان دەکاتە خوێنەر لەگەڵ ئەواندا هەست بەترسو لورەو هەڵپەی تۆقێنەری گورگەکان دەکات، لەگەڵ ئەواندا دەبیستێت کە گورگەکان لەودیوی دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکەیانەوە چۆن بەلمۆزو چرنووکیان پەلاماری دەرگاو پەنجەرە دەدەن تا بێنە ژوورەوە. کێشەی سەختو پڕ لە خۆڕاگریو ترسو ئازایەتی ئەوشەوەی بارام لەگەڵ گەلەکورگەکەدا ئاستێکی هێندە دراماتیکییانەی پێدراوە، کە کێشەو ساکاکەشیی سانتیاگۆی قارەمانی ڕۆمانی (پیرەو دەریای) ئێرنێست هێمنگوای لەگەڵ نەهەنگەکاندا، دێنێتەوە یاد.

لە دیدارێك لەگەڵ حوسێن عارفدا، گۆران مەریوانی پێیوایە کە (گەلەگورگ زێدەتر ئەساڵەتو کولتوورو هونەری ئەوروپایی گرتۆتە خۆ. بیری دنیای فلیمو-بۆ نموونە هیچکۆك-و نووسەرە ڕیالیزمە نوێکانمان دەخاتەوە. چۆن فەلسەفەی: (تاك) Individ (هاونیشتمانییەك) یاخی دەبێو چۆن مل دادەنەوێنێ یان نانەوێنێ- جاك لۆندۆن، هێمنگوای)[13].

نامۆبوونی بارام لە سنووری سەرەتای نامۆبوونێکی کۆمەڵایەتیدا دەمێنێتەوەو حاڵەتێکی پسیکۆلۆژی وەرناگرێت، چونکە بەتەنیا ناژیت، لەوێش زیاتر گۆشەگیربوونەکەی تەنیا هەشت مانگێك درێژە دەکێشێت، کە لەو ماوەیەدا بارام زیاتر خەریکی کاری فیزیکی، دروستکردنی مەملەکەتەکەی، دەبێت. فریای ئەوە ناکەوێ بچێتە خەلوەتەوە، تا بەقووڵی بییر لە مەسەلەکان بکاتەوەو، پرۆسەی نامۆبوونەکەی ڕەوتی سروشتی خۆی درێژە پێبدات. کەچی مەسەلەی نەگونجان لەگەڵ کۆمەڵو نامۆیی مرۆڤ لە ڕۆمانی (ئەندێشەی مرۆڤێك)دا مەوداو ڕەهەندێکی دوورترو قووڵتر بەخۆیان دەگرن.

ئەگەرچی ڕیشەی ئەندێشەو گیروگرفتو ژانە ڕۆحییەکانی بارامو سەبری بەهەمان زەمینەی کۆمەڵایەتیو کولتووریو فەلسەفیدا ڕۆچوون، بەڵام گۆشەگیریو تەنیایی سەبری، خۆیان دەبنە شێوەیەکی دیکەی ژانو نامۆبوون. لای سەبری مەسەلەکە لەوە دەرچووە کە بەخۆ دابڕین لە (گورگە دووپێیەکان) چارەسەر بکرێت. بەڵکو ئاستێکی دی وەرگرتووە.

لێرەدا دەکرێت باس لە دوو ئاستی بەخۆ نامۆبوون بکەین:

یەکەم- نامۆبوونێکی سەرەتایی: بارامو سەبری هەردوکیان لەگەڵ کۆمەڵو دەوروبەردا ناگونجێن. بەکۆمەڵ نامۆ دەبنو ڕوو لە گۆشەگیری دەکەنو، هەڵوێستێکی تر بەرامبەر بەژیانو کۆمەڵ وەردەگرن، چونکە هەستدەکەن ئەوان پەیوەندییەکی ئەخلاقی ڕۆحییان بەو کۆمەڵەوە نییە. (بۆچی هەموو بوونەتە جانەوەرو دێوو درنج؟ نەویژدان ماوە، نەپیاوەتیو مەردایەتی، نەڕاستگۆییو چاکەکاری. هەموو.. هەر هەموو بوونەتە گورگو ورگو ڕیخۆڵەی یەکتری هەڵدەدڕن. یەکتری پارە پارە دەکەن!

ئەمە چ ئاخر زەمانێکە! چ ڕۆژی حەشرێکە!..

ئیدی من ئەم حاڵەتە قبووڵ ناکەم.. قەت قبووڵە ناکەم! خەڵکی تر دەیکەن بابیکەن. بەڵام من نایکەم.. قەت نایکەم.. قەت نایکەم)[14].

دووەم- پێگەیشتنی نامۆبوونەکە، کە تەنیاییو گۆشەگیری ڕەهەندێکی دیکەی پێدەدات.

سەبری کەسێکە بەتەنیا دەژی، بەتەواوی بەژیانی تەنیایی ڕاهاتووەو نایەوێت تێکەڵاوی خەڵك ببێت. تەمەنی پەنجاو نۆ ساڵە هێشتا ژنی نەهێناوە. تاکە برادەرێکی نزیكو هاودەردی عیزەتەفەندی بوو، کە ئەویش بەهۆی کارەکەیەوە دەگوازرێتەوە بۆ شارێکی تر. ئیدی بەم کارە، حوسێن قارەمانەکەی دەخاتە تەنیاییەکی زیاترەوە بگرە لەوێش دوورتر دەڕوات، کاتێك سەبری وەك خانەنشین (تەقاویت) باسدەکات، ئیتر لەو پەیوەندییانەش دایدەبڕێت کە لە بواری کاردا دروستدەبن. بەمەش حوسێن وەك بیەوێت حاڵەتی تەنیاییەکی موتڵەق بۆ سەبری بڕەخسێنێت ئیدی سەبری بەتەواوی تەنیاو گۆشەگیر دەبێتو ڕووبەڕووی خۆی، تەنیا خۆی دەبێتەوە، لەگەڵ بیری خۆیداو لەگەڵ خودی خۆیدا دەکەوێتە لێکدانەوەی مەسەلەکان. شتەکانو ڕووداوەکان لەبیرو مێشکی ئەودا، زۆرجار بەدوور لە واقیعی مادیو کۆمەڵایەتییان، دێنو دەچن، گەورەو ئاڵۆز دەبنو لقو پۆپیان لێدەبنەوە. بەمەش نامۆبوونو ئەندێشەکەی زیاترو زیاتر دەبن.

لە گەلەگورگدا، نامۆبوونی بارام لە سنووری یەکەمدا دەمێنێتەوە، کەچی لە ئەندێشەی مرۆڤێکدا نامۆبوونی سەبری هەردوو شێوەکەو ڕەهەندێکی وجودییانە Existentialistو فەلسەفی وەردەگرێت. گیروگرفتەکان چوارچێوەی کۆمەڵ دەبەزێننو ڕوو لە مەسەلەکانی ژیانو ڕاستیو بوون دەکەن، بۆیە لێرەدا خۆدابڕینی فیزیکی/ کۆمەڵایەتی، لە شێوەی خۆدابڕینی بارام، کۆمەك ناکات دەبێ خۆدابڕانەکە ڕۆحیو مەعنەوی بێت.

خۆدابڕینێکی سۆفیستانە، کە لەو دیو جیهانە مادیو شتە بەرجەستەکاندا بگەڕێتو ئامێز بە هەقیقەتدا بکات. (هەستی دەکرد ئەو بە هیچ کۆلجێك دانووی لەگەڵ ئەو سەرزەمینە چەتوونە بێ مروەتەدا ناکوڵێ. لەگەڵ هیچ دەستوورو یاساو سستمێکدا ناگونجێ... خۆی دەبینێ بەخێرایی تیشك، بەقووڵایی گەردووندا هەڵفڕیوەو دوورو نزیك پەیوەندی نە بەڕەگەزێکەوە نەماوە پێی بوترێ ئادەمیزادو نە بەکۆلکە ئەستێرەیەکەوە ناوی بەزەمین ببرێ!. ئەوەی بۆ بووە ساتێکی شاگەشەگییو دەروێشانە دەتوت باوەشی بەڕاستییەکدا کردووە کە دوا ڕاستییەو ئیتر بەدیویدا، هەر ئەو کاتە ڕاستییەو سەرانسەری بوونو نەبوون لە ئامێزی خۆی دەگرێ.. ئیتر بۆ هەتا هەتایە، نەپووچبوونەوەی لەکایەدا دەمێنێو نەکەمو زیاد لێکردنی)[15].

ڕوانینە فەلسەفییەکانی سەبری بەرامبەر بوونو نەبوون تێگەیشتن لە دیاردەکانی ژیان، ناسینی سروشتی ئاژەڵئاسای مرۆڤ دەگەنە ئاستێکی

ئەوتۆ، کە خۆیان لە فەزای ژیانی تەنیایی و لە ناخراماندا دەبنە بابەت و سەرچاوەیەکی ئۆبژێکتیفی ئەندێشەو ژانەکان، بۆیە ڕەهەندێکی بێ کۆتایی و موتڵەق بەخۆیان دەگرن و ژیانی دەکەنە دۆزەخەکە سەرەتا، بێئاگایە بەرەو (زێبا)ی جەستەفرۆش دەیبات، بێ ئەوەی بەدوای سێکسدا بگەڕێت، بەڵام لەوێش هەدانادات. نیوەشەوێکی درەنگ، بێ مەبەست و بەڕاکردن ماڵی زێبا جێدێڵێت، بۆ کوێ؟ خۆیشی نازانێت بەڵام شەپۆلی بێئاگایی بەرەو گردی سەیوان و بۆ سەر گۆڕی دایك و باوکی دەبات، تا لەوێ بەپرسیار یەخەیان بگرێت، چونکە ئەمان ئەویان هێناوەتە دنیایەکی پڕ لە ژان و ئەندێشەو ستەم، کە (هاتنەکەی بەهیچ کلۆجێك پەیوەندی بەحەزو داخوازی خۆیەوە نەبووە) ئێستاش بۆتە میراتگری مێژووی ئەوان. بۆیە لەم حاڵەتەی سەبری تێیدا دەژیت، سەیر نییە کە ئەوان بەرپرسیارێکی سەرەکی ژان و ئەندێشەکانی بزانێت ئەوان تەنیا خوڵقێنەری ئەم نین، بەڵکو سیمبولی مێژوویەکن کە زەمینەی بۆ ژیانە دۆزەخاوییەکەی ئەم خۆشکردووە.. (دایە!.. بابە!.. پرسیارێکەو من هاتووم لە ئێوەی بکەم. تکایە ئێوە وەرامم بدەنەوە!.... بۆچی دەبێ شوێنێك هەبێ منی لێ بمو شوێنێکیش هەبێ بۆی بچم؟!.. تێم بگەیەنن.. بۆچی؟!

ماوەیەك لە چاوەڕوانی وەرامدا مایەوە. کە هەر چاوەڕوانی کردو وەرام نەبوو، بەبێزارییەکی تێکەڵ لە دەستەوستانییەوە، خۆی بەپشتدا خست و ڕاکشا).[16]

ئایا کوژرانی سەبری هەر لەم سات و شوێنەدا کە یەخەی دایك و باوکی (ڕابردوو- مێژوو) دەگرێت، باجی پرسیارە سامناکەکەیەتی؟ یان ڕێکەوتێکی ترە لەو ڕێکەوتنانەی کە، لە کۆمەڵگای ستەمدا، گەمەیەکی تراژیدییانە بەچارەنووسی قارەمانی چیرۆکەکانی حوسێن و بەچارەنووس و داهاتووی ئێمە دەکات؟

ئەگەر ئەو شەوە گوللەیەکی وێڵ بەم شێوە تراژیدییە کۆتایی بەژیانی سەبری نەهێنایە (کە کوژرانی شێتەکانی شارمان لە شەوانی منع التجولدا بیر دەخاتەوە)، ئەوا سەبری بەو هەموو ژان و ئەندێشە فەلسەفییانەیەوە، بەو تەنیایی و نامۆبوونە قووڵەی بەژیان و کۆمەڵ و سەردەم، دەبوو یان بەرەو شێتبوون بڕوات یان بە خۆکوشتن سنوورێك بۆ ئەو هەموو ئەندێشەو پووتی و گاڵتەجاڕیەی ژیان دابنێت.

قارەمانی چیرۆکەکانی حوسێن کەسایەتی تایبەتیی خۆیان هەیە. ئەوان وەك تاکەکەس گەشە دەکەن. ژیانی ناوەوەیان و ژیانی دەرەوەیان کار لە یەکتری دەکەن و، پێکەوە بەرەو پێش دەچن تا بەلانسێك لە کەسایەتیی قارەمانەکاندا دروست بکەن.

قارەمانەکان لە کۆمەڵگایەکدا دەژین کە مرۆڤ، وەك تاکەکەس (ئیندیڤید)، لاوازو بێ دەسەڵاتە.

نەیاسا نەکۆمەڵ، ئازادی و مافە بنچینەییەکانی مرۆڤیان دابین نەکردووە. مرۆڤ بەدەیان بەندو برگەی یاسایی و جۆرەها داب و نەریتی کۆمەڵایەتی پابەندو کۆنترۆڵکراوە، کە تێکڕایان شێوەی دەسەڵاتێکی مادی و ئەخلاقی وەردەگرن و ئازادی و خەونەکانی مرۆڤ، وەك تاکەکەس، دادەپڵۆسن، فشارێکی توندی مادی و مەعنەوی دەخەنە سەر قارەمانەکان و دەیانەوێ جڵەوو دەستەمۆیان بکەن، یان بەجۆرێك تێکیان بشکێنن کە بیانکەنە بەشێك لە پەراوێزی ڕەوت و میکانیزمی خۆیان، ئەم دەسەڵاتە بێ بەزەییە، کە شێوەیەکی هەرەمی وەرگرتووە، بناغە چەسپاوەکەی لە چوار دیواری ماڵ و خێزانی پاتریارکیەوە بەرەو تیرەو خێڵ و کۆمەڵ دەکشێت تالە لووتکەدا بەدەسەڵاتە هەرە ستەمکارانەی دەوڵەت دەگات ئیتر دەوڵەت بەهەموو دەزگاکانی تۆقاندن و سیستەمی کۆنترۆڵیەوە تەنیا ئامرازێکی سەرکوتکردن و تێکشکاندنی کەسەکانی کۆمەڵ نییە، بەڵکو پاسەوانی ئەم هەرەمەو بەرهەمهێنەرەوەی ئەو داب و نەریت و کولتوورەیە کە ئەمی داهێناوە بەواتایەکی دی ئەم دەسەڵاتە سیاسییە فۆڕمی ئاسایی ئەو ناوەڕۆك و ستروکتورەیە کە خێزان و کۆمەڵ، بەداب و ڕەوشت و فۆلکۆرو ئایینەکەیانەوە، پێك دێنن. هەردووکیان بۆ یەکتری پێویستن چونکە تەواوکەری یەکترین. بەردەوامبوونی هەردووکیان لەسەر حیسابی ئازادی تاکەکەس و، زۆرجار بەهاڕینی فیزیکی و ڕۆحیی تاکە کەسەکان، بەڕێوە دەچێ.

گەلێك لە قارەمانی چیرۆکەکانی حوسێن تەنیا بەرهەمی ئەو کۆمەڵە نین، بەڵکو قوربانییەکانی دەستی کۆمەڵەکەشن کە دەکرێ بەکۆمەڵی ستەم یان فرۆم گوتەنی، بەکۆمەڵێکی نەخۆش ناوب برێت. چونکە ئەم کۆمەڵە، بەپرنسیپە کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتوورییەکانیەوە بۆ بەردەوامبوونی خۆی بۆ هاڕینی مرۆڤ وەك تاکە کەس جۆرە سیستەمێکی کۆنترۆڵی تایبەتی داهێناوە کە، بەئامرازو کەرەسە جۆر بەجۆرەکانیەوە، مانەوەو بەردەوامبوونی مسۆگەر دەکەن. ئەگەر ئامرازەکان جۆرەها شێوەی دەسەڵات بن (دەسەڵاتی باوك بەسەر کچ و کوڕدا، برا بەسەر خوشکدا، مێرد بەسەر ژندا، کۆمەڵ بەسەر خێزندا، پۆلیس و جاسووس و عەسکەر بەسەر کۆمەڵدا، دەوڵەتی دیکتاتۆری و تۆتالیتێری بەسەر هەمواندا) ئەوا سووتەمەنییەکە تەنیایەکە ئەویش مرۆڤە وەك تاکە کەس.

نووسەر دەیەوێت باسی ئەم دیاردەیە بکات، یان زۆربەی قارەمانی چیرۆکەکانی قوربانیی ئەم دیاردەیەن، بۆیە هەموان بەگشتی، وەك کەسانی بەخۆنامۆ، بێدەسەڵاتن و لە دیاریکردنی ئایندەی تاکەکەسی خۆیاندا ڕۆڵێکیان نییە. هەندێ جار دەڵێی کەسانی فەتالیستن و چارەنووسی خۆیان بەقەدەر سپاردووە، چونکە هەست دەکەن کە چارەنووسیان لەناو دەستی هێزێکی سامناك و بێ بەزەیی دایە. هەر بۆیە ئەوان گەشبین نین.

گەشبینی لە بارودۆخی ئەواندا لە ساویلکەیی و دەبەنگی بەدەر نییە. ئەو هێزەی چارەنووسی ئەمان دیاری دەکات هێزێکی میتافیزیکی غەیبی نییە، بەڵکو کۆمەڵ و کەس و هێزو دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵن، کە هێندەی هێزێکی غەیبی لە هۆشیاری و ژیانی ڕۆژانەی قارەمانی چیرۆکەکاندا بوون و کاریگەری خۆمان هەیە.

بەڕادەیەك خۆیان بەخودانی چارەنووسی مرۆڤەکان دەزانن کە هەر دەڵێی ئەمان، لە جێگەی خودا، خوڵقێنەرو سەرداری ژیان و چارەنووس و داهاتووی ئەوانن، بۆیە کەمترین سەرپێچی لە فرمانەکانیان، بەسزایەکی دۆزەخ ئاسا، تێکشکاندنی جۆر بەجۆری فیزیکی و ڕۆحی مرۆڤەکان، تەواو دەبێت. مەترسی ئەم هێزە لەوەیش زیاترە، چونکە تەنانەت بەبێ سەرپێچیکردنیش زەبری ستەمکارانەی خۆی دەوەشێنێت و تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێنێت.

خازە، مارفی کوڵهەڵگر، جەرگەکەی پیرێژن، نووری و سەبری هەموویان چارەنووسیان لەبەردەم هێزە سامناکەکەی کۆمەڵدا، وەك چارەنووسی نەمامێکی ساوایە لەبەردەم زریان و تۆفاندا. ئەوان لە دۆزەخی شەڕدا دەکوژرێن، بێ ئەوەی هیچکامیان، وەك تاکەکەس، پەیوەندییان بەشەڕەکەوە هەبێت. ئەم هێزە سامناکە ڕێگەی ئەڤین، کە سادەترین مافی مرۆڤە،

لـە گوڵچـین دەگرێـت، چونکـە پاراسـتنی نـەریتو (شـەرەفی) مـێردە پـیرە داوێنپیسەکەی، خاڵە عەول، ئەوە دەخوازێت کە گوڵچینی تەمەن بیست ساڵان تێکبشکێندرێت. کەچی خاڵە عەول، وەك سیمبولی کۆمەڵی باوکسالارو نوێنەری شێوە دەسـەڵاتێکی کۆمـەڵی سـتەم، هـەموو جـۆرە تـاوانێکی بـۆ دەچێتـە سـەر. گوڵچین دەربارەی مێردەکەی دەڵێت:

(ئەو خاڵە عەولە خوانەناسەت، من هێشتا منداڵ بووم، دەسـتی لەگـەڵ دایکمدا تێکەڵ کرد. بـاوکم هـی ئـەوە نـەبوو وا زوو بمـرێ. لـە هـەرەتی گـەنجیدا بـوو. دایکـمو ئـەو خاڵـە عەولـە کوشـتیان. دوای دەس تێکەڵاوکردنەکەیان بەدوو ساڵ کوشتیان.)[17] هەر هەمان دەسەڵاتە کە لە نوێنەرو نمونەکەی خۆیدا، (دەروێش)ی تەمەن سەروو چڵو پێنج ساڵی، خۆی دەردەخات کاتێك مریەمی تەمەن یانزە ساڵان لە باوکی دەکرێت تا نەخۆشانە زەوتو ئەتکی بکات.[18] یان لەوەیش زیاتر زێبای میهرەبان، بەناچاری، بەرەو دۆزەخی جەستەفرۆشی رادەپێچەکات.

زەوتکردنو ئەتککردنی مریەم دەستدرێژیی تاکە کەسێك نییە بۆ سەر کەسێکی دیکە، بەڵکو دەستدرێژیی کۆمەڵە بۆ سەر ژنو بۆ سەر مرۆڤی تاکەکەس، کە مریـەم سیمبولو نوێنەرەکەیـەتی. کۆمەڵێك کە لـە سایەی دەسەڵاتەکەیداو، بەپشتئەستوور بوون بەرەوتو نەریتو ئایینو کولتوورە باوەکەی ڕێگە بەو تاوانە دەداتو، وەك دیاردەیەکی ئاسایی لە جەستەی خۆیدا جێگای دەکاتەوە. کاتێکیش حاجی مەحموودی عەلافو گەلاوێژی کچی هەوڵدەدەن مریەمی سیمبولی پاکیو بێ تاوانی بپارێزن، ئـەوا ئـەوان لـە جیـاتی تاوانبـارە ڕاسـتەقینەکە، ڕووبـەڕووی هەرەشـەی سـزادانی (یاسـایی) دەبنـەوە. بۆنـا؟ مەگـەر یاسـاکانی کۆمـەڵی سـتەم بۆچـی داتاشـراون؟ لێرەشـیدا تـەنیا ڕێکەوتـە کـە مریـەم لـە سـتەمی کۆمـەڵ دەپـارێزرێتو ئـەمیش بـەدەردی زێبـا نـاچێت. واتـا کۆمـەڵ، ئـەو ئامادەگییەی تێدایە کە بەجۆرێکی سروشتی مریەم بەرەو جەستەفرۆشی ڕاپێچ بکاتو لە کۆشی خۆیدا جێگای بکاتەوە، بەڵام بەڕێکەوت خـاڵی گەلاوێژ، وەك کەسێك کە بۆ گۆڕینی دەسەڵاتو کۆمەڵ خـەبات دەکـات، داڵـدەی مریـەم دەدات وەك کچـی دەیپـارێزێت. بـەم کارەیشـی ئازایانـە سەرپێچی نەریتی باوو شەرعو یاسا دەکات.

تراژیدیـای مریـەمو گوڵچینو زێبـاو ئـەوانی تـر تـەنیا گـیروگرفتی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو لە ڕەوتی چیرۆکەکانی حوسێن دا، وەك بەشێك لە سـتروکتووری کۆمـەڵگای سـتەمو وەك بەرهـەمو شـێوەی بـەردەوامبوونی دەسەڵاتەکە خۆیان دەردەخەن.

قارەمـانی چیرۆکـەکانی حوسـێن، وەك گـوتم، کەسـانی گەشـبین نـین. لەوەیش زیاتر دەکرێت بگوترێت کەسانێکی کەمتەرخەمو بـەدگومانن و بێباکانە بۆ ژیان دەڕوانن. (دیارە جگە لە هـەندێ قارەمانی ڕۆمانی شار، کە ئەمەیش زیاتر پەیوەندی بە شێوە ڕۆمانەکەوە هەیە، وەك ڕۆمانێکی مێژوویی- کۆمەڵایەتی کە باس لە سەردەمێکی مێژوویی شاری سلێمانی دەکاتو، ئەم جۆرە ڕۆمانانە ریالیستانە ڕووداوەکان بە جۆرێکی هونەری تۆمار دەکەن). ئەمان لەتوانایاندا نییە شێوە ژیـانی خۆیـان بگـۆڕن، بـۆ داکۆکی لە هەندێك مافی سروشتیی خۆیان کەمترین هەوڵێك نادەن.

لێرەدا باس لە مافی ئازادی بیرورا دەربڕینو خۆپیشاندان ناکەم، بەڵکو بۆ نمونە باسی مافێکی دیکەی زەوتکراو دەکەم، ئەویش خۆرەتاوی بەیانییانە.

سەبری لەمنداڵییەوە بەو تیشکی هەتاوە ڕاهاتووە کە بەیانییان لەپەنجەرەوە دێتە ناو ژوورو تەختە خەوەکەیـەوە. ئەمـەش گـەورەترینو ڕەنگـە تاکـە شتێك بێت کە لە ژیاندا دڵشادی بکات. کـەچی کـاتێك دراوسـێیە نوێیەکەی، کەریمە کۆم، دیوارێك هەڵدەچنێتو ئـەم ڕووناکییـە پـیرۆزە لەسـەبری زەوتدەکات، ئـەم هیـچ پرۆتێسـتێك ناکـات، هـەر چـەندە پێیوایـە کـە (ئەمـە زۆرو جـەورە) لێـی دەکرێت، تەنانەت مەسەلەکەش لەگەڵ کەریم باسناکات. بەڵام بۆ باسی بکـات! کاتێك ئەم پێشوەخت دەزانێت کە باسکردنەکەی، وەك هەموو شتەکانی دیکە، بێسوودو بێمانایە.

خاسییەتی بێباکییو پاسیڤی قارەمانەکانی حوسێن ڕواڵەتێکی بەخۆ نـامۆبوونی ئـەوانن، واتـا پـەیوەندییان بەسرووشـتو خاسـییەتی تاکـە کەسییانەوە نییە.

ئەمان لەبواری کۆمەڵایەتیو سیاسیشدا هەر پاسیڤن، واتا نە بەشێکن لەو هێزانەی کە بۆ گۆڕینی کۆمەڵ هـەوڵ دەدەن، نـە لەسایەی ئـەو وزەو هێزە کۆمەڵایەتییانەدا کە، فرۆم گوتـەنیی، چارەنووسـی مرۆڤـەکان دیـاری دەدەن، شـوێنێکیان پێـبڕاوە. کۆمـەڵی سـتەم، کۆمـەڵی خاڵـە عـەولو دەروێشو خولەی جاسووسو هیتر، ئەسڵەن پێویستی بەم جۆرە کەسانە نییە، بۆیە کەنارنشینیان دەکات. میکانیزمو سترکتووری کۆمەڵەکە، بـۆ بـەردەوامبوونی خـۆی، کەسـانی دی دەدۆزێتـەوە تـا پشـتیان پـێ ببەستێتو، وەك کەسانی هەمەکارە بیان کات بەسیمبولو دیکۆری خۆی.

پێتێر ئێل بێرێر Peter L Berger لای وایە هەر ستروکتوورێکی کۆمەڵایەتی جۆرە کەسانێك هەڵدەبژێرێت کە بۆ بـەڕێوە چوونی خۆی پێویستییەتی، جۆرە کەسـانێکیش، بەشـێوەیەك لەشـێوەکان، تـووڕ دەدات کـە لـەناویدا ناگونجێن. ئەگەر ئەو جۆرە کەسە گونجاوو لەبارانەیش نەبن ئەوا پێویستە بـــەجۆرێ بهێنـدرێنـــە بەرهـــەم کـــە لەگـــەڵ مواســـەفاتە Specifikationبەرجەستەکاندا تـەباو گونجاوبن. بۆیـە ئـەو پێیوایـە ڕاسـت نییە بگوترێت کە هـەر کۆمەڵگایەك ئـەو جـۆرە کەسـانەی پێدەبرێـت کـە شایەنییەتی، بەڵکو هەر کۆمەڵگایەك ئەو جۆرە کەسانە دێنێتە بەرهەم کە پێویستییەتی.[19]

لـەو کۆمەڵگایـەدا سـەبریو بارامو گوڵچینو مریـەمو زێبـاو ئەختـەر.. هەمەکارەنینو بڕیار نادەن، ئەمانە کۆمەڵی ستەم یان تێکی شکاندوونو یـان لەپـەراوێزی خۆیدا فڕێیداون، چونکە پێویستی بـەجۆرە کەسـانێکی دیکـەی وەك دەروێشو زاهیرو خولـەی جاسـووسو، کەسـانی پیـاو کـوژ هەیە تا ستروکتووری خۆی بپارێزێت.

بـەڕای من پاسیڤی قارەمانـەکانی حوسێن، بەرهـەمی سـتروکتوورێکی کۆمەڵایەتیی بەرجەستەنو دەبێت لەچوارچێوەی ئەم ستروکتوورەدا سەیر بکرێـن. ئـەمان هـەر چـەند پاسـیڤن بـەڵام وەك کەسـانی بـەخۆ نـامۆ، نێگـەتیڤو شـەڕخواز نـین، بۆیـە سـەرەڕای پاسـیڤییان، دەکرێـت وەك قارەمانی نموونەیی سەیر بکرێن.

ئەمان، لەگەڵ ئەو هەموو ستەمەی لەکۆمەڵدا ڕووبەڕوویان دەبێتـەوە، لەگـەڵ ئـەو دەردەسـەرییو ئـازارەی بەدەسـت (گورگـە دووپێیـەکان)ەوە دەیچێـژن، هێشـتا ماهییـەتی ئینسـانیی خۆیـان بەتـەواوی پاراسـتووە. بـێزاریو ڕقبوونـەوەیان لەکۆمـەڵو نەریتـەکانیو هەڵپـەی ئاژەڵئاسـای مـــرۆڤ، لای ئـەمان نابنـە قـینو ڕقبوونـەوە لـەمرۆڤ، وەك بوونـەوەرێکی کۆمەڵایەتی. بەڵکو ئەمان کەسانی دڵپـاکنو لـەژیانی ڕۆژانـەیاندا ئینسـانییانەو

جوامێرانە ڕەفتار دەکەن، لەسات و شوێنی پێویستدا بە تەنگ مرۆڤ و ژانەکانییەوە دێن و هەوڵدەدەن کۆمەکیان پێبکەن، (ڕەفتاری سەبری– ئەندێشەی مرۆڤێك– بەرامبەر نووری و کۆمەك پێکردنی تا خانووەکەی دروست بکات. دوای کوژانی نووری بەگوللەی وێڵ، سەبری زیاتر یارمەتی ژن و منداڵەکانی نووری دەدات. بێ ئەوەی هیچ مەبەستێکی تایبەتی هەبێت).

قارەمانی چیرۆکەکانی حوسێن کەسانێك نین بەهۆی تێکشکانی شەخسی و کۆمەڵایەتییانەوە تووشی دابڕان و ئاڵۆزی دەروونی هاتبن، یان تێشکانی شەخسییان بەرەو شەڕخوازی و دڵڕەقی و تۆڵە ستاندنەوە قینبوونەوە لەمرۆڤی بردبن. ئەوان کەسانێکی بەخۆ نامۆن، بەڵام هۆشیارن و دیدێکی فەلسەفییان بۆ کۆمەڵ و ژیان و مرۆڤ هەیە، کە لە ئەنجامی ئەزموون و هوشیارییانەوە یان هەندێك جار بەهۆی تێڕوانینی (کامۆ)یانەیانەوە بۆ ژیان لایان دروستبووە. بەڵام ئەمان بەگشتی کەسانی پۆزێتیڤن. من، لەچوارچێوەی ستروکتووری کۆمەڵی ستەمدا، بەکەسانی نموونەیی کۆمەڵیان دەزانم، کە بەهۆیانەوە ژیان جوانی و مانای خۆی دەپارێزێت. ئەمانە شێوەیەکی نوێی قارەمانی نموونەیین لەچیرۆکدا، کە بەتەواوی جیاوازن لەو قارەمانە نموونەییە سواوانەی کە چەمکی ئەدەبی بەرگی مولتەزیم بانگێشتەی بۆ دەکات و، لەسەر بنچینەی بۆچوونێکی پێشوەختی ئایدیۆلۆژی– سیاسی، کەسانی ڕۆبۆتئاسا بەجۆرێك دادەتاشرێن کە دەبێت لەسەختترین ساتەکانی ژیاندا نمونەیی گوایا خۆڕاگری و نەبەزین و گەشبینی بن.

حوسێن دەیەوێ چەمکێکی نوێ و پێناسەیەکی نوێ بۆ قارەمانی پۆزەتیڤ و مرۆڤی نموونەیی، لە ئەدەبی کوردیدا، دابنێت. ئەم کەسایەتییە نموونەییە ئینسانییە، لەڕێگەی کاری پاڵەوانبازی و سەرکردایەتیکردنی مانگرتن و ڕاپەڕینەوە، یان لە ئەنجامی کاری چەکداریو ڕەبییە گرتنەوە، جوامێریی و کارو توانای پۆزەتیڤانە خۆی دەرناخات بەڵکو ئەم بە هۆی ناسینی مۆرڤ و کۆمەڵ و، لەڕێگەی دەرککردنی فەلسەفییانەی مانای ژیان و بوونەوە، هەڵوێست و شێوەی ژیان و مۆراڵ و ئامانجی خۆی دیاریدەکات، تا سەر ڕاستگۆیانە لەگەڵ خۆی و بیرۆ بۆچوونەکانیدا دەمێنێتەوە. نامۆبوون و خۆدابڕانی تاسەری ئەم قارەمانانە لەو داب و نەریت و ڕەوشتانەی کە مرۆڤە گورگەکان پرنسیپ و دەستوورەکانی دادەڕێژن، بەشێکە لەکەسایەتی و باوەڕو ئایدیالی ئەمان. خودی بەخۆنامۆبوون، لەبارودۆخی ئەماندا، وەك خاسییەتێکی سەرەکی قارەمانەکان، دەبێتە مەناعەیەکی دیکەو ئەمان لە ئیغرائەتەکانی سامان و دەسەڵات دەپارێزێت. هەموو ئەو شتانەی کەسانی تۆ هەڵپەی بۆ دەکەن و لەپێناویدا باوەڕو ویژدان و شەرەف و ئینسانییەتی خۆیان دەفرۆشن، لای قارەمانی چیرۆکەکانی حوسێن شتی کەمبایەخن، ناتوانن بیانگۆڕن، یان وایان لێبکەن خوو بەدەوروبەرەوە بگرن و لەگەڵ عەقڵ و ڕەوشتی باوو کۆمەڵی ستەمدا بیانگونجێن.

قارەمانی ئەم چیرۆکانە تا سەر لەگەڵ خۆیان و بیروبۆچوونەکانیاندا ڕاستگۆ دەمێننەوەو ئەمەیش، خۆی لەخۆیدا، کارێکی قارەمانانەو نموونەییە.

(–ژیان.. تەنیا ژیان، هاوڕێم قارەمانەتییە. بەڵێ ژیان قارەمانەتییە، بەڵام بەبێ هاتوهاوار. قارەمانەتییەکی بچووکە ڕۆژانە مرۆڤ بەکردەوە پیادەی دەکات تا ڕاستگۆو شەرافەتمەند بمێنێتەوە).[20]

جیهانی هەندێك لەو چیرۆکانەی حوسێن عارف و بایەخدانی بەلایەنی پسیکۆلۆژی و دیوی ناوەوەی قارەمانەکانی، لەجیهانی دۆستۆیڤسکییەوە نزیکە بەتایبەتی ئەو لایەنانەی دۆستۆیڤسکی کە بەڕیالیزمی پسیکۆلۆژی ناو دەبرێت. بەڵام قارەمانی ئەم چیرۆکانە، پێش هەر شتێك، بەرهەمی کۆمەڵی کوردەوارین و دەشێت ڕۆژانە تووشیان بین، لەوەیش زیاتر هەندێکیان تەنانەت ڕەنگە لە هەندێ ڕووەوە لە تۆ یان لەمن یان لەخودی حوسێن بچن.

خەم و ئاواتی هیواو ژانەکانیان لەواقیعی کۆمەڵایەتیی و کولتووریی و سیاسیی کوردەوارییەوە هاتوون. بیرو تێڕوانین و ئەندێشەیان، ئەگەرچی زۆرجار مەودایەکی فەلسەفی و جیهانییان هەیە، بەڵام هەندێکیان وەك بەشێك لەکەسایەتیی هۆشیارانەو ڕۆشنبیرانەی قارەمانەکان دەردەکەون، هەندێکیشیان بە پەیوەندی لەگەڵ خودی ژیان و گەشەکردنی تێڕوانینی قارەمانەکان و، ڕووداوەکانی کۆمەڵ و ڕەفتارو هەڵپەی مرۆڤەکانی دەوروبەردا سەرهەڵدەدەن. ئیتر بەرە بەرە پێدەگەن، تا وەك یەقینێکی ڕەها، بەڕادەیەك لەلای قارەمانەکان دەچەسپێن، کە دەبنە بەشێك لە کەسایەتی و پێکهاتی شەخسی و فیکری و کۆمەڵایەتییان. کەسەکان لەگەڵ بیرکردنەوەو بۆچوون و قەناعەتەکانیاندا تەباو گونجاون، ناکۆکییەك لەنێوان بیرکردنەوەو ڕەفتارو ئامانجیاندا... لەنێوان پەیڤین و کردەوەیاندا نابیندرێت.

تێڕوانینی سەبری بەرامبەر بە زێبا کە بە ناچاری جەستەی خۆی دەفرۆشێت. لەبیرو بۆچوون و کەسایەتیی مرۆڤدۆستانەی سەبری و جیاوازیی ئەم لە کۆمەڵ بەدوور نییە. بۆیە سەبری، بەپێچەوانەی نەریت و تێڕوانینی کۆمەڵەوە، بەڵکو تێیدەگات و هەست بەئازارەکانی دەکات. بە قوربانییەکی دیکەی کۆمەڵ و مرۆڤە گورگەکانی دەزانێت. لەوەیش زیاتر سەبری، لەگەرمەی تلانەوەیدا بەدەست خەم و ژان و ئەندێشەکانییەوە، تەنیا زێبا بەو مرۆڤە شایستەو ڕاستەقینەیە دەزانێت کە تێی بگات. بۆیە لەحاڵەتێکی پڕ لە ئازاری ڕۆحی و لاوازیی ئینسانیانەی خۆیدا، هانای بۆ دەبات و، لەباوەشی پڕ سۆزو میهرەبانیدا، وەك منداڵێکی دڵشکاوو چاو بەگریان، دڵ و دەروونی خۆی دەکاتەوە. ئەم ڕەفتارەی سەبری، کە لە هەست بەنزیکی ڕۆحی و هاودەردی لەگەڵ زێبای ستەملێکراو بەدوور نییە، هەڵوێست و ڕەفتاری ڕاسکۆلینکۆڤ، قارەمانی ڕۆمانی تاوان و سزای دۆستۆیڤسکی، دێنێتەوە بیرمان، کاتێك ئەویش، لەگەرمەی ئازاری ڕۆحی و لاوازی ئینسانیانەیدا هانا بۆ سۆنیا دەبات، کەستەمی کۆمەڵ بەرەو جەستەفرۆشیی بردووە. لای ئەو ڕازەکانی دڵی خۆی هەڵدەڕێژێت، و بەکەسێکی پیرۆزی دادەنێت، لەڕوانگەیەکی ئایینییەوە ژانەکانی سۆنیا، وەك ژانەکانی مەسیح، بەژانی مرۆڤایەتی دەزانێت و، لە ڕوویاندا کڕنۆشدەبات.

سەبری، وەك کەسێکی بەخۆنامۆ لەدۆزەخی گومان لەکەسانی دەوروبەردا دەژی، هەستدەکات ئەمان بەردەوام خەریکن پیلانی بۆ ڕێکدەخەن و دەیانەوێت ئازاری بدەن. ئەو بۆچوون و بەدگومانییەی لای دروستبوون، کە بەشێکیان ئەساسیان نییە، خستوویانەتە حاڵەتێکی پڕ لە نیگەرانی و پەشێویی ئەوتۆوە کە لە هەندێ ڕواڵەتدا حاڵەتی پەشێوی قارەمانەکانی کافکا لە جیهانێکدا دەژین کە پێشوەخت تاوانبار کراون.. بەڵام بۆچی و لەسەرچی؟ هیچ مەسەلەیەکی کۆنکرێتی لە ئارادا نییە. ئەم

قارەمانانەو، تەنانەت جیهانی چیرۆکەکانی کافکا بەرهەمی فیکرێکن کە مەرج نییە پەیوەندییان بەواقیعێکی کۆنکرێتییەوە هەبێت. کەچی سەبری بەرهەمی واقیعێکی کۆنکرێتییەو باجی هۆشیاریی و هەڵوێستی فەلسەفیی و کۆمەڵایەتیی خۆی دەدات. زۆربەی ئەو پیلانانەی لێیدەکرێن دیارو کۆنکرێتین. بەشێکیان بەهۆی ڕەفتارو هەڵوێستی بەمێگەڵ نامۆی خۆیەوە دوچاری دێن.

بەشێکیشیان تەنیا بوونێکی سوبێکتیڤانەیان هەیەو ئەنجامی گومان و گۆشەگیریی و بێباوەڕی خودی سەبری بەکۆمەڵ و دەوروبەر، کەوای لێدەکەن، وەك قارەمانەکانی چیرۆکەکانی کافکا لە دۆزەخی پەشێویی و ڕاڕاییو ئەندێشەو ترسێکی شاردراوەدا بسوتێت.

(4)

تەقەلای داهێنان لای حوسێن، چەند هەوڵدانە بۆ باسکردنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتیی و ڕۆحییەکانی مرۆڤ و نامۆیی و تەنیایی و ئەندێشەی مرۆڤ لە کۆمەڵگای ستەم و زەبرو زەنگدا، هێندەش هەوڵدانە بۆ داهێنانی تەکنیکی نوێی چیرۆکنووسین و ڕوونکردنەوەو موغامەرەی نوێی هونەری.

ئەو بابەتانەی حوسێن لە چیرۆکەکانیدا باسیان دەکات هەر دەڵێی خۆیان لە پرۆسەی پێگەیشتنیاندا فۆرمێکی هونەری تایبەت بەخۆیان داهێناوە، کە فۆرمە هونەرییەکە، بەنۆرەی خۆی، ناوەرۆکی فۆرم، یان ناوەڕۆکی خۆی داهێناوەتەوە.

بابەتی چیرۆك و ڕۆمانەکان بەجۆرێکی گونجاو و هاوئاهەنگ لایەنی هونەریی و تەکنیکی خۆیان وەرگرتووە. تەکنیکی ڕۆمانی شار، وەك ڕۆمانێکی کۆمەڵایەتیی و مێژوویی، کە باس لە سەردەمی پەنجاکانی شاری سلێمانی دەکات، شێوەیەکی ڕیالیستی و کلاسیکی بەخۆگرتووە.

ڕووداوەکان زیاتر لە شێوەی سەردێکی ئاسایی ڕۆماننووسیداو، بەپێی زەمەن سروشتیی خۆیان باسدەکرێن. لێرەدا زەمەنە ڕۆژانە، لە پرۆسەی تێپەڕبوونیدا، هەواڵ و ڕووداوی نوێ دێنێت، کە ئەم هەواڵ و ڕوداوانەیش لای خۆیانەوە کار لە کەسانی چیرۆکەکان دەکەن و، بەجۆرێکی ئاسایی و سروشتیی بیرکردنەوەو هەڵوێستیان دەگۆڕن.

کەچی بابەتی سەفەرێکی ئەفسوناوی گەلەگورگ و ئەندێشەی مرۆڤێك، سەرجەم جیاوازن. لێرەدا مەسەلەکە، باسکردنێکی هونەریی مێژووی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی شارێك نییە، بەڵکو باس لە دیوی ناوەوەی مرۆڤ و بیروبۆچوونی فەلسەفیی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤە، کە لە چوارچێوەی سیستمێکی کۆمەڵایەتیی و کولتووریدا، هوشیارانە لە دیاردەو شتەکان ورد دەبێتەوەو کاردانەوەی سایکۆلۆژیی و تاکەکەسیی خۆی بەرامبەریان دەردەخات. بۆیە تەکنیکی ئەم بەرهەمانە جیاوازن و، شێوەیەکی مۆدێرنیان هەیە.

لێرەدا ئیتر ناکرێت لە ڕێگەی سەردو وەسفی دەرەوەو دیالۆگەوە مەسەلە ئاڵۆزەکانی ناوەوەی مرۆڤ باسبکرێن. ئەم مەسەلانە پێویستییان بەگەڕانەوە بۆ ناخ و مۆنۆلۆژو بەدوای یەکداهاتنی خێرای بیرو یادەکان و تەوژمی هۆش و شتی تر هەیە. هەروا زمانی ئاسایی ناتوانێت ئەم شتانە بەتەواوی ڕوون بکاتەوە، بۆیە پێویستی بەزمانی شەفاف و شاعیرانە هەیە. حوسێن لەم چیرۆکانەیدا وشەکانی بەدیقەت هەڵبژاردووە، بەدوای یەکداهاتنی وشەکان مۆسیقایەکی ناوخۆی هێمنیان داوە بەڕستەکان.

بەمەیش بیرکردنەوەو مۆنۆلۆژو خەیاڵی، بۆ نموونە سەبری، بەشێوەیەکی خۆڕسکی و سروشتی دەردەکەون و هارمۆنیی بەدیوی دەرەوەو ناوەوەی سەبری دەدەن حوسێن لەم دوو شاکارەو لە چیرۆکی سەفەرێکی ئەفسووناویدا، کەلەلام وایە داهێنەرانەترین کاری نووسەرن، پەنا بۆ یەك شێوە تەکنیك دەبات کە شێوە تەکنیکی باسکردنی قارەمان و کەسەکان لە شێوەی حاڵەتی کەسیی سێیەم (ئەو). لەم ڕێگەیەوە دەمانباتە ناو بیری قارەمانەکانەوە، تا بەهۆی بیرکردنەوەو مۆنۆلۆژو خەیاڵی ئەوانەوە (بارام و سەبری، ئەم و ئەو) بۆچوونەکانیان دەردەخات، بێ ئەوەی نووسەر ڕاستەوخۆ دەستبخاتە ئەم مەسەلەیەوە.

زەمەن، لەم جۆرە حاڵەتانەدا، ڕەوتی سروشتیی خۆی دەبەزێنێت، ساتەکان چڕتر، تێکچڕژاوو تێکئاڵاو دەردەکەون. ڕەوتی سروشتیی زەمەن ئەو کاریگەرییەی نابێت لە گۆڕینی کەس و قارەمانی چیرۆکەکاندا، زەمەن خۆی دەبێتە پابەندی کەسەکان و بەپەیوەندی لەگەڵ بیرکردنەوەو خەون و هەژانی قارەمانەکاندا ئامادەیی خۆی دەردەخات، لە هۆشی قارەمانەکان و ژیانی ڕۆحیی و سایکۆلۆژییاندا شەپۆلدەدات. زەمەنی ئەم جۆرە چیرۆکانە هێندە چڕن کە کورتترین کات دەخایەنن. کەچی ئێمە لەو ماوە کورتەدا بەهەموو لایەن و پەیوەندیی جۆر بەجۆری قارەمانەکان و شێوەی بیرکردنەوەی کەسایەتییان ئاشنا دەبین. حوسێن مێژووی تاکەکەسی قارەمانی چیرۆکەکان و دیوی ناوەوەیان لە ڕێگەی فلاشباك و مۆنۆلۆژو بیرکردنەوەو تەوژمی هۆش و خەونەوە دەردەخات. بایەخدانی حوسێن بەلایەنی دەروونیی کەسەکان و ڕەنگدانەوەی ڕووداوەکان لە بیرکردنەوەو نەفسییەت و کارو ڕەفتاریاندا شێوازێکی تایبەتیی و هونەرمەندانەی چیرۆکنووسینی ئەون.

زەمەن، لەم چیرۆکی حوسێن عارفدا، دیاردەیەکی سەرنجڕاکێشە. زەمەنی ڕاستەقینەی زۆربەی چیرۆکەکان، بۆ نموونە گەلەگورگ، سەفەرێکی ئەفسووناوی، ئەندێشەی مرۆڤێك، بەفر.. تاد، زۆر کورتن بەڵام حوسێن لە ڕێگەی یاریکردن بەزەمەن و بازدان لە نێوان ڕابردوو و ئێستادا، یان سەرلەنوێ خولقاندنەوەی ڕابردوو لە ئێستادا، فەزایەکی کراوەو ڕەها بەزەمەنی ناو چیرۆکەکانی دەدات. زەمەنی ڕابردووی قارەکانەکان و زەمەنی ئێستایان بەجۆرێك تێکدەئاڵێن کە ئاسۆی زەمەنی داهاتوو دەنەخشێنن. قارەمانی چیرۆکەکان هەر تەنیا بەرهەمی ڕابردووی خۆیان نین، بەڵکو بەرهەمهێنەرەوەی ئەو زەمەنەشن. ئەوان لەگەڵ وردترین ساتەکانی ڕابردوویاندا دەژین و ئەم ساتانە لە ئێستادا بەرەو داهاتوو دەبەن. بەردەوامبوونی زەمەنی ڕابردوو، لای ئەوان ڕوانینێکی عاتیفییانە نییە بۆ ڕابردووی خۆیان، بەڵکو خولقاندنەوەی ڕابردوویە لە ئێستادا. ڕابردوو هەندێك جار دەبێتەوە ئێستا، هەندێك جاریش وەك ئێستا فشارو کاریگەری خۆی دەنوێنێت. ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵی و لاویەتی و ساتە بەسەرچووەکان هێشتا بەجۆرێك لە کەسایەتی و بیرکردنەوەو ڕەفتاری ئێستای قارەمانەکاندا بەکارن هەر دەڵێی ئێستا ڕوودەدەن. ئایا حوسێن دەیەوێت، وەك فرۆید، پێمان بسەلمێنێت کە هەموو ئەو ڕووداوو شتانەی لە ڕۆژانی زۆر زووی مێژووی تاکەکەسیمانەوە بینیومانن و بەسەرمان هاتوون هێشتا لە زەمەنی ئێستاماندا لەگەڵمانن و ئەوانن گەلێك لە ڕواڵەتەکانی ئێستا و داهاتوومان دەنەخشێنن؟ یان دەیەوێت بڵێت کە یەکبوونی زەمەن (ڕابردوو، ئێستا و داهاتوو) دیاردەیەکی ڕەهایە

(موتڵـەق)، کـەچی ڕابـردوو وەك سـاتێك لـە زەمـەن، حاڵـەتێکی ڕێژەییـە (نیسـبی). یـان ڕابـردوو هـەر ئـەو سـاتانە نـین کـە پێوەرێکـی تایبـەتی دیاریکراون‌و لەگەڵ بەسەرچوونی کۆنکرێتیی خۆیاندا تـەواو ببن، بـەڵکو ئـەو ئۆبژێکـت‌و بابەتـە زینـدووە کۆنکرێتییانەشـن کـە لەگـەڵ خۆیـاندا هێناویانە بەرهەم‌و بەهۆیانەوە تێکەڵاوی توانەوەی خۆیان لـەناو ئێسـتاو داهاتوودا دابین کردووە.

بەرهەمـــەکانی حوســێن عـــارف‌و، کۆمـــەڵێك چیرۆکنووســـی دی، سـەرەتایەکی نوێیـان بۆ چیرۆکی کوردی داهێنـاوەو ئاسـتی هونـەریی و توانای دەربڕینی چیرۆکی کوردییان بەرەو ژوورتر بردووە، زمانی چیرۆك‌و چێژی هونەریی‌و هوشیاریی جوانناسیی خوێنەرانیان گەشە پێداوە. ئیتر دوای (گەلـەگورگ)، (ئەندێشـەی مرۆڤێـك)و (سـەفەرێکی ئەفسـووناوی)و هەندێك چیرۆکی دیکەی حوسێن، هـەقی خۆمانە چاوەڕوانی گـەورەترمان لە حوسێن‌و، مەرجی سەختترمان بۆ چیرۆکی نوێی کوردی هەبێت.




گەلاوێژی نوێ، ژ(7)، گۆڤاری بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ. سلێمانی




*ئەم باسە بۆ گوڵبژێرێکی چیرۆکەکانی حوسێن عارف (1957–1992) نووسـراوە، کەلـە سوێد لەژێر چاپدایە.

1-Erich Fromm, Ett friskare samhalle, Oversattning: Sven Ekberg, Tidens Forlag, Stockholm 1976, S.98

2-Filosofilexikonet, Oversattning Jan Hartman, FORUM, 1995, S.18

3-Joachim Israel, Alienation Och Byrakratisering industrisamhallet I omvandling Almqvist g wikesell forlag, stockolm 1982, S.39

4–سەچاوەی پێشوو، لا67– 67

5-Erik fromm, Ett friskare samhalle, S. 57-30

6–هەمان سەچاوە، لا12– 111

7-Joachim Israel, Alienation Fran Marx till modern sociologi, Stockholm 1971, S.248

8–ئەم چیرۆکانە لەم گوڵبژێرەی چیرۆکەکانی حوسێن عارفدا بڵاوکراونەتەوە.

9–حوسێن عارف، گوڵبژێر، چیرۆکی خوویەکی پووچ.

10–حوسێن عارف، گوڵبژێر، چیرۆکی سمۆرە.

11–حوسێن عارف، ئەندێشەی مرۆڤێك، چاپی یەکەم، بەغدا 1990، لا 116.

12–حوسێن عارف، گەلەگورگ، ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوان، چاپی یەکـەم 1983، لا 71.

13–گۆران مەریوانی، لە دیدارێکی حوسێن عارفدا، ڕابوون، ژمارە 3، 1992، لا 87–88دا.

14–حوسێن عارف، ئەندێشەی مرۆڤێك، لا 246.

15–هەمان سەرچاوە، لا 351.

16–هەمان سەرچاوە، لا 97–98.

17–گەلەگورگ، چیرۆکی شالاوی دڵ، لا 164.

18–حوسێن عارف، شار، لە چاپکراوەکانی گۆڤاری کاروان، چاپی یەکەم، 1968.

19-Petr Berger, Invitation Till Sociologi, Oversattning Gull Brunius, Raben Prisma, 1994, S.102-103

20–عبدالرحمن منیف، لە زمانی منصور عبدالسلام، قارەمانی ڕۆمانی (الأشجار وأغتیـال مرزوق)، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، 1979، لا 155.






# شارەکەی حوسێن عارف

شیرین بۆز ئەرسلان

**حوسەین عارف: شار (رۆمان)، بەرگی یەکەم، لەچاپکراوەکانی گۆڤاری کاروان 1986، 368 لاپەرە**

رۆمانا شار یا حوسێن عارف د سالا (1986)دە ل بەغدایێ دەرچووە. بەرگی یەکەم دۆز 390 رووپەلە. هەر ئەو بەرگە من خووندییەو ئەز دخوازم ب خاوەندڤانان بدم ناسین.

رۆمان ب زاراڤێ سۆرانی و ب تیپێن عەرەبییە. بابەتێن وێ‌د سالا 1942 دە دەست پێ دکە. جی، باژارەکا کوردستانا ژێرینە. داخوازا نڤیسکار ب گشتی ئەوە کو قالا ژیانا کوردان یا ل باژارەك بکە. گەلحێن کو ژیانا ل باژاران ب خوەرە تینە، پر ب هاویەکا ئەشکەرە تێن بەرچاڤ. ئەو گەلج، گەلحێن ناڤبەرا (نوو) و (کەڤن)، گەلحێن ناڤبەرا گوندیتی و باژاریتییە. نڤیسکار قاسێ کو قالا بیرو باوەرێیێن کەڤن دکە، قاسێ کو قالا عورف و عادەتێن کو ب سەد سالانن د ناڤ کوراندە ب جی بوونە دکە، ئەو قاسژی قالا بیرو باوەرێیێن کو ژیانا مودەرن ب مەکتەب و نەخوەشخانەو کارو هـ. وز د. ب خوەرە تینە، دکە. هەروەها داخوازا رزگارییا کوردستانێ و خەباتێن سیاسی ب هاوارێك گرتی بە ژی تێ قال کرن و ل هەمبەر ڤێ یەکێ ژی رەژیما عێراقێ دیسان ب هاوایەك گرتی د رۆمانێدە جی دگرە.

تشتەکا دی کو ب جارەکدا بالا خوندەڤان دکێشە ئەوە کو نڤیسکار گەلەك جی دایە ژیانا کەچ و ژنان، داخوازێن وان بۆ پێشدەمێ، پێوەندییێن وان و مێران و رۆلا وان یا د مالێ و د جڤاتێدە. هەروەها مەرڤ دکارە بێژە کو رۆمان رۆمانا گەنجانە. پرانییا قەهرەمانێن رۆمانێ گەنجن. دزانن کو پێشدەم یا وانە. بەرپرسیارییەك مەزن ل سەر ملێن وانە. ل ئالییەك پرۆبلەم و تەشخەلێن کو هەنە، ل ئالییەك دن خەون و خیالێن بۆ پێشدەمێ. ل ئالییەك کارو خەباتێن تێکۆشینێ، ل ئالییەك دنژی مشکلێن کو رەژیم ب رییا پۆلیس و جاسووسێن خوە دەردخە پێش وان. ب گۆتنەك دن، قال کرنا ژیانا گەنجان کو د ناڤبەرا راستیا دژوار و داخوازێن بۆ پێشدەمێدە دحەرکە دچە، گرنکترین مەخسەدە کو نڤیسکار د رۆمانێدە تین بەر چاڤان.

حادیسێن رۆمانێ د سالا 1942 دە دەسپێکە. ئێڤارەك، مەرڤەك ب ناڤێ سابیرێ حەمال ل خانییەك ئۆدەك کرێ دکە. ل ئۆدا خوە دفکرە و ب وێ فکراندنا خوە. خوە ب خوندەڤان ددە ناس کرن. هڤدە سال بەرێ گوندێ خوە هێشتییە و هاتییە شار. هاتن ئەو هاتن. ژ بەر کو یەکێ پر بوودەلەو تراله، هڤدە ساله ل شار دگەڤژە. خوەدییێ خانی میمکە (نەنێ)، یەکا گەلەك سەروەخت و سەردەستە. دبینە کو سابیر یەکێ گێژو بێکێرە، رۆژەك کار بکە سێ رۆژان رادزە. میمکە ددە سەر کو بچە کار بکەو پەرە بینە. ل خانی کرێچییەکا ژنەبی ب ناڤێ خاوەر هەیە. میمکە، خاوەرو سابیر ب هەڤژە دزەوجینە و ژ وێ زەواجێ قەهرەمانا رۆمانێ یا رۆلا یەکەمین، مریەم تێ دنێ. مریەم کو دبە پێنج سالی، خاوەر دمرە. میمکە خوەدی کرنا مریەمێ دگرە سەر خوە. لێ ئیدی دۆر هەفتێ سالییەو دترسە کو بمرەو مریەم بکەڤە بەر دەستان. وساژی دبە. مریەم هێن نەه سالییە، میمکە دمرە. خەین ژ باڤەکە بودەلە ئیدی تو کەسەکێ مریەمێ تنە و رۆژ ب رۆژ بەر ب ترازێدییەکێ دچە.

سابیر ژ بۆ چەندێك مریەمێ ددە جەم مالا ناسەکێ خوە. مریەم ل ور سڤکا بەردەستێ خانمێیە. لێ ژ حالێ خوە رازییە. کەچا مالێ گەلاوێژە. یەکا تێکۆشەر و رەوشەنبیرەو مامۆستایە. ژ مریەمێرە دبە وەك خویشکەك، وێ فێرێ خوەندن و نڤیسینێ دکە، وێ‌د گینە. لێ سابیر، مریەمێ ژ جەم وێ مالێ دبە. مەرڤەك ب ناڤێ حەمە کەریمێ دەروێش، مریەمێ دخوازە. یەکێ چلوپێنج سالییە و ل شار ب ناڤێ دەروێشێ درندە (جناور) تێ ناس کرن. تەولی کو سابی وی ناس ناکە، نزانە چ کەسە، دیسانژی مریەما یانزدە سالی ب پێنجی دیناری ددە دەروێش. دەروێش یەکێ زالم و وەحشییە. بەریژی دوو ژن کرییە کو تەمەنێ وان دوانزدە، سێزدە سالی بوونە، لێ ب هەوایەك خوە ژ دەستێ وی خەلاس کرنە. خویشکا وی خورشە ل بەر دەستێ وی وەك ئێسیرەکە. وێ ژ مێرێ وێ دایە بەردان و ژ ترسا رحێ خوە، خورشە گوتنەك وی ناکە ددو. شەڤا زەواجا مریەمێ، کو دەروێش ژ هوندر دەردکەڤەو خورشە دچە جەم مریەمێ، دبێژە قەی دەروێش وێ کوشتییە. دەست و دەڤێ وێ گرێ دای، د ناڤ خوینێدەو بهێشە. هەتا رۆژا دن هەشێ مریەمێ نایە سەری. لێ کو شیار دبە، وسا ترسەك د دلدەیە کو، بریارا خوە دایە جارەك دنژی خوە ب دەستێ دەروێشرە بەرنەدە. جارێ کو دەروێش نێزی دچە، ب قەلەمبازی دبەزە حەوشێ و دیە هەوار هەوارا وێ. باوەرێ تینە کود یێ دین دبە.

خوەشترین رووپەلێن رۆمانێ ئەون کو بەحسا تێکۆشینا مریەما یانزدە سالی دکن. هەرچاقس دەری کلیت کرییەو کلیت ل بەر پشتا خورشیە، دیسانژی مریەم کو کەیس دکەڤە دەستان، خوە ب پرتاو دگینە باڤێ خوە. خوە داڤێژە بەختێ وی کو وێ ژ دەست درندە خەلاس بکە. سابیرێ بودەلە شاش دبە کو چاوا ژنەك ژ مێرێ خوە بترسە. پر دەرباز نابە دەروێش کێرەك د دەستاندە ل دوو مریەمێ دکەڤ هوندر. هەرچاقس سابیر لێ حیرس دبە کو ب کێرێ وێ نەترسینە، هین زارۆکە، دیسان ژ دەستێ مریەمێ دگرە ددە پێش دەروێش و دبێژە کو بئەقل بەو ل مالا خوە روونە.

مریەم هێڤییێ ژ باڤێ دبرە. لێ جیران هەنەو بریارا وێ بریارا کو خوە ژ دەستێ دەروێش خەلاس بکە. دەروێش ب رۆژان وێ گرێ ددە، ددێ سوندێ و تۆبە پێ ددە کرن کو ئیدی ژ مالێ نەرەڤە. کو وێڤە دکە، مریەما زارۆك تۆبەو هەر شتێ ژ بیر دکە ود ناڤ مالێدە دبەزەو دبە زارەزارا وێ هەتاکو جیران تێن ئالیکاریا وێ. جارناژی خوە ژ سەر خانییانرە داڤێژە مالێ جیران هەتاکو دەروێش تێ وێ ژ ورد دبە. وسا دبە کو جیران ژ بەر وان تێن ئەمانێ و لەعنەت ل دەروێش و خورشە تەڤ تینن. مریەم دبینە کو جیران عاجز دبن، ئینجا کونا رۆنی ل جەم گەلاوێژ دبینە. د کەیسەکدە هەماهەما ب چار پەرکان، ب گرین و نالی نخوە دگینە مالا گەلاوێژ. گەلاوێژا رەوشەنبیر دێ و باڤێ رادکە سەر پێیان و ب هاوایەك مریەمێ ڤەدشێرن. ئیدی دمینن سابیرو دەروێش. دەروێش ژیانا وی دکە ژەهری کو کا مریەم ل کویە. سابیر ب خوەژی نزانە کو کەچا وی ل کویە. هەرجارا کو دەروێش ب سەردەما مەردە تێ وەك زارۆکەك دترسەو دلەرزە.

ل ڤر ئیدی خوندەڤان شۆپا مریەمێ زندا دکە هەتا کو داوییا رۆمانێدە ب دەردەك دن، ئیجا ب دەردێ ئەڤینێ، دەردکەڤە پێش خوندەڤان. د شووندە

گەلەك قەهرەمانێن دن دەردكەڤن پێش. خورشيدو ئەورەحمان كو هەڤالێ هەڤ يێن پڕ نێزن، تێكۆشەرو خەباتكارن، ئەختەر كو خوەندەكارەو ئەو و خورشيد ژ هەڤ حەز دكن، خوشكا خورشيد ئاسكۆلێ كو ژ ئەورەحمان حەز دكە، وەستا تايەر بەركو خوەدی چايخانەكەو گەلەك حاديسەو سوبحەتێن رۆمانێ ل چايخانا وی دەرباز دبن، برايێ خورشيد، زۆراب، كو ل بەر دەستێ وەستا كار دكەو وەستا كەچا خوە نازێ ددە وێ، حەمەشين، فەرهاد، نەوزاد، خولەيێ جاسووس، زايەرێ جاسووس كو برايێ وەستا تايەرە، مەجی‌يێ برێ ئەختەر كو هەڤالبەندێ رەژیمێیەو گەلێك كەسێن دن. گەلحا ناڤبەر ژیانا كەڤنارو ژیانا مۆدەرن، هەروەها گەلحا ناڤبەر دلسۆزی، دكوردیتی و تەعدايێن رەژیمێ و جاسووسی پڕتر د ئەڤینا ناڤبەر ئەختەرو خورشيددە خويا دكە. خورشيد كارەكەرو ئەختەر خوەندكارە. پڕ ژ هەڤ حەز دكەن، ئەختەر بڕيار دايە كو يان ژ خورشيدرە يە يان ژ ئاخێرە. لێ دخوازە ببە دوختۆرو هەتا كو خوەندنێ خلاس نەكە دێ ب خورشيدرە نەزەوجە. هەردو، پشتی كو ئەختەر ژ خوەندنگەهێ دەردكەڤە هەڤ دبينن. گەلەك جارا ل مالا ئەورەحمان. قسە دكن، دەستێ هەڤ دگرن، هەڤ ماچ دكن، خيالێ پێشدەمێ و زەواجی دكن. لێ مشكيلەك ل پێش وانە، ئەوژی برايێ ئەختەر مەجییە. مەجبوورن ئەڤینا خوە ڤەشێرنز دیسانژی مەجی ب وان دحەسە. ب كەسێن هەڤالبەندێ رەژیمێ، خورشيد ددە بریندار كرن‌و ئەختەرژی مەجبوور دكە كو دەڤ ژ خوەندنێ بەردەو ب يەكێ هەڤالێ ويرە بزەوجە. مەجی باوەڕيیا وی وسايە كوخ وشكا وييەو مافێ وييە وێ ب يەكێ كو ئەو دخوازەرە بزەوجینە. ئەختەر ژ مالێ دڕەڤە. ئامادەیە كو دەڤ ژ خوەندێ بەردەو ب خورشيدرە برەڤە بچن بەغدایێ، ل ور بزەوجن. لێ هين كو كەيس نەدينە، مەجی ب ئاليكارییا زايەرێ جاسووس خورشيد ددە گرتن. ئينجا ئەختەر وەك مريەمێ پەنابەری دبە جەم گەلاوێژ. هەروەها ئەو گەلج د ئەڤینا ناڤبەر ئەورەحمان‌و خوشكا خورشيد ئاسكۆلدە ژی هەیەز زايەر كو خوەدی مال‌و زارۆكە، چاڤ بەر ددە ئاسكۆلێ. دیيا ئاسكۆلێ دبێژە وی كو كەچا خوە ب سەر هەوی‌یێرە نادە. ئیجا ئەورەحمان‌و ئاسكۆل لەز دكن نيشان دبن‌و حەزرا داوەتێ دكن، لێ كەيس ناكەڤە دەستێ وان. ژبەركو زايەر ب دەكەك ئەورەحان ب خولەيێ جاسووس ددە گرتن. ئەورەحمان سالەك حەفس رادزە. خەباتا سياسی‌و تێكۆشەريژی د رۆمانيدە تێ قال كرن. نەوزاد، فەرهاد، خورشيد، ئەورەحمان، زۆراب، گەلاوێژ ڤانا هەموو ئەندامێ خەباتەكن، گەلەك جاران لە هەڤ دجڤن. د راكرنا جەنازێ شێخ مەحمووددە ئەڤ ئۆرگانيزا وانا سياسی رۆلەك مەزن دلەيزە. دەرحال ل هەڤ دجڤن، دكەڤن دەورێ كو وسا بكن كو هين زارارەك نەگيشە گەل هينژی ب هاوارێك رێك‌و پێك تەرمێ شێخ هەلينن. چيژی دكن تكارن پێشی ژێ بگرن كو مەراسما جەنازە نەبە راپەرينەكە گەلی ل دژێ رەژیمێ. د راپەرينێدە چەند كەس تێن كوشتن. گەلەك كەسێن كو بريندارژی دبن هەول ددن كو نەچن نەخوەشخانێ‌و نەكەڤن بەر دەستێ حكووماتی. ل ڤر مەخسەدا نڤيسكار ئەوە كو نەباوەری‌و ترسا خەلكێ كورد ل هەمبەر رەژیمێ نيشان بدە. هەروەها گاڤا ل شار ناسەرەك پڕ مەزن رادبەو گەلەك خانی و دكان خرا بن، گەلەك كەس دمرن، ديسان ئەو خەباتا ڤان گەنجان يا سياسی‌و ڤەشارتی دەردكەڤە پێش. ل هەڤ دجڤن، نەخشەو پلانان چێ دكن كو چاوا ئاليكارییا گەل بكن. لێ جارناژی ڤان گەنجان خوە ب ڤێ ئۆرگانيزە كرنێڤە گرێدای دبينن، وەك ئەورەحمان. پشتی كو ژ حەفسێ دەرتێ دخوازە حەيفێ ژ زايەر بستينە. لێ فەرهاد كو يەك ژ كەسێن بلندە د خەباتێدە، ب ناڤێ سياسەتێ رێ نادەوی. لە ئالی‌يێ دنژی زايەر بڕيار دايە ديسان تشتەك بينە سەرێ ئەورەحمان كو ئەوو ئاسكۆل نەگيشن هەڤ. ئيجا ئەورەحمان د ناڤبەرێدە دمينە. يا دێ وەك خوە بكەو حەيف بستينە، يا ژی دێ ب ئا فەرهادو سياسەتا خوە بكە.

داوییا رۆمانێدە ديسان مريەم دەردەكەڤە پێش. ئيدی پانزدە– شانزدە سالييەز يەكا رندو نازكە. لە مالا خالێ گەلاويچژ وەهاب، دمينە. دەروێش گەلێك گەڕییە. گەلەكژی تەدا ل باڤێ وێ ساير كرییە، هەتا ل چايخانا تايەر ل وەستا ب خوە خستییە. ئيجا سايیری بودەلە بۆ يەكەم جار د ژیانا خوەدە هاتییە غەزەبێ، راژتییە بێرا ل تەنیشت ئۆجاخ، هەتا كو كوشتییە لێ خستییە. ژ بەر ڤێ يەكێژی ل بەغدايێ كەتییە حەفسێ و دەه–سال دانەوی.

وەهاب بەرە بەرە مريەمێژی دخە خەباتا سياسی‌و بۆ ڤێ يەكێ جارنا وێ دشینە جەم فەرهاد. د ناڤبەرا وێ‌و فەرهاددا حەزكرنەك دەس پێ دكەو وەهابژی د دل خوەدا وا داتينە كو وان بزەوجينە. دەردێ كو ڤێ جارێ دەردكەڤە پێش مريەم، يا كو هەر تشتێ كربوو كو ژ دەستێ دڕندە خلاس بكە، گەلاوێژ ب خوەیە. ژ بەر كو گەلاوێژژی دلی كەتییە فەرهاد. گەلاوێژو فەرهاد، تەمەنێ وان دۆر بيست‌و پێنج سالەو هەردووژی ژ زووڤە د خەباتا سياسيدەنە، هەردووژی ژیرو زانانە. لێفەرهاد ژ مريەمێ هەرتشتی كربوو، نها وسا كينەكا بێئەمان دكەڤە دلێ وێ، كو دكە كو دەستی بگرە، وێ ژ مالا خالێ خوە باڤێژە دەر، بێژە وێ كو ژ كوڤە هاتبوو ديسان هەرە ور. ل جێی ژنان د جڤاتێدە پڕ باش دەردكەڤە پێش. هەرچاس زانایە، تەكۆشەرەو مامۆستایە، دخوازە ل فەرهاد ڤەببەو حسێن خوە ژێرە بێژە، پێشنيازا زەواجێ لێ بكە، لێ نكارە. فەرهادو مريەم‌و وەهابژی تێدگيشن كو گەلاوێژ ژ فەرهاد حەز دكە. مريەم نزانە دێ چ بكە. ناخوازە فەرهاد ژ دەست بەردە، لێ ل ئالييەم دنژی گەلاوێژ ژیانا وێ خلاس كرییە. ب فەرهادرە بزەوجە دێ چاوان ئێدی كار بە ل رووێ وێ مێزە بكە.

رووپەلا داوی يا رۆمانێدە راديۆ حەواديسا دەربێ ل بەغدايێ ددە. ئيدی دمينن خوەندەڤان‌و گەلەك پرسيار. ژ مريەم‌و گەلاوێژ كی دێ ب فەرهارە بزەوجە؟ خورشيد دێ ژ حەفسێ دەركەڤەو بگيشە ئەختەرێ، مەجی دێ وی ببينە و ب زۆر ب يەكێ دنرە بزەوجینە، هەكو وسابە ئەختەر وەكو سۆند خوارییەی دێ خوە بكوژە؟ ئەورەحمان دێ حەيفێ ژ زايەر بستینە؟ و رەژیما نوو دێ ژ وانرا و ژ خەلك كوردرا چاوابە؟ بەسڤێن وان پرسياران دێ د بەرگا ددويانده هەبە كو ئەز هێزيدارم دەركەتییە ئانژی وێ دەركەڤە.

رۆمانا شار يەك ژ رۆمانێن خوەشترينە كو من چ ب كوردی‌و چ ب تركی‌و سوێدی خوەندییە. گاڤا من ئەڤ رۆمان خوەند ئەز باشتر تێگيشتم كو ئەدەبياتا كوردی ب زاراڤێ سۆرانی گەلەك دەولەمەندەو پێويستە ئەم كوردێن كوردستانا ژۆرين سۆرانی فێر ببن‌و كاربن بەشداری ڤێ دەولەمەندی‌یێ ببن.

1992/8/31

## شيرين بۆزئارسلان:

1961 ل دياربەكر لە دايك بووە، 1979 چۆتە بۆ سوێد. لەوێ ل زانستگە ستاتستيك، مێژووی ئيچكۆنۆمی‌و ئارشيڤی خوێندوە.




مامۆستای كورد/ سوید

ژ/15 پایزی 1992

# ئەو مەملەکەتانەی کە بەیاریدەی ئەمو ئەو یا بەیاریدەی بەخت داگیرکراون

⊠ ن: نیکۆلای مەکیاڤیلی
⊠ و: حسێن عارف

ڕەنگە ئەوانەی لە ریزی گەلەوە سەرهەڵدەدەن و لە ڕێگەی خۆشبەختی‌یەوە بەرز دەبنەوەو دەگەنە پلەی میرایەتی، لەم بەرزبوونەوەیەدا تووشی زەحمەتی‌یەکی زۆر نەیەن. بەڵام لە پاراستنی پایەوپلەیەکدا زەحمەتی‌یەکی گەورەیان بەکوڵکەوە دەبێ. ئەوانە لە کاتی سەرکەوتندا ڕووبەڕووی کۆسپ و تەگەرەیەکی ئەوتۆ نابنەوە، چونکە بەسەریاندا باز دەدەن. بەڵام کە جێ پێیان قایم بوو، ئیتر هەر خێرا سەریەشەیان بۆ پەیدا دەبێ. ئەم حاڵەتە ئەوانەش دەگرێتەوە کە دەوڵەت بەسەروەت و سامان دەکڕن، یا لە ڕێگەی پێ‌بەخشینەوە لەلایەن ئەم و ئەوەوە دەسگیریان دەبێ، وەك چۆن لە یۆنان و شارەکانی ئەیۆن و(41) هەلیسپۆنتدا(42) ڕوویداو ئەوەبوو دارا بۆ پارێزگاری لێکردنی ناوچەکان بەناوی ئەوەوەو بۆ پاراستنی سەربەرزی و سەلامەتی خۆی، چەند میرێکی تیادا خوڵقاندن. هەروەکوو ئەو ئیمپراتۆرانەش دەگرێتەوە کە لە ڕێگەی بەرتیل پێدانی سوپاوە، لە ریزی گەلەوە سەریان هەڵداوە و بەرزبوونەتەوە.

ئەم جۆرە میرە بەتەواوی پشت بە نیازپاکی ئەو کەسانە دەبەستێ کە شانوشکۆی بەرز دەکەنەوەو ئینجا بەخۆشبەختی‌ی خۆی کە ئەم دوو شتە بەردەوام بوون و ئۆقرەگرتنیان بۆ نی‌یە. ئەم جۆرە کەسانە نازانن چۆن پارێزگاری لە پایەوپلەی خۆیان بکەن و لە وەزعێکیشدا نابن بتوانن نەخشەیەك بۆ پارێزگاری لێکردنەکە دابنێن و جێ‌بەجێی بکەن. ئەو مرۆڤەی هەموو ژیانی خۆی وەك کەسێکی ئاسایی بەسەربردبا، ئەگەر بلیمەتێکی گەورە نەبێ، ناتوانێ شارەزای چۆنێتی فەرمانڕەوایی کردن بێ، جگە لەوەی کە لە وزەشیدا نابێ وەزعی خۆی ڕابگرێ، چونکە نابێتە خاوەنی هێزێکی بەتەنگەوەهاتووی دڵسۆز. بۆیە ئەو دەوڵەتانەی بەخێرایی بنیاد دەنرێن، وەك هەموو ئەو کاروبارانەی بەسەرەتایەکی خێراو گەشەسەندنێکی بەپەلە دەس پێدەکەن، لە باریاندا نابێ ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵ بۆ خۆیان دابکوتن و بەفراوانی پەل و پۆ بهاون. لەبەر ئەوە هەر هێندەی ڕەشەبایەك هەڵیکرد، ئیتر دەکەونە بەر مەترسی‌ی هەرەس هێنانەوە، مەگەر ئەو کەسەی لەم ڕێگایەوە دەبێتە میر وەك وتم بلیمەتێکی مەزن بێ کە ئەمە یاریدەی دەدا بەخێرایی و لە ساتی خۆیدا، بەفریای پاراستنی ئەو پارووە بکەوێ کە بەخت هاویشتبوویە کۆشی‌یەوەو ئینجا لا لە داڕشتنی ئەو بنچینانە بکاتەوە کە کەسانی تر پێش گەیشتن بەپلەی میرایەتی، ئاسایی بیری لێدەکەنەوە.

من لێرەدا لە ناو ئەو ڕووداوانەدا کە لە یادمن، دوو نموونە بۆ هەردوو ڕێگای گەیشتن بەپلەی میرایەتی، واتە لێهاتوویی و خۆشبەختی دەهێنمەوە. ئەو دووانەش فرانسیسکۆ سفۆرزاو قەیسەر بۆرجیان. فرانسیسکۆ بەڕێگای ئاشتیداو بەهۆی لێهاتوویی و مەزنی‌ی خۆیەوە توانی‌لە پلەی هاووڵاتیەکی ئاسایی‌یەوە بگاتە پلەی میرایەتی‌ی میلانۆ دوای تەخت کردنی هەزارەها کۆسپ و تەگەرە، ئینجا بۆی کرا بەئاسانی دەسکەوتەکەی خۆی بپارێزێ. بەڵام لەولای ترەوە قەیسەر بۆرجیا کە بەدۆق فالنتین ناسرابوو، لە ڕێگەی دەست ڕۆشتویی باوکییەوە توانی دەوڵەتێك دەسگیرخا، کەچی هەر هێندەی ئەو دەست ڕۆیشتوویی‌یە نەما، ئەمیش دەوڵەتەکەی لە دەس چوو، ئەگەرچی هەر چی‌یەك پێویست بوو کە پیاوێکی بەتوانای وردبین بۆ جێ‌پێ قایم کردنی خۆی لە دەوڵەتێکدا کە بەلەشکرو دۆستایەتی‌ی کەسانی تر دامەزرابێ بیکا، کردی. من لەوەبەر وتم: ئەوەی پێشەکی بۆ خۆی دانەنێ، ڕەنگە بۆی بلوێ بەهۆی بەهرەو توانای لە ڕادەبەدەری خۆیەوە لە دواییدا دایبنێ، هەرچەندە ئەمە سەریەشەی بۆ ئەندازیارەکەو مەترسی‌ی بۆ بیناکەش تێدایە. ئینجا ئەگەر پیاو بێت و لە کردارەکانی دۆق و ڕێبازەکەی وردبێتەوە، دەبینێ کە ئەو بنچینانەی بۆ قایم کردنی دەسەڵاتە داهاتووەکەی خۆی داینابوون، زۆر کۆك و پتەو بوونەو باوەڕپیشم وایە کە باسکردنیان بێ هوودە نی‌یە، چونکە من وای دەبینم کە کارو کرداری هیچ تازەمیرێك لەوەکانی ئەو باشتر نابێ. بەڵام بەدی‌نەهێنانی سەرکەوتن تیایاندا هەرگیز بەهۆی هەڵەی خۆیەوە نەبوو، بەڵکوو لە ئەنجامی ئەوپەڕی بەدبەختی و خراپ بۆ هاتنەوە بوو.

هەروەها پاپا ئەلیکساندەری شەشەم بۆ گەورەو گران کردنی شان و شکۆی کوڕە دۆقی خۆی، ناچار بوو ڕوو بەڕووی گەلێ زەحمەتی، لە پاشەڕۆژیدا ببێتەوە. باوکە سەیری کرد هیچ ڕێگایەك بۆ گەیاندنی کوڕەکەی بەپلەی حوکمڕانی کردن لە کایەدا نی‌یە تەنیا ئەوە نەبێ کە میرایەتی بخاتە ژێر چنگی کلێسەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە دەشیزانی دۆقی میلان و ڤینیسیایی‌یەکان ماوە نادەن هەوڵدانی ئەم بۆ زەوت کردنی چەند شارێکی پاپایەتی سەر بگرێ، چونکە ڤینیسیا پارێزگاری لێکردنی فایینزاو ریمینی‌ی گرتبووە ئەستۆی خۆی. هەروەها پاپا سەیری کرد هێزە سوپایی‌یەکانی ناو ئیتاڵیا، بەتایبەتی ئەوانەی دەگونجا ئامانجەکانی ئەم بەدی‌بێنن، لەژێر دەسەڵاتی ئەو کەسانەدان کە لە فراوان بوونی هێزی پاپا دەترسن. لەبەر ئەوە نەدەکرا پشتیان پێ‌ببەستێ، چونکە سەراپایان لەژێر سەرکردایەتی بنەماڵەی ئۆرسینی و کۆلۆنادا(43)بوون. بۆیە وەزعەکە وای پێویست دەکرد ئاشوووبێکی وەها بخرێتەوە کە ئەو بارودۆخە سەرانسەر هەڵگێڕێتەوەو کەمێکیش ئاژاوە لە ناو دەوڵەتەکانی ناو ئیتاڵیادا بنێتەوە، تا ئەو بتوانێ هەندێکیان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەویشی ویستی ئاسان بوو، ڤینیسیایی‌یەکانی بۆ ڕەخسا کە چەند هۆیەکی تر وای لێکردبوون فەرەنسایی‌یەکان بۆ ئیتاڵیا بانگ بکەن و ئیتر پاپاش لەلای خۆیەوە، نەك هەر دژی بانگ کردنەکە نەوەستا، بەڵکوو بەڕزگارکردنی پادشا لویس لە پەیوەندی‌ی ژن و مێردایەتی‌یەکەی ڕێگایشی بۆ خۆش کرد. بەم شێوەیە پادشای فەڕەنسا بەیاریدەی ڤینیسیایی‌یەکان و بڕیار لە سەردانی ئەلیکساندەر هاتە ئیتاڵیاوە. ئیتر هەر هێندەی ئەو پێ‌ی نایە ناو میلانۆوە، پاپا بووە خاوەنی ئەو هێزە سوپایی‌یەی کە بۆ جێ‌بەجێ کردنی پرۆژەکەی خۆی لە ڕۆمانادا پێویستی پێ‌ی هەبوو، ئەمەش کارێك بوو کە بەپێ ناوو ناوبانگەکەی پادشای فەڕەنسا، بۆی نەدەلوا

بەدیی بێنێ. ئینجا کە دۆق(44) بوە خاوەنی رۆماناو بەسەر کۆڵۆناشدا سەرکەوت، دوو شت رێگەی پێگرت. یەکەمیان گومان کردنی لە دڵسۆزیی هێزەکانی خۆی. دووەمیان گومان کردنی لە نیازو مەبەستی فەرەنسا. واتە دۆق لەلایەکەوە دەترسا هێزەکانی ئۆرسینی کە پشتی پێ بەستبوون لێی هەڵگەڕێنەوەو تەنیا بەوەشەوە نەوەستن کە نەیەڵن مەملەکەتەکەی لەوە زیاتر بەرفراوان بکا، بەڵکوو هەرچییەکیشی کردبوو لێی زەوت بکەن. لەولای ترەوە دەترسا کە پادشای فەرەنساش هەمان هەڵوێستی هەبێ. ئینجا ئەوە بوو سەبارەت بەئۆرسینی گۆمانەکەی لا بووە یەقین، چونکە هەر هێندەی فاینزای داگیرکردو کەوتە پەلاماردانی پۆڵۆنا، سەرنجیدا هێزەکانی ئۆرسینی لە هێرش بردندا دوودڵن. سەبارەت بەپادشاش هەروەها کەوتەوەو سەیری کرد نایەڵێ پرۆژەی هێرش بردنەکەی بۆ سەر تۆسکانیا جێبەجێ بکا، بەتایبەتی دوای ئەوەی دۆقییەتی ئۆربینۆی هێنابووە ژێر بار. ئەوسا دۆق بڕیاریدا ئیتر پشت بەلەشکری کەسانی ترو خۆشبەختییان نەبەستێ. یەکەم کارێکیش کە کردی، لاوازکردنی حیزبی ئۆرسینی و کۆڵۆنا بوو لە رۆمادا، بەراکێشانی لایەنگرەکانیان بەلای خۆیدا کە زۆربەیان لە پیاوماقووڵان بوون، ئەویش لە رێگەی بەخشش و دیاریپێدانێکی زۆرو دامەزراندنیانەوە بەسەرکردەو کارگێڕی وەها کە لەگەڵ پایەوپلەیاندا بگونجێ. بەوە لە ماوەی چەند مانگێکدا توانی پەیوەندیی دڵسۆزییان بۆ حیزبە کۆنەکانیان بپچڕێنێ و وایان لێبکا بایەخ تەنیا بەو بدەن. بەدوایدا توانی بنەماڵەی کۆڵۆنا لەناوبەرێ و کەوتە چاوەڕوانکردنی هەلێکی لەبار بۆ لەناوبردنی سەرکردەکانی ئۆرسینیش. ئیتر کە هەڵکەوت کۆی لێنەکردەوەو لە دەس خۆی نەدا، ئەویش بەوەی کە وەختێ ئۆرسینییەکان سەیریان کرد مەزنیی دۆق و بەهێزیی کڵێسە مانای ماڵوێرانیی ئەوان دەگەیەنێ، هەڵسان راوێژکارانیان لە ئۆربینۆ لە ناوچەی بیرۆجینۆدا بەست و شۆڕشیان لە ئۆربینۆدا بەرپاکردو ناوچەی رۆمانا ئاژاوەی تێکەوت و دۆق کەوتە بەر مەترسییەکی بێ سنوورەوە، بەڵام ئەم بەیاریدەی فەرەنساییەکان بەسەر هەمووواندا زاڵ بوو. ئینجا کە بەتەواوی جڵەوی کەوتەوە دەست، بڕیاریدا باوەڕ نەبە فەرەنساییەکان و نەبە هیچ هێزێکی بێگانەی تر ناکا، تا پشت بەسوێندخواری لەگەڵیاندا نەبەستێ، بەڵکوو پەنا بەرێتە بەر فروفێڵ. بۆیە دۆق زۆر هۆشیارانە راستیی ئامانجەکانی خۆی حەشارداو تەنانەت ئۆرسینییەکان خێرا کەوتنە هەوڵدانی ئاشت بوونەوە لەگەڵیداو سینیۆر پاولۆیان بۆ ئەم مەبەستە کردە نوێنەری خۆیان کە دۆق لە رێگەی زمان شیرینی و دیاری پێبەخشینییەوە لە جل و بەرگی رازاوەو پارەو ئەسپ، توانی ترس و گومانی لە دڵ دەربکاو لە ئەنجامدا ئۆرسینییەکان، ساکارانە قایل بوون بگەڕێنەوە بۆ سینیگاگلیا و(45) لەبەردەستیدا بوونە نێچیرێکی دەستەمۆ. ئینجا دۆق کە دوای لەناوبردنی ئەو سەرکردانەو راکێشانی لایەنگرەکانیان بۆ رێزی دۆستانی خۆی و هەروەها دەسگرتنی بەسەر هەموو ناوچەکانی رۆماناو میرایەتیی ئۆربینۆداو دوای مسۆگەرکردنی خۆشەویستی و دڵسۆزیی خەڵکەکەش، بەتایبەتی کە هەستیان کرد حوکمڕانییەکەی سوودیان پێ دەبەخشێ، ئیتر کەوتە دانانی بناغەیەکی ساغڵەم بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی.

جا لەبەر ئەوەی ئەم لایەنە، دەهێنێ لەلایەن کەسانی ترەوە سەرنجی بدرێتێ و لاسایی بکرێتەوە، وا من لە باسکردنی غافڵ نابم. ئەوەبوو وەختێ رۆمانای داگیرکرد، ئەم ناوچەیە لەژێر دەسەڵاتی چەند حوکمڕانێکی لاوازی ئەوتۆدا بوو کە تەنیا بەتەنگ رووتاندنەوەی خەڵکەکەوە بوون نەك یەکیان پێبگرن. بەم جۆرە ناوچەکە کەوتبووە ژێر چەپۆکی راووڕووت کردن و کاری چەتەگەری و پەلاماردان و هەموو شێوەکانی ئاژاوەو ئاشووبەوە. لەبەر ئەوە بڕیاریدا خێرخوای ئەوتۆ لە ناوچەکەدا دابمەزرێنێ کە خەڵکەکە بخاتە ژێر باڵی هێمنی و تاعەتکردن و ملدان بۆ حوکمڕانی کردنی ئەو، بۆ ئەم مەبەستەش ریمیرۆ دی تۆرکۆی کردە نوێنەری خۆی کە بەدڵڕەق و لێهاتوو ناسرابوو، ئەوپەڕی دەسەڵاتیشی دایە، جا ئەم کابرایە لە ماوەیەکی کورتدا توانی سەرکەوتنێکی گەورە لە چەسپاندنی ئاسایش لە ناوچەکەداو لە یەك پێگرتنیدا وەدەس بێنێ کە ئەمە وای لە دۆق کرد دادگایەکی (مدنی)ی بۆ دادپەروەری لە مەڵبەندی ناوچەکەدا دامەزراندو حاکمێکی بەتوانای کردە سەرۆکی و بڕیاریدا هەر شارەو پارێزەرێکی تێدا بۆ خۆی دابنێ. ئینجا لەبەر ئەوەشی کە دەیزانی توندوتیژی و ستەمکارییەکی لەوبەر دەبێ هەستی رق و کینەی لە بیروهۆشی جەماوەری گەلدا خوڵقاندبێ، بۆ سڕینەوەی بەسەرهاتەکان لە مێشکیانداو بەمەبەستی راکێشانیان بەتەواوی بەلای خۆیدا، بڕیاریدا وەهایان بۆ دەربخا کە هەرچی کارێکی نەگریسانە لە رابوردوودا کراوە، هیچی بەفەرمانی ئەم نەبووە، بەڵکوو دروستکراوی دەستی وەزیرەکەی بووە هەر هێندەشی هەڵی بۆ هەڵکەوت، فەرمانیدا جەستەی بکەن بەدوو کەرتەوەو لە مەیدانی گشتیی شاری سیزایینادا هەڵیواسن و لەوحێکی تەختەو خەنجەرێکی خوێناویش لە تەنیشتییەوە دابنێن. دڕندەیەتیی ئەم کردەوەیە هەستێکی تێکەڵ لە رەزامەندی و سەرسوڕمانی لای گەل ورووژاند. بەڵام با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

ئینجا ئیتر دۆق کە هەستی بەدەسەڵاتداریی خۆی کردو کەوتە پێکەوەنانی سوپایەکی تایبەتی و ئەو هێزانەی دەوروپشتی خۆی تێکشکاندن کەلە وزەیاندا هەبوو جەزرەبەی لێبدەن و دواجار خەمی ئەو مەترسییانەی نەما کە لە کایەدا بوون، سەیری کرد ئەگەر بیەوێ لەسەر داگیرکاری بەردەوام بێ، دەبێ کارێکی وەها بکا کە لە لایەن فەرەنساوە رێزی لێبنرێ، چونکە دەرکی کرد کە پادشای فەرەنسا دوای هەست کردنی بەو هەڵەیەی خۆی کە کردبووی، ئیتر هیچ یاریدەیەکی نادا. بەم جۆرە بەسەرێك کەوتە گەڕان بەدوای هاوپەیمانی نوێداو بەسەرێکیش تەقەلادانی خۆنزیك کردنەوە لە فەرەنساییەکان بەبۆنەی ئەو هێرشەوەی پادشاکەیان بۆ پەلاماردانی مەملەکەتی ناپۆلی، بەنیازی یاریدەدانیان دژی ئیسپانیاییەکان کە شاری جایتیایان ئابڵووقە دابوو ئامادەی کردبوو. مەبەستیشی دڵنیابوون بوو لێیان کە ئەگەر بهاتایەو ئەلیکساندەری باوکی لە ژیاندا بمایە، دەیتوانی ئەم ئاواتە بەدی بێنێ.

ئەمە ئەو کارو کردارانە بوون کە دۆق بۆ روو بەڕوو بوونەوە یان وەختی خۆی کردنی. بەڵام سەبارەت بەدوارۆژی، لەوە دەسڵەمییەوە کە سەرۆکی نوێی نیمچە دەوڵەتەکانی کڵێسە یەکێك لە دۆستەکانی خۆی نەبێ و تەقەلا بدا ئەو ناوچانەی لێبسێنێتەوە کە ئەلیکساندەر پێی بەخشی بوون.

بۆ لەروودا وەستانی ئەم ترسە بڕیاریدا چوار رێگا بگرێتە بەر: یەکەمیان لەناوبردنی هەموو ئەو کەسانەی سەر بەو بنەماڵە حوکمڕانانە بوون کە مەملەکەتەکانیانی لێزەوت کردبوون، تا ماوە نەدا پاپا تازە فرسەتی پشت پێبەستنیانی چنگ بکەوێ.

رێگای دووەم مسۆگەرکردنی دۆستایەتیی سەردارانی رۆما بوو تا بەهۆی ئەوانەوە بەری سەرکێشی کردن لە پاپا بگرێ. رێگای سێیەم بریتی بوو لە بەکارهێنانی ئەوپەڕی تین و توانای بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا. بەڵام چوارەمیان بریتی بوو لە سازدانی گەورەترین هێز کە لە توانادا بێ لە پێش مردنی پاپای باوکیدا پێکی بێنێ، تا بتوانێ بەتەنیا خۆی لە رووی یەکەمین هێرشدا کە دەکرێتە سەری خۆی رابگرێ. جا ئەوەبوو وەختێ ئەلیکساندەر مرد ئەو لە چوار

ئامانجەكە سیانیانی بەدی هێنابوون و چوارەمیشیان بەڕێوە بوو بەدی بهێنرێ. واتە توانی بووی ژمارەیەكی زۆر لە میرە لە میرایەتی خراوەكان بكوژێ یا فرسەتی گرتنیانی بۆ هەڵكەوتبوو كە لە ژمارەیەكی كەم بەولاوە كەسیان ڕزگاریان نەبوو بوو. هەروەكو توانی بووی سەردارانی ڕۆما بداتە پاڵ خۆی و دەسەڵاتی تەواوی خۆیشی بەسەر كۆمەڵگادا بچەسپێنێ. لە كاتێكدا بۆ مەملەكەتەكان كارێكی وەهای كردبوو كە ببێتە سەروەری گشت تۆسكانیاو پیرۆجیاو(46) بیۆمبینۆ بكاتە موڵكی خۆی و باڵیش بەسەر پیزادا بكێشێ. ئینجا كە دڵنیا بوو ئیتر هیچ شتێك لە كایەدا نەماوە ترسی لە فەرەنسایی یەكان پێ پەیدا بكا، چونكە ئیسپانیایی یەكان بەشێوەیەكی ئەوتۆ لە ناپۆلی دەریانپەڕاندبوون كە ناچار بن ئەوانیش هەوڵ بدەن دۆستایەتی ی ئەم مسۆگەر بكەن و دڵی ڕابگرن، بەتەواوی دەستی بەسەر پیزادا گرت و بەدوایدا هەر خێرا لۆكاو سی یەناش، بەهۆی ڕق و كینەیانەوە بەرامبەر بەڤینیسیایی یەكان لەلایەكەوەو لەبەر ترس و سامیان لەم لەلایەكی ترەوە، سەریان بۆ شۆڕ كرد، جگە لەوەی كە ڤینیسیایی یەكان خۆشیان لەو وەختەدا داهات و بەروبوومیان لە كزیدا بوو. جا ئەگەر هەر لەو ساڵەدا كە ئەلیكساندەری تێدا مرد، لە مەملەكەتە تازەكانیشدا بەچەشنی كۆنەكانی سەركەوتنی بەدی بهێنایە، ئەوا بەبێ هیچ پشت بەستنێك بەدەسەڵات و بەخۆشبەختی ی كەسانی ترو تەنیا لە سایەی هێزو بازووی خۆیەوە، هێندەی تواناو دەسەڵات و ناوبانگ دەردەكرد كە بۆ ئیدامەپێدانی ئەو سەروەری یەی بەس بن. بەڵام ئەلیكساندەر مردو مردنەكەشی لە وەختێكدا بوو كە تەنیا پێنج ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕی بوو كە قەیسەر بۆرجیا یەكەمجار شمشێری تێدا بەلادا كردبوو. ئەوسا دۆق سەیری كرد كە ئەگەرچی ڕۆمانا بەتەواوەتی ملی بۆ داوە، بەڵام نەخشەكانی تری لە هەوادا لە نێوان دوو دوژمنە لەشكری بەهێزدا، بەهەڵواسراوی ماونەتەوەو خۆیشی بەدەست چەند نەخۆشی یەكی كوشندەوە دەناڵێنێ.

بەڵام ئازایەتی و بەتوانایی یەكەی دۆق لە ڕادەبەدەر بوون و لە پەیداكردنی دۆست و لە فەوتاندنی دوژمنیشدا دەستێكی باڵای هەبوو. هەروەكوو لە دانانی نەخشەو ڕێوشوێن و لە چەسپاندنیاندا لە ماوەیەكی كورتدا، زۆر شارەزا بوو. لەبەر ئەوە ئەگەر دوو لەشكرە دوژمنەكە دەوریان نەتەنیایەو خۆیشی لە ڕووی تەندروستی یەوە وەزعی باش بووایە، دەیتوانی بەسەر هەر كۆسپ و تەگەرەیەكدا زاڵ ببێ. جا ئێمە ئەگەر ئەو ڕاستی یەمان لە پێش چاو گرت كە دەڵێ:

لە كاتێكدا كە ئەو لە ڕۆمانەدا لە سەرەمەرگدا بوو، ڕۆمانا بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك بەهێمنی لە چاوەڕوانكردنیدا مایەوە، یا وەختێك باگلیۆنی و(47) ڤیتیللی و ئۆرسینی بەهێزەكانیانەوە چوونە ناو ڕۆماوەو كەسێكیان نەدی پشتگیری ی ئەمان بكاو دژ بەو ببزوێ، بۆمان دەردەكەوێ كە ئەو بنچینانەی دایمەزراندبوون چەندە كۆك و پتەو بوون. تەنانەت ئەو دەیتوانی نەهێڵێ هیچ كەسێك بۆ پاپایەتی هەڵبژێردرێ كە خۆی نەیەوێ، ئەمە ئەگەر لە كاتی مردنی ئەلیكساندەردا سیحەتی باش بووایە، هەرچی یەكی حەز پێ بكردایە بۆی بەدی دەهات و بەرگەی هەموو چورتمێكیشی دەگرت. دۆق لەو ڕۆژەدا كە یۆلیۆسی دووەمی تێدا هەڵبژێردرا بەپاپا، بۆی باسكردم كە ئەو بیری لە هەموو شەو شتانە كردبۆوە كە ڕەنگ بوو لە وەختی مردنی باوكیدا ڕووبدەن و چارەسەریشی بۆ هەموویان دانابوو تەنیا یەك شت نەبێ كە قەت بەبیریدا ڕانەبوردبوو، ئەویش نزیك بوونەوەی خۆی بووە لە مردن و لە هەمان ڕۆژی مردنی باوكیدا.(48)

ئینجا من كە بە هەموو ئەم كردارانەی دۆقدا دەچمەوە هیچی وەهایان تێدا نابینم بهێنێ لەسەری لۆمە بكرێ، بەڵكوو بەپێچەوانەوە، من خۆم بەناچار دەبینم دۆق بە نموونەیەكی ئەوتۆ دابنێم كە دەبێ هەموو ئەوانەی لە ڕێگەی چەك و خۆبەختی ی كەسانی ترەوە دەگەنە پۆپەی دەسەڵاتداریتی، وەك ڕووی دا، شوێن پێی هەڵبگرن، چونكە ئەوێك كە بەئازایەتی و زیادەخوازی یەكی زۆر ناسرابوو، لە توانایدا نەبوو لەوە زیاتر بكا كە كردی و نەخشەو پلانەكانیشی بەهۆی مردنی باوكی و نەخۆشكەوتنی خۆیەوە نەبووایە، شكستی یان نەدەهێنا. هەموو ئەو كەسانەی وای دەبینن كە دەبێ لە ڕێگەی قایمكردنی جێ پێ ی خۆیانەوە لە ڕووی دوژمناندا پارێزگاری لە میرایەتی یە تازەكەیان بكەن و دۆستیان هەبن و داگیركاری بەزەبری هێز یا بەخەڵەتاندن و فرت و فێڵ بەدی بێنن و هەم خۆشەویستی و هەم ترس و سام بەسەر ڕەعیەتەكەیاندا بسەپێنن و ڕێزلێگرتن و تاعەتكردن بەسەر سەربازانیانداو پلیشاندنەوەی هەر یەكێك كە ڕەنگ بێ سەریەشەیان بۆ پەیدا بكاو داهێنانی نەریتی. تازە لەبری هی كۆن و پەنابردنە بەر دڵڕەقی و بەرەحمی پێكەوەو جوامێری و ناجوامێری لە یەك كاتداو بڵاوەپێكردنی هێزی سەربازانی ئیختیاری ی كۆن و پێكهێنانی هێزێكی نوێ و پاراستنی دۆستایەتی لەگەڵ پادشاو میراندا بەشێوەیەك ناچاریان بكا بە سەرێك بۆی سوودبەخش بن و بەسەرێكیش سڵ لە جەزرەبەی دەستی بكەنەوە، هەموو ئەوانە دەبێ كردارەكانی ئەم پیاوە بەپەسەندترین نموونە بۆ پەیڕەوكردن دابنێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بزانین كە گوناهی هەرە گەورەی ئەم پیاوە، ڕەنگە لە لایەنگیری كردنەكەیدا بێ بۆ هەڵبژاردنی یۆلیۆسی دووەم بە پاپا. چونكە وەك لەوەبەر وتم ئەو ئەگەرچی نەیدەتوانی قسەی خۆی لە هەڵبژاردنی پاپایەكدا كە خۆی بیەوێ زاڵ بكا، بەڵام دەیدەتوانی بەهیچ كلوجێ ماوە نەدا كەسێك بۆ پاپایەتی هەڵبژێردرێ كە یەكێك بێ لەو كاردینالانەی ئەم لەوەبەر ئازاری دابن و زەرەری پێ گەیاندبن، یا یەكێك بێ لەوانەی كە لە حاڵەتی بووندا بەپاپا. ئەم ناچار ببێ لێی بترسێ. چونكە مرۆڤ یا بەهۆی ڕق و كینەوە یاخود لە ئەنجامی ترسدا خراپەكاری دەكا. ئەو كاردینالانەی ئەم ئازاری دابوون، ژمارەیەكی زۆر بوون و گرنگترینیان سان پیترۆ ئادڤینكۆلاو كۆلۆناو(49) سان جیۆرجیۆ و ئەسكانیۆ(50) بوون.

جگە لەمانە ئیتر هەر كامێك لە كاردینالەكانی تر بۆ سەرتەختی پاپایەتی هەڵبژێردرایە. ئەو پاپا تازەیە لەم دەترسا، تەنیا ڕۆهانی فەرەنسایی و كاردینالە ئیسپانیایی یەكان نەبن كە یەكەمیان بەهۆی ئەو پەیوەندی ی خزمایەتی یەوە لەگەڵ پادشای فەرەنسادا هەیبوو، خاوەنی دەسەڵاتێكی گەورە بوو، ئەوانی تریش پابەندی ئەو ئەرك و پەیوەندی یانە دەبوون كە بەدۆقەوە دەیبەستنەوە. بۆیە دۆق لەبەر ئەم هۆیانە دەبوو یەكێك لە كاردینالە ئیسپانیایی یەكان بۆ پاپایەتی هەڵبژێرێ، یا ئەگەر ئەوەشی پێ نەدەكرا دەبوو بڕیار لەسەر هەڵبژاردنی كاردینال ڕۆهان بدا نەك سان پیترۆ ئادڤینكۆلا(51) ئینجا گومان لەوەدا نی یە ئەو كەسەی وای بۆ دەچێ كە گوایە گەورە پیاوان وەختێ سوودو بەرژەوەندیێكی تازەیان دەستگیر دەبێ كۆنە ئازارو گێچەڵ پێكردنی لەوەبەریان لە بیر دەچێتەوە، دەكەوێتە هەڵەیەكی گەورەوە. دۆقیش لەم ڕووەوە هەڵەی كردو هەڵەكەیشی بۆی بووە هۆی تێكشكانێكی ئەوتۆ كە هەڵسانەوەی بۆ نەبوو.

## سەرچاوە

میر، نیكۆلۆ مەكیاڤیلی، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: حسێن عارف، مطبعة (سمیر أمیس) بغداد، چاپی یەكەم، 1982.

وەرگێڕان: شیعر

# لە ئەدەبی گەلانی ئاسیاو ئەفەریقاوە



1-سیرالیۆن

(ئەلین کۆلکەر) ژنە شاعیرو نووسەری خەڵکی وڵاتی (سیرالیۆن) لە شیعرێکیدا بەناوی (ژنو مێردایەتی)یەوە دەڵێت:

دوو باڵندە.. دوو باڵندەی جوان
پەڕو باڵیان سەوزە.. زەردەو شین
دوو باڵندە.. دوو باڵندەی خنجیلە
هاوسەرەکەمو من
قردێلەیەک.. قردێلەیەک لە ئاڵتوون
پچڕاندنی زۆر ئاسانەو بەڵام
گەلێک لە پۆڵا پتەوترە
ئەمانکاتە دووگیان لەیەک لەشدا
هاوسەرەکەمو من
چوار باڵ.. چوار باڵی ناسک
بەقووڵایی ئاسماندا هەڵفڕین
بەپەرۆشەوە هەڵفڕین
دوو باڵ بەرەو رۆژئاوا
دووی تر بەرەو رۆژهەڵات
هاوسەرەکەمو من
پەڕو باڵمان هەڵوەرین
باڵەکانمان تێک شکانو بەڵام
هێشتا هەر تەقەلا ئەدەین
هەر سوورین لەسەر هەڵفڕین
جارەهای جار
کەوتینە خوارەوەو هەپروون بەهەپروون بووین
هاوسەرەکەمو من
دوو باڵندەین پێمان ناووترێ جوان
پەڕو باڵە رەنگینەکەی جارانمان نەماوە
هاوسەرەکەمو من

2-کازاخستان

یەکەمین ئادەمیزاد (گاگارین) لە خاکی وڵاتی شاعیری لاو (ئۆڵجاس سلیمانۆف) (کازاخستان)ەوە فڕی بۆ ئاسمان. ئۆڵجاس بەو بۆنەیەوە لە شیعرێکیدا نووسیویە:

من عاشقی جوانیم
ئای چەن لە مێژەوە
من خەو بەجوانی‌یەوە ئەبینم
ئای چەن جار لەم پێناوەدا لە خاچ درام
بەڵام لە ئەنجامدا
خۆم هەرگەیاندە قووڵایی ئاسمان
سەرمدا لە کەشکەلانی فەلەک

منی درووستکەری ئەو ڕووبارانەی
زەوی شەق ئەکەن
منی زەبوونکەری دەریا بێبنە سەرکێشەکان
چوومە سەر تەخت
تۆش ئەی زەمین
کڕنووش بۆ ئادەمیزاد بەرە
ئێستا منم (کردگاری) تۆ

**سەرچاوە**

هاوکاری ژ (209)، 1974/3/15.

*　　*　　*

# گۆرانییەك بۆ دوورگەکەم

**شیعری: گابریل مارینۆ**



کێ بەدرێژایی رۆژگار ئەکرووزێتەوە..
لەناو لیتەو لمی کەنار دەریا،
لە برسا گەوز ئەدا،
ئەمرێ و بۆگەن ئەکا؟!.
کێ هەنگاوەکانی بەردەوام ڕۆئەچنە،
ناو چڵپاوی وەختێکی سنوور تەسکەوەو
پەنجە درێژەکانی ئەقرتێنرێن؟!.
کێ شەوانی تەمەنی،
بەسەر رۆژانێکا سەر کلۆم ئەکرێن،
کە هەرگیز چاوی پێیان نەکەوتوە؟!.
منم!!....
کێیە چاوەکانی،
خوێنێکی بزڕکاوی قێز لێکراوەیان تێزاوە،
تیژترین ئازار دەرئەبڕن،
دیمەنی سامناکترین مردن ئەنوێنن؟!.
کێیە هەزار جار هەڕاج کراوە..
هەزار جار کوژراوە..
هەزاران جاریش ریسوا کراوە؟!
منم!!...
کێ لە تەویلەی بوگەنی بەرازا لە دایك بوە؟!
کێ هەردەم نینۆك ئەچەقێنیتە بەرەبەیان؟!
کێ ساتە سەختەکانی شەو ئەشێوێنێ؟!
منم!!...
کێ هاوار ئەکا..
هەر هاوار ئەکا تا دەنگی ئەنووسێ؟!
کێ لە پێش وەختا ئەمرێ؟!
کێش بەبێ رێگەپێدانی، لە دایك ئەبێ؟!
منم!!...

منم کە لەناو جەرگەی ستەمترین مردنەوە،
لە دایك ئەبم.
منم لە دوو توێی سەخت ترین ئازارەوە،
لە قوڵایی تاڵترین ساتی بێدارییەوە،
لە دایك ئەبم.
تکایە کەس بەسەرجەنجاڵم تێنەگا.
من خۆم ئاسایش،
بۆ ئەم زەوییە سەوزە بەدی ئەهێنم.
لە پێناوی بەرەبەیانێکی گەشی بێ ئاغادا،
گۆرانیی بۆ ئەڵێم.

**سەرچاوە**

ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (202)، 1974/3/4

**نامەی فازیلی مەلا مەحمود بۆ حسێن عارف**

**برا/ کاك حسەینی خۆشەویست**

**سڵاوێکی گەرم**

**دەستەکانت ئەگوشم و هیوام سەرکەوتن و سەربەرزیتە.**

**دەمێکە یەکتریمان نەدیوە، من مەیلم هەر گەرم بوەو هەمیشە هەواڵم پرسیویت و بەتەنگەوە بوم هەواڵی چاکت ببیستم. ئەڵێن دێیت بۆ ئەم ناوە، چاوما ن ڕواو نەهاتی، حەزم ئەکرد جارێك بەیەك بگەیشتینایەو تێر قسەمان بکردایە، ئەگەرچی لە کاك شێرکۆو قەراخی زوزو بیروڕات ئەبیستم.**

**کاکە: بۆ میهرەجانی شیعری کوردی، حەزم کرد هەڵوێستت وابوە کە شاعیرە تازەکان هاوبەشی بکەن، سودبینین لە فرسەتی وا شتێکی باشە، سود لێوەرنەگرتنی، هیچ بۆ گەشەکردنی بزوتنەوەی شیعری نوێ ناکات، لە تەسجیل کردنی هەڵوێستێکی غەڵەت زیاتر!**

**من و هاوڕێیەکی شاعیری عەرەبم، کە ئێستە لە کوردستانەو وەزعی وەك منە، حەزئەکەین بێین بۆ میهرەجانەکە، لەوێ گوێ ئەگرین و سوود ئەبینین، قسەش لەگەڵ خەڵك ئەکەین و لەولاوە بیروڕای خۆمان دەرئەبڕین و فرسەتێکی چاکە بۆ ئێمەمانانی لەشاردور، ئێوەمان بێتە بەردەست لە جێیەکی واداو بەیەك بگەین. حەزئەکەم ئەگەر ممکن بێت هەوڵدەیت دەعوەتمان بکرێت. مەسەلە مادییەکە مەبەست نیە بەلامانەوە، بەڵام ئەگەر بانگ کراوبین سەربەستیمان زیاتر ئەبێت لەوێ، زیاتریش ڕومان دێ هاوبەشی هەمو کۆڕەکان بکەین و وا دەرنەکەوین کە (چامەلەغ)و خۆهەڵپەسێرین!**

**ئەڵێن هەندێ شاعیری عەرەب بانگ کراون، وابزانم لە شوێنێکی وادا، گەلێ قسەی هەق هەیە، هەمومان لەسەر دەممان ئەبێت و حەزئەکەین بیڵێین، بەڵام بۆ ئێمە وتنی هیچ ناکەوێت، لە کاتێکا ئێوە کە ئەچنەوە شار، ئەوسەربەستییەتان نابێت ئەگەرچی لە زۆرشتا وەکو یەکیش بیر بکەینەوە.**

**بەتەمای وەڵامت و بەهیوای بەیەك گەیشتنم.**

**هەر بژیت**
**بەخۆشی**
**برای دڵسۆزت**
**فاضل ملا محمود**
**73/7/17**

**نامەی تاهیر ئەحمەد حەویزی بۆ حسێن عارف**

**کۆیە- گەڕەکی هەواو**

**1978/8/21**

**18/رمضان/1398 زۆر خۆشەویستم کاك (حسێن عارف)ی بەرێز.**

**ڕۆژتان باش**

**لە دوای هەواڵ پرسینتان وەدەست گوشینتان لە خوام دەوێ هەمیشە خۆش بن وتووشی هیچ نسکۆیان نەیەن، وەتەندروست بن وەپەنجەو قەڵەمتان نەڕزێ بۆ کوردی نووسین، هەروا لە گوڕ دابن و هەرگیز ساردنەبنەوە.**

**أما بعد..! ئەوجا بێینەوە سەرباسی خۆم و خۆتان.. چاوم بەکتێبە بەنرخەکەتان (چیرۆکی هونەری کوردی) کەوت، لە بابەت چیرۆك نووسەکانی گۆڤاری (دەنگی گێتیی تازە) (دڵسوز)یشتان باس کردوەو نووسیوتتانە (دڵسۆز ناوێك)، وەختی خۆی بەهۆی مامۆستا (کریم مصطفی شارەزا)وە، نەختێ باسی خۆمم بۆ کردبوون، وەلێرە من بووم بە (نووسەری نەناسراو)، بەڵێ (دڵسۆز) منم من، (طاهر احمد حویزی)، لە ساڵانی (1940)ەوە ئەو (لقب)ەم**

بۆ خۆم بەکارهێناوە، وەهەندێ نووسینم بەناوی (دڵسۆز) لە گۆڤاری (گەلاوێژ)یش هەبوە، وەهەندێ جاریش ناوی ڕاستەوراستی خۆم (طاهر احمد)م نووسیوە.

بەڵێ لە کتێبەکەتانا لەسەر (دڵسوز) لە سەرەتادا، تەواوێکتان بەرزکردیەوە بەلاّم لە دواجارا زور بێ بەزەییانە، بەناخی زوویتان دا بردوومە خوارێ لەگەڵ ئەمەش، چونکو خۆتان پێوەماندووکردووم، نزیکی دوولاپەڕەتان پێم ڕەش کردۆتەوە، زۆر جێگای سوپاسن. بۆ منیش وەختی سەرەتای نووسینم بوە.

ئێمەمەمانان بە نووسەرانی (مخضرم) دوو دەوردیو دەژمێردرین، خوا فرصەتان بدا.

ئیدی خوا دەست بەتەمەنتانەوە بگری

خۆشەویستتان
طاهر احمد حویزی
مامۆستای خانەنشین- کۆیە

نامەی عەبدولمەجید لوتفی بۆ حسێن عارف

مصيف صلاح الدين 1978

الملتقى الاول للقصة الاربعاء في 8/23

العراقية عبدالمجيد لطفي

ولوي المحترم الاستاذ -القاص الكردي المثقف- حسين عارف تحية طيبة وتهنئه مرة اخرى المحاضرة المليئة المستوعبة لماجريات الحياة في القصة الكردية في مرحلة طويلة ومضطربة الى جانب اللباقه في الاجابة حتى على الاسئلة المحرجة التى تطرح لأول مرة.

عزيزى حسين، لقد قرأت اسمك كثير وسمعت باسمك كثيرا وقرأتك قليلا لضعف لغتي الكردية، لمتابعة حار بدعت من قصص في هذه اللغة وتبعا لذلك تقت الى ان اراك الى ان تحقق لي ذلك في رؤية مشرفة، اطلعت منها مـن موقف المحاضر الكفء مساء الثلاثاء 1978/8/22 ثم حيث بدأت مؤرخا ومنظرا وناقدا بتواضع هـي رائعة الخلق في الأديب الحق وهذا ماكتب اتوقع ان اجده فيك ويجب ان اشكرك لانك لم تخيب ظني لقد بدا لي من خلال العرض، هذال الموضوعات التى يتناول القاص الكردي على مدى مسيرته ظني فصل يقم هذا انه يهمل قضاياه وطموحاته الاكبر لانه يخشى حسيس نارها فيتوارى خلق قضايا جانبيه، تجاوز الزمن بفصلها؟ فأن هذا ليعطي دلالة مؤسفة لتخلف و القاص الكردي عن شعبه ختى في قطاعاته المتأخرة ولكن الاكثر تحسا بقضاياهاو الاكثر التصاقا بتاريخها دلتدا أيهو لهذات السبب وفي اطار فهمي لشهادة القاص و كونه ضمير احته كما هو شعار الملتقي القصص لن يكون القاص الكردي اكثر في جاهل او مزور مهزوم تحت مشاعر انانيته. ولا يصلح ادبه و قصصه شهادة مقبولة ولا خيرا لأمته، ولكم اتمتان تتصحح هذه الصورة في نفسي.

تبقى هناك قضية هامة ومثارة منذ زمن وقد أعطيت بها رأيا بعث به الى المجلة شمس كردستان منذ سنة فترددت في نشره ولاتزال، حول لغة الكاتب والاديب القومية وهل ان مما رسته للادب بلغة اخرى يعتبر ادبا للغته وقوميته؟

ان ما انتهيت اليه هو السبب ذلك أن اللغة القوميه كيان له خصوصيته في تفصيلاته لا يملكه وصفها ولكنها موجودة وهي التى تكون الذوق الادبي عن طريق التلذذ بالصوت واللهجة والحركة وليس بالمحتوى حسب. وما يكتبه كاتب عربي بالفرنسية أو ما يكتبه كاتب كردي بالعربية هو في الحقيقة أغناء الادب في اللغة المكتوب بها والا فأن من معظم الأفكار الأنسانية الاساس و احدة انها يفرق الاداء اللغوي بيها حيث تحمل كل لغة الى الانسان وفق

اسلوبها ومفرداتها و تشكيلاتها الجمالية ومع هذا يكون الادب العربي ادبا عربيا اذا كتب باللغة العربية اما ما يكتبه الاديب العربي بلغة اخرى فهو ادب غريب ينتمي الى اللغة التى كتب بها على أساس انه ادبها وان كان مردوده احيانا يعود الى جهة اخرى من حيث الدفاع عن قضية او حق لها: مكاتبة الكردي مثلا قصة باللغة العربية حتى في اطار الاماني القومية الكردية يظل عملا اديبا عربيا وان كان محتواء الفكري وغايته تتصل بخدمة اماني او مشاعر الشعب الكردي وهكذا هو الأمر مع اية لغة ومثلا أن صاموئيل بكيت يكتب بعض مسرحياته باللغة الفرنسية مع انه انكليزى فيما يكتبه بالفرنسية يعتبر ادباء فرنسيا كتبه كاتب انكليزى الانتماء قوميا وعلى هذا فالرأى الاقرب الى الصحة الايكون مايكتب بلغة ما الا محصلة او تراثا لتلك اللغة، اى اللغة التى كتب العمل الادبى بها.

مع خالص شكري اعجابي لك، فكم انا سعيدا اعبأ مع كل مشاعرى الشخصية الحزينة عندما ارى وجه حسين عارف واسمع صوته الممتلىء وامثاله وأما على قيد الحياة. مع حبى عظيم

1978/8/23

**العزيز حسين عارف المحترم**

تحياتي الاخويه الحارة، انا صديقك صبري لابد انك سوف تتذكرني بعد غياب طويل، او على الاقل تتذكر "الگعدات" الجميلة على الروبار قرب چومان ايام القصف الاسود على حياتنا الجميلة هناك في تلك الخيمة أنا اتذكر جيدا كيف كنت تعزل لنفسك بعض حبات الفستق وتطلب عدم الاعتداء عليها من قبلي و سامي شورش و كأنها مزة العمر كله.

عزيزي حسين

لقد كنت اتسقط اخبارك باستمرار وانا في المانيا مرة من الأخ عبدالمحسين الهنداوي "سمير" الذي زار كردستان قبل ثلاثة اعوام و "مرة اخرى عن طريق الاخ سامي شورش الذي اتصل به في لندن كل عامين هكذا اصبحنا نعد الاتصالات بالاعوام في هذا الزمن المر.. قبل سنة تقريبا "ارسلت لك رساله واعتقد ان حاملها تركها لك في مقر البرلمان لانه لم يلتقيك كما بعثت بيده مجموعه متواضعه من الادوية الخاصة بمرض السكر "انسولين مع حقن خاصه به" وقد ابلغتني الفتاة التي كانت ذاهبه الى هناك بانها سلمتها الى مقر البرلمان وفعلا فقد استلمت رسالة شكر حول الموضوع -اعتقد انها من رئيس البرلمان، الا انني كنت متلهفا" لسماع اخبارك.

كيف حالك؟ كيف حال العائلة؟ هل انك مرتاح صحيا؟ كيف اخبارك الادبية؟.. انا متلهف لسماع كل ذلك، عليّ أفلح هذه المرة باستلام رساله منك.

اخبارى انا بسيط جدا هنا في هذه الغربة فقد اكملت دراسة "بناء المكائن" ومنشغل علاوة على ذلك بالفن التشكيلي انشر وارسم في الصحف العربيه والالمانيه مقيم منذ عشرون عاما ومتجنس وروحي ملت من البرد والغيم والمطر. لدي طفلتان جميلتان يعشقن كردستان والعراق من خلال حكاياتي لهن.. الكبيره اسمها صحراء عمرها 12 سنه والصغيرة اسمها طبيعه عمرها 9 سنوات.. اما الآن فادرس علم المشهد والديكور في السينما لاينقصني سوى اشتياقي لكم والجلوس ولو لمرة واحده على الروبار ويذهب العمر... اشتياقي كبير لشرب جرعة ماء من احد العيون القريبه من ناوچليكان وسماع احاديث من مام ابراهيم عەوله وغيرهم من المامات ارجو ان يكونوا احياء" لحد الآن.. والذهاب بين الحين والآخر الى گلاله و چومان وملاقات علي زەردەشتي" والتلذذ بقصصه الطريفه.

هذا ما افتقده حاليا.

عزيزى حسين

لدي احاديث طويلة عن تلك الفترة لاتسع هذا الوريقات ان تكفي للتمتع بتفاصيلها بعيدا عن الشخصيات التي عاشتها.

سوف اختم رسالتي هذه برجاء اخوي منك هو ان تكتب لي رساله مع الاخت وتذكر لي حاجياتك والعائله من هنا انني مستعد ارسال اي شيء لك وفي اية لحظه تسنح بها الفرصة.

تحياتي وعناقي الدافيء والعائلة

ارجو ابلاغ تحياتى الى اصدقائنا القدماء جميعا واخص بالذكر "شيخ علي البرزنجي" وصديق آخر كان معنا في ناوچليكان اسمه طارق هەولێري لا اعرف اسم ابيه اسفا الا انه من أغوات اربيل سابقا.. تحياتي ايضا الى آخرين استذكر اسماؤهم آزاد.. حمه بچكول وآخرون قبلاتي مرة اخرى

المخلص

صبري سابقا

حسين الموسوي

1996

عزيزى كاك حسين

تحية قلبية

أقدم لك اعتذار المسبق عن الكتابة إليك بالعربية، وذلك لأن صديقي "والذى أرجو أن يصبح صديقنا المشترك" لايعرف الكردية جيدا. ويقينا إن مسألة اللغة تعتبر أقل من ثانوية بالنسبة لك!

منذ فترة وأنا في أشد الشوق إلى لقاءك، سمعت خبرا عن ندوة في السليمانية قبل ربما تحضرها، ولكن لم تنعقد الندوة مع الأسف. أتتبع أخبارك من بعيد، وأرجو مخلصا إذا حدث وزرت السليمانية، أن تتذكرنى، فربما أكون موجودا، لحسن حظي، في ذلك الوقت.

عزيزى: ألأخ إدريس أكثر من صديق وأخ بالنسبة لى، فهو من المثقفين القلائل الذين يفهمون بعمق، رغم إنهم لا يفهمون بطريقتى أنا. ولكنى مع كل الأختلافات في الفكر، فأنا أكن له إحتراما فائقا. وقد نقلت وضيفته إلى بغداد وطلب منى أن أعرفه ببعض الأصدقاء، فتذكرتك انت، ربما لأنكما متقاربان في الفكر، حيث كنت دائما عندما أسمع إدريس، أتذكر كلماتك أنت.. وربما لأننى لازلت أعتبرك من بين القلائل الذين خاضوا غمار هذه الحياة المشوهة ولم يصدأوا، وكم هم قليلون أولئك الذين لم يصدأوا!.

أنا أسف إذ إن رسالتى تشبه رسائل التزكية، ولكننى آسف أكثر لأننا لازلنا نعيش زمنا يحتاج فيه الناس إلى رسائل تزكية حتى من أجل التعارف!

ألأخ إدريس مثقف جيد، وقد تعمق إلى درجة إنه تجاوز الواقع.. ورجع إلى ماركس وربما تجاوزه أيضا، وبهذا يلتقى معك في المنطلق، وسوف تعرفه جيدا، وتطلع على أفكاره، التى لازالت تبحث التبلور. ولكنى الشيء الذى أود التأكيد عليه هو طيبته و إخلاصه اللامنتاهى، وقد إفتقدت فيه صديقا عزيزا، وربما إفتقد هو ألآخر، لذلك أرجو له عزاء في شخصك، و أنا متأكد بأنكما ستصبحان أصدقاء.

قرأت عن سفرك إلى الماتا في الجرائد، سمعت عن رواية جديدة لك ستطبع، أنا في أحر الشوق لسماع أكثر منك. ولكن يظهر إن الصدف لن تساعدنا، وسقما للحياة التى تتحكم فيها الصدف.

صحتى جيدة، وأنا في بداية طريق لك فيه ذكريات لا أحب أن أسميها بائسة، فيما يخصنى، تعلمت الكثير، وعلمت الآن مدى ضحالة ماكنت أسميها ثقافة، ومدى الجهد الذى يجب أن يبذل.. وما نحن سوى تلاميذ، أو ربما أقل.

وأخيرا.. تقبل، مرة أخرى، أخلص تحياتى وتمنياتى لك وأنا كلّى أمل طريقانا ليسا متوازيان، ولابد سنقترب ونلتقى مرة أخرى.

ودمت لأخيك المخلص

فاضل ملا محمود

73/10/17

# نیوارە ئاهەنگ!

شێرکۆ بێکەس

مەرحەبا تەمەن!

ئەو وەختەی ئەبیتە ڕیزە ئاوێنەو ئاوڕ ئەدەیتەوە لە تخووبەکانی یادگارو، لەوەی کە ئیتر نایەتەوەو، چوو!

سڵاو وشە! ئەو دەمەی مەرگ دێ‌و جەستە کۆچ ئەکاو، زەمان لەبێژنگت ئەداو، ئەو چەند شتەکەمەی، لێت ئەمێنێتەوە، شایەتیمان بۆ ئەدەن، شایەتی لەبەردەم ئەفراندندا؛ بەباش یان بەخراپ!

تۆش ئەی هاوڕێی دێرینم.. کاکە حسێن!

ئەم کاتەت باش!

ئەرێ ئەوە لەکەیەوە تۆ بەسواری ئەسپی چیرۆك‌و من بە سواری هەوری شیعر، کەوتووینە ڕێ‌و بەڵام تا ئەمڕۆیش، نەتۆ پێتوایە ئەوەی لەم سەفەرەدا کردوتە، زۆرت بڕیوەو، نەپێتوایە ئارامیت‌و نە لە کەمێك بەولاوە، دڵنیا!. خۆمنیش هەروا، تینوێتیم ئەڵێی تازە ئەوەڵێتی‌و نەگەیشتوومە ئەو مەنزڵەی تیایدا مەراقم داسکەنێ‌و، یان ئۆخژن بکەم بەدوا چرا!. ئەم زەریایە چەند بەرینەو وا خەریکین لەچاوان ون ئەبین‌و کەچی هێشتا هەر سەرەتایەو سەرەتا؟!

هەوڵ.. هەوڵ.. هەوڵ

لەناو باوەشێ چیرۆکدا... دوو سێیەکی پرشنگدار!.

لەناو باخچەیەك شیعردا... دوو سێیەکی چاوخومار!

هەوڵ.. هەوڵ.. هەوڵ

هەندێ جار تۆ لە غارداو.. لەناو هونەردا گلان‌و

منیش هەندێ جار باران‌و.. لەپریشدا سیاساڵ!

ئەرێ کەی بوو بۆ یەکەمجار

لەشارە بچکۆلەکەی ئەوسای سلێمانیدا خۆمان‌و خەمەکانمان یەکتریان ناسی‌و قەڵەممان بوون بەبرا؟!

من پانزە ساڵ‌و تۆیش هەژدە ساڵ. هەر لەسەر کورسیەکانی چایخانە گەورەکەی بەهەشتی کاکە حەمە بوو. لەدەوری حەوزو فوارەکە، لەبنی بنەوە، لەولاوە کاك فەرەج ئەحمەدی پڕ لەقسەی خۆش‌و بەتەنیشتیەوە کاك جەلالی میرزا کەریمی دوگڵە زەردی هێمن‌و بێدەنگ‌و بەوبەریشەوە کاك ئەوڕەحمان حەکیمی کوژراوی دۆمینەو تۆی چون دەرزی باریك‌و منی قژ بژو شێواو. بیرمە کاك فەرەج ڕووی تێکردم‌و وتی: ئەمجارەیان پارەی چایەکەیت بۆ ئەدەین‌و ئیتر تەواو!. دوای ئەوە کەمێك دەنگی نزم کردەوەو ئینجا وتیەوە: بۆ جەژنی نەورۆزیش ئەچین بۆ چەقڵاوەو فلانە سەعات لەخوار باخی فەرەج کۆ ئەبینەوەو لەوێ ئامادەبەو هێلکەی کوڵاوی خۆت بێنەو ئەمەیش تەواو!

چەقڵاوە! هەر لەگوێ چەمی تانجەرۆ!.

ئێستا ئەم ناوە لەنێو ناواندا بزر بووە، بەڵام بۆ ئێمە هەر وەختێ گوێمان لێ ئەبێ، ئیتر ئەوە درەوشانەوەی زیندووی بیرەوەرییەو، شوێنێکە هەر بەبیستنی ناوەکەی پڕ ئەبینەوە لە خەیاڵی بە بریق‌و باقی ئەو دەمەی هەرزەکاری‌و لەسروودی ئازادیی‌و لەیادکردنەوەی جەژنی نەورۆز بەدزی چاوی نەیارانەوەو پڕ ئەبینەوە لەگوڵە هێرۆی خۆشەویستیی، ئەو گوڵەی کەلەوێ، لەچەقڵاوە، بێ ئەندازە زۆر بوو، وەك ئەوەی ئەوێ نیشتمانیان بێ!..

ڕۆژگار هات‌و ڕۆیی

زریان هات‌و ڕۆی..

پاشایی ڕۆیشت‌و کۆماری هات‌و

توندوتیژی ئایدۆلۆژیا کەوتە جووڵەو

هەر یەکەمان چووینە بازنەیەکەوەو

بەڵام لەیەکتریش دانەبڕاین!

بەر لەکۆتایی شەستەکان، ئەمجارەیان لەپایتەختداو لەگوێ دیجلەو لە چیمەنی بادەی ئەبونەواسداو لەدەوری مێزی سەرگەرمیی‌و نزیك لەچوارینەکانی خەیام کە لە گەرووی ئەفسووناوی "ئوم کەلسوم"ەوە لەشەقەی باڵیان ئەدا، من‌و تۆو جەلال و کاکەمەم. یەکمان گرتەوە. مێژەکەمان هەر شیعرو چیرۆك‌و بیری تازەگەری‌و یاخیبوونی لەسەر دائەنیشت. بەغدای ئەو سەردەمە، بۆ ئێمە فەزایەکی نوێ‌و کتێبێکی تازە بوو. بزووتنەوەی ئەدەبی‌و شانۆیی‌و کتێبخانەی دەوڵەمەندو، کۆڕو کۆبوونەوەکانی گەرم‌و لەنزیکەوە ناسینی مەزنە شاعیرو چیرۆك نووسی نوێخواز ئەزموونی ئێمەیشیان بەبڕشتر ئەکرد. خەمی گەورەی ئەو کاتەی ئێمە ئەوە بوو: یاخیبوونێ لە جەستەی خامۆشی ئەدەبەکەماندا بەرپا بکەین کە زمانی تیا ڕاچڵەکێ‌و شیعرو چیرۆکی کوردی کاژی کۆن فڕێدەن‌و باوەش بۆ تیرێژە تازەکانی نوێکردنەوە بگرنەوە، بەر لەبەیاننامەی یانزەی ئازاری 1970 ئێمە لەو خولیایەدا ئەژیاین، بەڵام دوای یانزە، دەرفەتەکە ڕەخسا‌و، ئەوەبوو بەیاننامەی ئەدەبی "ڕوانگە"مان بڵاوکردەوە. ئەوەی ڕاستی بێ تۆ چریکەیەکی زوڵاڵی ئەم بانگەوازە بووی. "ڕوانگە" پەنجەرەیەکی تازە بوو لەتێڕوانیندا بۆ ئەدەب‌و عەشقێکی لەڕادەبەدەر گەرم‌و بەپەرۆش بوو بۆ ئەوەی گوڕوتینێکی تازە بدا بە ئەفراندن. ئەو کۆمەڵە چیرۆکەی لەو سەردەمەدا نوسیت، خۆت وتەنی کلاڤەیەك بوون لەژانی تووڕە!. لەفانتازیاو تەکنیکی گێڕانەوە. لە وردەکاری‌و ڕامان‌و پرسیارە جەنجاڵەکان. لەو هێمایانەی کە ناڕاستەوخۆ لە دەوری دۆزەخەکەی کۆشکی کۆتایی ئەسوڕانەوە. ئەو کاتەو دواتریش چیرۆکەکانی، یاسای خۆڵ‌و دۆو. چاڵی جەرگی پیرێژن‌و گەلەگورك‌و کانی ڕەحمانە و تاد.. بووبوون بەجێی لێدوانی ئەدەب دۆستان‌و عاشقانی تازەکردنەوە. "ڕوانگە" هیچی نەکردبێ، گۆمێکی شڵەقاندو، کۆمەڵێ وێنەی تازەو بۆ ئەوکاتە سەرسامکەری لەم زمانەدا

هێنایەکایەوە. کە تا ئەو کاتە نەبیستراوبوون. "ڕوانگە"و ئەو زنجیرە وتارو نووسینانەی بەسلب و بەئیجاب دوا بەدوای بڵاوبوونەوەی بەیانەکەی کەوتنە ناو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو کاتەوە، سەرەتای بزووتنەوەیەکی ڕەخنەیی دروستکرد کە تا ئەو کاتە هەر تەواو کپ و بێدەنگ بوو. "ڕوانگە" هیچی نەکردبێ، لەناو نەوەی ئەو سەردەمەدا خولیای گەڕانی بەشوێن سەرچاوە فیکری و ئەدەبیە هەمە ڕەنگەکاندا گەرمکرد. لەزمانی تەعبیری تەقلیدی جوێبۆوە. کەلەپووری وەك بەندیخانە نەئەبینی و بایەخی تایبەتی بەئەدەبی لاوان ئەداو هەر لەڕێگەی یەکێتی نووسەرانی کوردەوە لەبەغدا بۆ یەکەمین جار زنجیرە کۆڕی لێکۆڵینەوەی بۆ بزووتنەوەی تازەگەری سازدا. هەر لەگەرمەی ئەم چالاکیانەدا بوو، کە "ڕوانگە" لەگەڵ مەلاو خەتیبی مزگەوتەکاندا، لەسەر ئازادی و یەکسانی مافی ژن کەوتە گێرمەو کێشەیەکی قورس و خەتەرناکەوە. بەتایبەتی دوای ئەوەی کەبانگەوازی "ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن"ی بڵاوکردەوەو لەئەنجامیشدا بۆ یەکەمین جار حکومەت هەفتەنامەی "هاوکاری" خۆی داخست!. من پێموایە "ڕوانگە" بەم بانگەوازە ئازایە، بەداکۆکیکردنی لەئازادی و مافی ژن. لەو ڕۆژگارەدا، جوانترین هەڵوێستی ڕووناکی خۆی لە ئاکاری نوێخوازی خۆیداو بۆ ئازادی و پاشەڕۆژ تۆمارکرد!

ڕاستە پرۆژەی نوێکردنەوەکەی ڕوانگە، ناتەواوو بەکەلێن و هەمەلایەن و قوڵ نەبوو!. ئەزموونمان کەم و حەماسەتمان بۆ تازەکردنەوە لەسامانی فیکری و مەعریفیمان زیاتر بوو. بەڵام هەر "ڕوانگە"ی بێ پێناسەیەکی ئایدۆلۆژی بوو، کەبەشی زۆری ئایدۆلۆژیستەکانی ئەو کاتەی ورووژاندو بەتێڕوانینێکی جیاواز بۆ ئەدەب و ژیان هاتبووە کایەوە. هەر لەبەر ئەو یاخیبوونەیش بوو، کە ڕوانگەیان بە فەوزەوی و نەهیلسیتی و عەدەمی و ئەدەبی ناپەیوەندارو بیری وردە بورژواو بەڕەڵڵا لەقەڵەمدا! ئایا ناکرێ لەئیستەدا وەختێ ئاوڕ لەو مێژووە ئەدەینەوە ئەوە بڵێین: کە ڕوانگە یەکەمین بزووتنەوەی نوێخوازی بوو کەلەناو خۆیدا جیاوازیەکانی قبوڵکردوو. بانگی هەمەڕەنگی‌داو، لەخەتە بۆ کێشراوەکانی ئایدۆلۆژیا لایداو، لە کرانەوەو والآبوونی هەموو دەرگاکاندا، پێشدەستی کرد؟!

کورتە چیرۆکی هونەری لەسەرەتای حەفتاکانەوە گەشانەوەیەکی لەبەرچاوی بەخۆیەوەدی. بەهەق تۆیش یەکێك بووی لەو چیرۆك نووسانەی کە شارایەکت خستە سەر ئەو خەرمانەو دواتریش لە هەوڵێکی نوێدا چوویتە ناو دنیای ڕۆمانەوەو "شار"ت نووسیی!

تەمەن و ئەزموون درێژ بوونەوە..
ژیان ئاڵۆزترو بەژەنگ و ژارتر بوو
کۆشکی کۆتایی گەورەترو سامدار ترو
لافاوی خوێنی قوربانیی بەلووزەوترو
ئازادیی کەسیرەو
دۆزەخەکەی جەللادیش بەرینتر بوو..
ئەمجارەیان لەشاخ و لەژێر کەپرەکەی یەکێتی نووسەرانی
کورددا.. یەکترمان بینیەوە..
ڕۆژگار ڕۆیشت و ڕۆژگار هات و
زاووزێی شیعرو چیرۆك زیادیان کردوو
من بەرەو خوارو، ناوبەناو سەرئەکەوتمەوە
بۆ لای دیجلەو، سەر مێزمان پڕ ئەبوو لە
وەنەوشەی شیعرو لەگوڵە ئەستێرەی چیرۆك و
خەممان ئەدا بەدەم دیجلەوەو
بەڵام لێشی کەم نەئەبۆوە!.

ساڵان تاریکتر و، گیروگرفت بەگیروگازتر بوون، مەودای دوورکەوتنەوە لەیەکتر لەچاوان ون بوو. من لەشاخەوە بۆ دەرەوەو، تۆیش لە وڵات و تەمەنیش لەهەڵکێشاندا هەناسەبڕکێی بوو. غەریبی و دوور وڵاتی و شەش ساڵ بەتەواوی چاومان لە چاوی یەك دابڕاو کاتێ من گەڕامەوە وەرزی دوای ڕاپەڕین بوو..

شەقام پێ‌ئەکەنی و
وشە هەڵئەپەڕی و
زەماوەندی ئازادی بوو.
مەرحەبا تەمەن!
مەرحەبا جەستە

لەو گڕو لرفەلرفەوە بۆ کوێ؟! من شەست و سێ ساڵ و تۆش سێ ساڵ گەورەترو، بەڵام هێشتا قەڵەم ئەجووڵێ و خەیاڵ باڵ ئەگرێ و لەیەکتر دانەبڕاین!

تۆش "ڕۆڤار"
دەست خۆش! کە لە ئاوڕدانەوەیەکی وەفاو خۆشەویستیدا
بۆ یەکێك لەپەنجەرە جوانەکانی چیرۆکی کوردی
خۆت کرد بەدیاری! بەڵام لەبیرت بێ
هێشتا زۆرن ئەو چرایانەی
لەژیاندان و ئەسووتێن و پێویستە تۆ
یەك لەدوای یەك وەفادارانە
لەژوورەکانی خۆتدا هەڵیانواسیت!

2003/9/11



**ئەڵماتا- 4-1973/9/9**

لە چەپەوە بۆ ڕاست: 1-ژنی میشاڵ عاسی، 2-میشاڵ سلێمان، 3-محەمەد دەکروب، 4-حسەین عارف، 5-ئوڵجاس سلێمانۆف، 6-ئەدۆنیس



**کارمەندەکانی کاروان- سەیران بۆ ئاکرێ بەهاری 1986**

وەستاوەکان لە ڕاستەوە: محەمەد زادە، سەردار میران، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، سالم غولام، حسەین عارف، محەمەد عارف، جەعفەر قادر

دانیشتووەکان لە ڕاستەوە: عەلی خورشید، عەبدوڵڵا بابا عەلی، ئەسعەد عەدۆ، عەزیز حەریری، مەزدە حسەین عارف



لە چەپەوە بۆ ڕاست: حسەین عارف، کەمال ڕەووف، شێرکۆ بێکەس، کاکە مەم بۆتانی، فازیل ... ، جەمال شارباژێڕی، جەلالی میرزا کەریم، عەبدوڵڵا عەباس



**کۆنگرەی هەورامان ناسی - نێوان سنەو مەریوان 2000/6/9**

لە ڕاستەوە: فەتاحی ئەمیری، حسێنی شیربەگی، حسەین عارف، ناسری وەحیدی



**میوانخانەی سنە 1999/12/4**

لە ڕاستەوە: ناسری وەحیدی، حسەین عارف، عەتا نەهایی، حسێنی شەریفی



**نووسەر لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێکانی لە شاخ**



وێنەیەکی خێزانی مانگی ئابی 2000



کۆنگرەی هەورامان ناسی ڕێگەی نێوان مەریوان سنە

لەگەڵ دەستەیەك لە نووسەرانی کوردستانی ئێراندا 2000/6/9



هۆڵی پەرلەمان، ژوری کۆبوونەوەی لیژنەی یاسا- 1993

دانیشتووەکان: سەید حەسەن بەرزنجی، عەدنان نەقشبەندی، کاکە ڕەش

ڕاوەستاوەکان لە چەپەوە: حسەین عەلی کەمال، ئەیاد حاجی نامیق، حازم یوسفی،

حسەین عارف، شیروان حەیدەری




لەگەڵ دەستەی نووسەرانی ( ڕێیا تازە ) دا

یەریڤان ئەیلولی 1973



وێنەیەکی خێزانی



بەغدا، بارەگای یەکێتی نووسەرانی کورد 1971

لەچەپەوە: حسەین عارف، عەلی شەونم، جەمال بابان